# فەرهەنگی باشوور

**تایبەت بە ناوچەکانی کرماشان و ئیلام و لوڕستان**

**عەباس جەلیلیان (ئاکۆ)**

پێشکەش بە ژنانی قارەمانی گەلی کورد کە
پارێزەرانی فەرهەنـگ و زووانـی گەلەکەمانن
بـەتایبەت دایکی بەڕێز وزانام، خوالێخۆشبوو
«شیرین عەباسی»

**خوێنەری بەڕێز**

بۆ یەکەم دابەزینی مرۆڤ لە سەر مانگ وا دەنووسین: «مرۆڤ توانی لە لقێکەوە باز بداتە لقیکی‌تر» برا و خوشکی بەڕێز زووانەکەمان بێ گۆمان پاشماوەی زووانی ئەویستا وپەهڵەویە کە لە ناوچەکانی کوردستانی ئێران وعێراق و تۆرکیا وسووریا و رووسیە و لۆبنان و ئوردون ئاخاوتنی پێ دەکەن و لە بوواری زووان ناسییەوە زووانی (ئەدەبی ئائیینی) نەتەوەێ مەدیاکان بووە کە هەموو کەسێ پێ دەزانێ ئەوانە کوردن. ئاسەوارەکانی پێشووێ زووانەکەمان گەلەک بەر چاو بووە بە تایبەت لە سەر شێعر و مووسیقا کە ئاستیکی جیهانیی هەیە. بووارەکانی شێعری کوردی لە چووار قۆناخەوە دەسپێکراوە کە بریتین لە دڵداری، کۆمەڵایەتی، سرۆشتی، شۆڕشگەری. سرۆشتی دڵڕفێنی کوردستان وای لە سەر هوزانڤانی کورد کردووە کە وایە سرۆشت بەشێک لە ئەندام و ژیانی کوردە و لە سروودەکانی دڵداری ئەوەندە خۆلیاوی ئەوێنە کە رەنگە بێ ئەوێن ژیان تاڵە. شاکارە ئەدەبیانەی کوردی بەتایبەت «مەم وزین»ی ئەحمەی خانی نمونەی راستەقینەی ئەم وتارەیە کە بە زووانەکانی ئاڵمانی، ئینگلیزی، ئەرمەنی وتورکی وەرگێڕ کراوە. لە گۆڕەپانی مۆسیقاوە لە رۆژهەڵاتی ناوێن بەتواناترین نەتەوەین کە لە دوو بەش پێکهاتووە کە ئاماژەی پێ دەکەین:

١) بەشی بێ مووسیقا

٢) بەشی مووسیقا

**یەک)** بەشی بێ مووسیقا کە بریتین لە لاوک، حەیران، سیاچەمانە، لوورە، هوورە، موور کە هەموو ئەم بەزمانە تەنیا بە یارمەتی گرتنەوە لە قوڕگ لە سەر بەزمە جۆربەجۆرەکانی خۆیان ئەخوێنرێن و ئامێری مووسیقایان پێویست نییە. وەک لە دەقەکە دیارە (هوورە) و (موور) تایبەتی باشووری کوردستانە کە دەوڵەمەنی هەرە زۆریان هەیە بۆ نمونە «هوورە» خاوەن بیست و دوو بەزم و«موور» خاوەنی دووانزە بەزمی سەرەکیین کە لە فەرهەنگوکەکە ئاماژە پێان کردینە و نزیکترین سروودەی کوردیە کە لە (گاتها)ی ئەویستا دەچێت

**دوو)** بەشی مووسیقایی کە بریتیە لە ئەو بەزمانە کە ئامێری مووسیقایان پێویستە کە بۆزۆربەی گەلەکەمان دیاریە و لەێرەدا شیاوی باس نییە .

خانمی«جەمیلەجەلیل» لێکۆڵێنەری کورد لە کوردستانی سوور لە پێشەکی«لێکۆڵێنەوەیک جامیع لە ئاوازەکانی کوردی بە زاراوەی باکوور» دەنووسێ :

ئاوازی کوردی دەنگدانەوەی مووسیقای خاکی کوردوستانە، دەنگی سوێند ونەوای ئەجدادی ئێمەیە، قەڵبەزەی رۆبار و کانیەکانێکە کە لە چمک وسۆچی ئەم مەڵبەندە دەنگ ئەداتەوە، هاژەی تۆنە بای سەر زوزانە، جریوەی چۆڵەکە و هاڕەی بەرخ ومەڕەکانیەتی.... ئاخۆ ئەمە مێژووی زیندووی کورد نییە؟

«بڵاو» دەنووسێ :

فەقیرترین عەشیرەتەکانی کورد لە بوواری ئاواز و نەغمەی دڵڕفێن دەوڵەمەندن

یان«کونفوسیوس» دەڵێ :

ئەگەر بتەوێ پێشکەوتوویی و شارستانیەتی نەتەوەیەک بێزانی گوێ لە دەنگی مووسیقایان بدە

بەڵەی بەرێز گیان باوەرِیم هەیە کە کورد ئەگەر مووسیقاکەی تێک بچێت فەرهەنگەکەشی بێ فەرە و یەکێک لە هۆکارەکانی زیندوویی فەرهەنگ و زووانی کوردی پەرەپێدان وخزمایەتی مووسیقاکەیەتی. ئەو مووسیقایە کە شانازیی پێدەکات و بە دەست وپەنجەی خۆی لێدەدات، جوانترین وشەکان بۆی هەڵدەبژێرێ و لە چووار چێوەی شێعری پێشکەش دەکات و بە بەرزترین وخۆشترین دەنگ ئەیخوێنی. ئائەمە مێژووی زیندووی کوردەواریە کە بە هیچ جۆرێک تێکچوونەوە و مردنی تێا نییە.

بۆ تێگەیشتن وشارەزایی لە سەر فەرهەنگ وکەڵتووری هەر نەتەوەیەک ناسینەوەی وشەکانی ئەم جەماوەرە پێداوێستیکی هەرە گرینگە ئەوەی کە لە بەرچاوی خۆت ئەیبینی بەشێکی بچووک لە فەرهەنگ و زمانی کوردیە کە بە ناوی «فەرهەنگی باشوور»پێشکەشی ئێوەی بەرێز کراوە و مەبەستم ناساندنەوەی زاراوەی کوردیە لە باشووری رۆژهەڵاتی ئێران بە تایبەت لە پارێزگاکانی«کرماشان، ئیلام، لورِستان» کە دیارە؛ ماوەی زۆرێکە بیر لە سەر ئەوە ناکرێت کە بەشی هەرەزۆری کوردی تێایە. بە دریژایی مێژووی کورد، باشووری کوردستانیش کوردانە و کورِانە ژیاویەتی وخزمایەتی زۆرێک لە سەر ئەدەبیات و فەرهەنگی نەتەوایەتی کوردی کردووە کە لە گۆڤارەکانەوە بڵاو بووە.

بۆ ئەوەی کە خوێنەری ئێمە باشتر تێبگاتەوە شایانە چەن دێرِێک سەبارەت بە«باشوور» بنووسم

**یەک)** ئەم فەرهەنگە تەنیا بەشێک لە وشەکانی مەڵبەندی«کرماشان و ئیلام و لورِستانە» و نووسەر هیچ خۆبایی بە خۆی ناکا کە هەموو وشەکانی دۆزاوەتەوە و دەستی تێوەرداوە و ریشەیابیان کردووە. بۆیە هەر رەخنەیەک کە بسڵمێنێ فەرهەنگەکە تەکمیل نەکراوەیە بە چاوی شیرین ئەپسێنم و هێوام وایە لە داهاتوویەک نە فرە دوور گەلی مە چالاکییەکی کورِانەی هەبێت و فەرهەنگیکی پرِتر و بەکڵک تریان تەرخان بکەن تا کامی هۆگرانی فەرهەنگ و زووانی کوردی تێروتەسەڵ بکرێت. ئەوەش لە بیر نەکەین کە لە ماوەێ ژیانی فەرهەنگوک تا ئێستە کە ساڵەهاێ ساڵی لە سەر تێپەرِ بووە هیچکەس نەیتوانیوە فەرهەنگیکی تەرخان بکات کە بە گشتی هەموو وشەکانی تێدا بێت کەچی ئەوە فارسی بێت یان عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی. ئەڵبەتە ئەوە بەو مانایە نییە کە بەرهەمەکانی پێشووتر بەرهەمیکی باش نەبووە. فەرهەنگ نووسانی پێشوو خزمەتی زووانەکان کردنە و ئەمنیش ماوەێ دەساڵ لە تەمەنم لە سەر ئەو کارە دانامە کە جگە لە هەستی کوردایەتی وخزمایەتی بە گەلی خۆم هیچ پاڵپشتیکی ترم نەبوو کەچی ئیستا بووە بە ئەو فەرهەنگە کە ئەیبینی بە ئاواتم دڵخوازتان بێت. لێرەدا شیاوی باسە کە بڵێم فەرهەنگ نووس کییە؟ بە باوەرِی کەسان (فەرهەنگ نووس تەنیا وشە کوو ئەکاتەوە و هەرکەسێک ئەتوانێت ئەم کارە بێ دوو وسێ بکات). فەرهەنگ نووس لە ماوەی ژیانی ئەدەبی خۆیدا بێ ناو ونیشان ترین مرۆڤی دنیایە بەڵام شاعێریک تەنیا بە پارچە شێعرێک لە دنیادا بە ناوبانگ دەبێت ئەم بۆچۆنە لە لایەن زۆربەی هەرەزۆری خەڵک و نووسەر و شاعێر باوە بەڵام کەس بیر لە سەر ئەوە ناکا پارچە شێعرێک لە ماوەی چەن رۆژ یان چەن ساڵ بە دی دێت و فەرهەنگوکێک لە ماوەێ چەن ساڵ؟ ئەگەر پرس بە من بکرێت ئەڵێم ئەمە راستە بەڵام نە بەم شێوازە. فەرهەنگ نووس تەنیا وشە کوو ناکات بەڵکوو بە دڵسۆزی و زانایی و مۆتاڵای خۆی کڵک وەرئەگرێت و ئەتوانێت باسی مۆرفولۆژی و ئیدیوومی وشە بکات و بە خوێنەر بسڵمێنێت کە وشەی خۆماڵی رەسانەیەتیی چۆنە. لە پرِۆسەیکی ئەدەبیدا ئەرکی فەرهەنگ نووس لە سەد؛ پازدە زیاتر نییە ئەوەش بەو مەرجە کە فەرهەنگ نووس تەنیا وشە کوو بکات کە بۆ خۆی پلەیکی بەرچاوە

بەڵام شاعێر و نووسەر و وتەبێژ و رۆژنامەوان ئەتوانن ئەرکی فەرهەنگ نووس بۆ خوێنەر جیبەجی بکەن ئەوەش بەو مەرجە کە خۆیان وەکوو فەرهەنگ نووسێک شارەزای وشەی خۆماڵی بن و خۆێنەر بە خوێندنەوەی باسەکانیان و چۆنیەتی بە کار هێنانی وشەکان سرنجیان راکیشنە سەر مانای وشە و کتیبی فەرهەنگوک. کە لاپەڕەی فەرهەنگوکت داوەتەوە و مانای وشەکەت تێا بوو ئەرکی فەرهەنگ نووس تەواوە. فەرهەنگ نووس جارێک شووانە و جارێک گاوان و وەرزێر، ماوەیەک ئەدیب و زانا و هێندێک جار لات و بەرەڵایە بۆ ئەوەی کە ئەبێ لە هەموو بووارێکدا پێداچۆنەوەی هەبێت و لە زۆر شت بێ بەشە.

**دوو)** باشوور بریتیە لە وشەکان و لاناوەکان و لاهناکان و ئەرزناسی پارێزگای کرماشان و ئیلام و تا شارەزاییم هەبووە لە گەڵ (ئەویستا، پەهڵەوی، لاتین، فەرانسە، تۆرکەمەنی، تۆرکی، سەکزی، گیلەکی، سمنانی، کرمانی، یەزدی، فەریزەندی، سۆرانی، هەورامانی و کرمانجی» هەڵسنگاندوومە بەشکەم ناسنامەیەک کوردی بۆ وشەکان بدۆزرێتەوە چۆنکە زۆربەی وشەکانی ئێمە لە لاین گەلانی دەراوسێ کورد خزمایەتی ئەدەبیاتی ئەوان دەکەن و بەناوی ئەوان بڵاو بووەتەوە .

**سێ)** چەن جار ناچار بوومە کردارەکان دابەش بکەم چۆنکە کردار لە زاراوەی ئێمە گرینگایەتیکی زۆری ئەداتەوە شێوەی وتار ونووسین و باری مەعنایی. بۆنمونە کرداری «دیم» چەندەها مانای هەیە ١) من ئەوەم بە چاو دی ٢) پشت و رووی هەرشتێ ٣) ژوورێک جگە لەو ژوورەی کە ئێستە تێاوین.... بەشی دووهەمی ئەبێتە «دیما» یان«دیمەو» واتە پەیدام کرد ئەیبینین لە بنەڕەتەوە وشە نییە بەڵکوو کردارە بەڵام ماناکانی جۆربەجۆرە جگە لە وانە چەندەها پاشگرمان هەیە کە کاتێ لە دووایی کردارەکان بێت زەمان، چەنم کەس، یەکڵە یان گەل بۆمان روون ئەبێتەوە کە ئەوانە بریتین لە (ا، ان، سا، سان، سانا، سانەو، سە، سەو، سەوە، سەێ، وە، وەێ، و...) و دوو سەد و شەست ودوو دابەشکراوەی جۆربەجۆر لە زاراوەی ئێمە هەیە کە رەنگە بۆهەمووان ناسیار نەبووبێت کە بە ناچار ئەوانەم دووپات کردووەتەوە هەمیسا من ئەو کردارانەم دابەشکردووە کە یا بەشی دووهەمەکەی مانابیکی جیاوازی هەیە یان زێاتر لەدوو مانای هەیە یان چەن کردارمان بۆیەک کار هەیە کە من بە شێوەی هەڵبژاردنەوە یەکێکیان دابەشکردمە

**چووار)** لەم فەرهەنگوکە تێکۆشانم هەبوو کە ناوی راستەقینەی گۆندەکان و کێفەکان ورۆبارەکانی ئەم پارچە وڵاتە بنووسم کە لە هەموو فەرهەنگەکان کاریکی بەرچاوە بەڵام ئەوەی من ئەمەوێ بێژم ئا ئەمەیە: کوردی تەنیا وتەنیا بە رێنووس وفۆنووتیکی کوردی مانای هەیە نە شتێکیتر. بۆ نمونە شارۆچکەی «ماهیدەشت» مانای دەشتی پڕ لە ئاو و ماسی بیر ئەخاتەوە لە حاڵێکەوە کە بە کوردی پێ ئەڵێن «مایەشت» واتە دەشتی گەورەی ماد یان «چقا کەڵبعەلی» کە ماناکەی زۆر خەراپترە واتە چیای سەگیعەلی ئەمە لە حاڵێکدایە کە ئەو گۆندە«چیاکەڵوالی»ە واتە چیای خانی مەزن یان گۆندی«مایزان» و کێفی«مانشت» و ... کە هەموویان بە هەڵە نووسراونە و پێشنەی پڕ لە گەشەیان کوژراوەتەوە. ئەوەی کە شایانی باسە ئەوەیە کە «ناو» یەکێک لەو شتانەیە کە زۆر کەس شانازی پێ دەکا ناشێ ناوەکە وابگۆڕێنی کە ماناکەشی جۆرێک جنێو بێت ئێوە هەرگیز ناپسێنین ناوەکەتان«کە زۆر خۆشتان دەوێ» بە گوێرەیەکیتر بانگ بکرێت کە جگە لەوەی کە مانایەک بێجگە لە ناوەکەتانی هەبێت، جوێنیش هەبێت.

**پێنج)** یەکێ تر لەوانەی کە من هەستم پێە ناوە کوردیەکانە. چ ناو بێت چ سووکەناو. بە باوەڕی من جوانترین ناوەکان بۆ مرۆڤ تەنیا لە نێو زووانەکانی بوومی وکۆن دەست دەکەوێ کە کوردی یەکێک لەوانەیە. رازاوەیی ناوەکانی

کوردەواری وەها کاری کردووە کە خەڵکانیتر ناوەکانی کوردیان هەڵبژاردووە و خۆیان بە خاوەنی دەزانن بۆ نمونە فارس زووانەکان ناوی «فەرهاد»یان زۆر خۆشدەوێ و بە کارێ دێنن و کاتێ پرسیار دەکەین: فەرهاد واتە چی؟ وڵام ئەدەنەوە: ئەوێنداریکی بە جەرگ بوو یان خاوەن ئەوێنیکی پاک بوو یان... لە راستیدا وایە بەڵام «فەرهاد»چۆنکە ناویکی کوردیە، لە کوردی ماناێ هەیە «فەرهاد» پێکهاتووە لە «فەرە + هات» کە پێکەوە واتە ئەو کەسەی کە بەختی زۆرە یا «فرە + هات» واتە ئەو کەسەی کە فرە هات وچوو دەکات هەر لە ناوڕۆکی چیرۆکی «شیرین و فەرهاد» ئەوەمان بۆ روون ئەبێتەوە یان «فەرییبۆرز» واتە «فەرە + بەرز» بە مانای باڵابەرز و قەڵەو و... کە هەموویان کوردی پەتیە و کاتێ کە بچێتە سەر زاراوەی کوردی ماناکەی روون ئەبێتەوە.

**شەش)** هەروا کە لە سەرەوە باسمان کرد زۆر وشەی کوردی هەسمان کە لە دەرەوەی کوردوستان خزمەتی زووانەکانی دەراوسێ دەکەن کە بنچینەی کوردیان هەیە و خۆدی کورد ئەوانەیان بە کار ناهێنێت بۆ نمونە «وجدان» ئامێتگەلیکی کوردیە کە بریتیە لە «وژ+ دان» واتە ئەو نەیرووە کە تەنیا خۆدی مرۆڤ ئاگاێ لێ بێت کە لە بوواری وشەییەوە «وژ» بە ماناێ «خۆد»ە کە لە کرمانجی «وێژ، وژ» و لە لەکی «وژ، وژەسێ» هەر بەماناێ «خۆد»ە و کوتاییەکەشی«دان»کە وشەییکی ئەویستاییە و بە ماناێ زانستنە و سەرجەم ئەبێتە «وژدان» کە بێ دوو وسێ کوردی پەتییە یان«بارز، بروز» کە لە «بەرز»ی کوردی و «النجم» لە وشەی«نەجْم»ی کوردی وەرگێڕ کراوتەوە و عارەب زۆر بە کارێ دێنێت. من تەقەلام ئەوە بووە کە بە یارمەتی هەموو زاراوەکانی کوردی «کە بە راستی شارەزاێ هەمووێان نییم» بگەینم کە کام وشە لە بنەڕەتەوە کوردیە یان وەرگێڕ لە کوردیە کە وا دیارە پرۆسەیەکیتازەیە بە ئاواتم ئەگەر هەڵەیشی تێدا بێ بە رەخنە جووانەکەتان یارمەتیم بدەین.

لە سەر هەموو ئەوانە«باشوور» کەم وکۆڕی زۆرێ تێایە کە نەبوونی سەرچاوەی نووسەرەکانیتر وپان و پووڕی ئەرزی وجۆربەجۆری زاراوەکانی ئەم مەڵبەندە هەر لێکۆڵێنەرێک ماندوو دەکات. من تا ئەو جێگەی کە توانیمە لە هەموو زاراوەکانی باشووری کوردوستان کە بریتین لە «کەڵهوڕی، فەیلی، زەنگنەئی، گورانی، لەکی، لوڕی» کڵک وەربگرم و بە ئێوەێ خۆشەویست پێشکەش بکەم و نەنووسراوەکان و نادیاردیەکانی ئەم بەشە بنووسم و بێانناسێنم بەشکەم لە ئەدەبیاتی نووی کوردی و لە «زووانی یەکگرتووی» کوردی بەشدار بووین کە بە راستی«زووانی یەکگرتووی» کوردی پێویستیکی بەرچاوە کە بە ئاواتم زۆرتر لە سەرێ باس بکرێت. لە دووایی شایانی باسە کە بێژم: گەلێک وشەی نووسراوەی باشوور، پێتی«ل» و «گ» لە پاڵ دەستی نووسراوە ئەوانەی کە پێتی «ل» لە سەر داناوە واتە ئەو وشە «لەکی» یان «لوڕی»یە و ئەوانەی کە «گ»ی لە سەر دانراوە تایبەتی برا و خوشکانی « گووران»ە ئەڵبەتە ئەوە بەو مانایە نییە کە لە سەرجەمی ئەم وشەگەلە بەشدار نیین بەڵکوو مەبەست ئەمەیە کە ئەم وشەگەلە تەنیا و تەنیا لە نێوانی ئەوان ئاخاوتنی پێدەکەن هەروەها نیشانەی جیاوازی ئەخاتە نێوانی ماناێ کوردی و فارسی واتە بە دووای ماناێ فارسی وشەکان نووسراوە هەروا پێتی «وُ» کە وا دەزانین لە کوردی «ـُ»مان نییە بۆ خاتری ئەوەی کە لێژنەی پێتەکانی«و» تووشی هەڵ ومەرج نەبێت نووسیمانەومەبەست ئەمەیە کە ئەم وشەگەلە دوو پێتی «و» لە سەرە وەک«قوُڕ» لە بنەڕەتەوە «قووڕ»ە. هەروەها بزاوی (ـْ) کە لە کوردی «زەنە» و لە عەرەبیدا «کەسرەێ موختەلێسە» پێ دەڵێن کە بەتایبەت لە کوردی باشوور زۆرتر بەرچاوە وەک:

| | |
|---|---|
| سۆرانی: زووانی کوردی | کرماشانی: زووانْ کوردی |
| سۆرانی: موحەمەدی قازی | کرماشانی: موحەمەدْ قازی |

ئەم بزاوە لە وشەگەلی کە دوو ئاوایَ لە سەری بێت یان لە  نووسینەوە لە یەک دەچن زۆرتر دیاردەیە وەک:

| | |
|---|---|
| داڵگە: daĺige دایە | داڵگە daĺge داوکە، دەسپێکردنەو |
| دەنگ: dang هنا، بانگ | دەنگ danig تاقە، یەک دانە |
| دۆڕ: dor̂ دریژ، شووڕ | دوڕ diwir̂ دیکتاتوور |
| بڕمان : bir̂iman ئەوانە ئەیبڕم | بڕمان bir̂man روومەت، شێوە |

**فەرهەنگوکە کوردیەکان**

هەرچەندە کە ساڵەهائ ساڵە لە سەر نووسینی فەرهەنگوک تێپەڕ بووە گەلی کورد ئەوەندە چالاکیی لە سەر فەرهەنگ نووسی نەیکردووە بە تایبەت لە باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان لە مەر ئەوە تێڕوانینیکی خێرا کەین لە سەر ئەو فەرهەنگە کوردیانەی کە تا ئیستا بڵاو بووەتەوە:

١) فەرهەنگی نەوبەهار (١١١٨-١٠٦١ هـ) هەڵبەستێنەری گەورەی کورد «شەیخ ئەحمەدی خانی» کە عارەبی بە کوردیە و شەش هەزار وشەئ کرمانجی باشووری تێایە. فەرهەنگی نەوبەهار لە ساڵی (١٣١٠ هـ) بە دەستی«یوسف ضیاالدین پاشا الخالدی المقدسی» خراوەتە سەر فەرهەنگەکەی خۆی بە نێوی « الهدیە الحمیدیە فی الغە الکردیە» و لە ئەستەمبووڵ بڵاو کرایەوە.

٢) دووای نەوبەهار لە ساڵی (١٧٨٧ م) «ماوریزیو گارزۆنی» کتیبێک بە نێوی «گرامر و فەرهەنگ وشەی کوردی» ناحیەی عمادیە لە رۆما پێتەختی ئیتالیا بڵاو کردووە کە شەش هەزار وشەی کوردی ناوچەی عمادیەی تێایە و کوردی بە ئیتالیایە.

٣) فەرهەنگی (ئەحمەدی) لە ساڵی (١٣١٥ هـ) بە دەستی «شەیخ مارف نودهی» کە کوردی بە عارەبیە و شێوەی نووسینی وەک فەرهەنگی نەوبەهارە و لە دوو بابی «ئەسما» و«ئەفعال»ە. ئەڵبەتە عارفی خوالێخۆشبووی لەک «مەلا حەقعەلیسیاهپووش»یش هەر بەو شێوازە بەشێک لە وشەگەلی زاراوەی لەکی نووسیویەتیکە بۆمان دەرکەوئ ئەمە رێبازێک بووە بۆ خڕکردنەوەی وشەگەلی کوردی بە شێوەی شێعریەوە کە لە باکوور تاکوو باشوور لە دووای یەک هاتنە.

٤) کتیبی (دربارەی کردان ایرانی و اجدادشان کلدانیهای شمالی) بە دەستی«پ.لرخ» لە ساڵی (١٣٥٨) کە کوردی بە رووسیە و لە ساڵی (١٨٥٩ م) بە ئاڵمانی وەرگێڕ کراوەتەوە.

٥) لە ساڵی (١٨١٤) کتیبێک بە نێوی «پیرستی وشەگەلی کوردی» بە دەستی «کلاپرث» لە «مەجمووعەی مەنابەعی رۆژئاوا» بڵاو بووەتەوە.

٦) لە ساڵی (١٨٦٥ م) کتیبێک بە نێوی «پیرستی وشەگەلی کوردی و سووری» لە مەجمووعەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەدەستی (موولر) بڵاو بووتەوە کە ئاڵمانیە و سەبارەت بە کوردانی تورکیایە و یەک هەزار لەفزی تێایە.

٧) لە ساڵی (١٨٧٢ م) کتێبی «مختصر قواعد و فرهنگ لغت کردی ناحیەی هکاری» بە دەستی«ر.آ» نووسراوە کە یەک هەزار و شەشسەد وشەی کوردی هەکاری تێایە وکوردی بە ئنگلیزیە ولە گوفاری «ئە نجوومەنی شەرق ناسی ئامریکا» لە نیوهاون چاپ کراوە.

٨) لە ساڵی (١٨٧٩ م) کونسوولی رووسیا لە ئەرزەرووم «الکساندرژابا» فەرهەنگوکی کوردی بە فەرانسە تەرخان کردووە کە پانزدە هەزار وشەی کوردی تێایە و «فردیناند یووستی» لە چاپی داوە.

٩) لە ساڵی (١٨٨٧ م) کتیبێک بە نێوی (مجموعەی لغات کردی) بە دەستی«ای. پریم» و«آ. سوسین» لە سەنپترزبوورگ بە زووانی ئاڵمانی بڵاو بووەتەوە.

١٠) لە ساڵی (١٨٧٨ م) دوو فەرهەنگی کوردی بە نێوی «فەرهەنگی کوردی بە رووسی» بە سێ هەزار وشەوە و فەرهەنگی«فەرهەنگی رووسی بە کوردی» بە چووار هەزار وشەوە بە دەستی «س.آ.اگیازاروف» و «ل. ب. راگورسکی» چاپ کراویە

١١) له ساڵی (١٨٧٨ز) کتیبی (نام حیوانات در زبان کردی) به دەستی «فردیناند یووستی» که فەرانسیه چاپ کرایه.

١٢) له ساڵی (١٨٩٧ م) بەشێک له چەن دەسنووسی کوردی به شێوەزاری مردینی له گەڵ فەرهەنگوکی کوردی به ئاڵمانی به دەستی«هـ. ماکاس» چاپ کراوه.

١٣) له ساڵی (١٩٠٤ م) کتیبێک به نێوی «هیات علمی در ایران» به دەستی «ژاک دۆمورگان» نووسراوه که تایبەته به مێژووی کورد و کوردوستان و لەم بەشەدا لێکۆڵێنەوەیەکی له سەر وشەگەلی کوردی یانزده ناوچەی کوردوستانی کردووه و له گەڵ مانای وشەکان به فەرانسەوی له چاپی داوه.

١٤) له ساڵی (١٣١٠ هـ) فەرهەنگوکی کوردی به عارەبی له ئەستەمبووڵ بڵاو بووه که سیسەد و نووزده لاپەڕەیه و پانزده هەزار وشەی کرمانجی باکووری تێدایه که به دەستی «یوسف ضیاالدین پاشا الخالدی» چاپ کراوه.

١٥) له ساڵی (١٩١١ م) فەرهەنگیکی (کوردی به فەرانسەوی) و هەروەها (فەرهەنگی فەرانسه به کوردی) له لاین«هـ. ئاجوڕیان» بڵاو بووەتەوه که سەبارەت به ناوچەی «بایزید»ه.

١٦) له ساڵی (١٩٢٢ م) کتیبێک به نێوی (گرامر زبان کردی در ناحیەی موصل) له لاین کاپیتان «ر.ف. جردین» کوو کراوەتەوه که چووار هەزار وشەی کرمانجی باکووری تێدایه و له بەغداد بڵاو بووەتەوه.

١٧) له ساڵی (١٩٥٥ م) لێکۆڵێنەری هەرەمەزنی کورد «گیو موکریانی» کتیبێک به نێوی (کوڵکه زێڕینه) که کوردی به فارسی و عەرەبی و ئنگلیزی و فەرانسەویه که بریتیه له سی هەزار وشەی کوردی له هەولێر له چاپی داوه هەروەها (فەرهەنگی مەهاباد) که کوردی به عارەبیه له ساڵی (١٩٦١ م) له چاپی داوه.

١٨) له ساڵی (١٣٦٢ هەتاوی) کتیبێک به نێوی (نامهای پرندەگان در لهجەهای کردی) به دەستی لێکۆڵێنەری گەورەی کورد دوکتور «موحەمەدی موکری» بڵاو بووه و هەروەها کتیبی«گورانی» که گورانیه کوردیەکانه که به فارسی دووپات کرایەتەوه و زیاتر له پانسەد وشەی کوردی به فارسی له دووایی ئەو کتیبه نووسیووه که له ساڵی (١٣٢٩) له چاپی داوه.

١٩) زانای ئایینی کورد «ئایەتولا شەیخ موحەمەدی مەردووخ» فەرهەنگیکی به نرخ تەرخان کردووه که لەویدا زیاتر له هەشتسەد پەندی پێشنانی ناوچەی سنه تێدا نووسیووه.

٢٠) له ساڵی (١٩٦٤-١٩٥٩) زانای بەڕێزی کورد مامۆستا «شەیخ موحەمەدی خاڵ» فەرهەنگیکی کوردی به کوردی نووسیووه به نێوی (فەرهەنگیخاڵ) که یەکێک له فەرهەنگه به نرخەکانی کوردیه.

٢١) له ساڵی (١٩٦٥م) فەرهەنگێک به نێوی «نڤیسا من» له پاریس بڵاو بووه له لاین دوکتور «کامەران عالی بەدرخان» که یەکێک له به ناوبانگترین لێکۆڵێنەرانی کورده که خۆی مامۆستای زووانی کوردی بووه و له زانستگای سووربونی فەرانسه خوێندەواری خۆی تەواو کردووه و له سەر زووانەکانی ئنگلیزی و فەرانسەوی و ئاڵمانی و عارەبی وتۆرکی و فارسی و یوونانی زاڵ بووه.

٢٢) له ساڵی (١٩٧٥م) کتیبێک به نێوی (فەرهەنگی کوردی) به دەستی «چ.خ.باکایف» که بریتیه له چووارده هەزار وشەی کوردی کرمانجی باکوور به مانای رووسی له موسکو بڵاو کردووه.

٢٣) له ساڵی (١٩٦٢م) هەڵبەستێنەری به ناوبانگی کورد مامۆستا «جەگەر خوێن» که خۆی کوردی سووریایه فەرهەنگیکی تەرخان کردوو که شەش هەزار وشەی کوردی تێایه و له بەغداد به چاپی داوه.

٢٤) له ساڵی (١٩٦٩م) كتێبێك له لاین ماموٚستا (جەماڵ نەبەز) بڵاو بووه به نێوی (منتخب آثار نظم و نثر نویسندگان و شاعران كرد) كه به زووانی ئاڵمانیه و فەرهەنگوكێك له سەری دانراوه.

٢٥) له ساڵی (١٩٦٠م) ماموٚستا «جەماڵ نەبەز» كتێبێكیتر به ناوی (هەندی زاراوەی زانستی) بڵاو كردووه.

٢٦) له ساڵی (١٩٦٠م) لێكۆڵێنەری به ناوبانگی كورد «ق.كوردیف» فەرهەنگیكی كوردی به رووسی بڵاو كردووه كه بریتیه له سی و چووار هەزار وشەی كوردی له هەشتسەد ونەوەد لاپەڕە.

٢٧) له ساڵی (١٩٥٧م) زانای به ناوبانگی كورد «ئارام چاچان» فەرهەنگیكی ئەرمەنی به هاو بەشی «سیا بەندووف» به كوردی تەرخان كردووه و له ئیرەوان له چاپی داوه كه بیست و سێ هەزار وشەی كوردی كرمانجی باكووری تێدا كووكراوه.

٢٨) له ساڵی (١٩٦٦م) ماموٚستا «تەوفیق وەهەبی» و «ئیدمونتس» فەرهەنگیكی كوردی به ئنگلیزی نووسینه و له لەندەن له چاپ دراوه.

٢٩) له ساڵی (١٩٧٠م) «مەلا عەبدووڵ كەریمی مودەریس» كه خۆی له زانایان و لێكۆڵێنەرانی ناوداری كوردوستانه فەرهەنگێك به نێوی (دووڕشته) كه وەك نەوبەهار له سەر شێوەزاری شێعریه له چاپ داوه.

٣٠) له ساڵی (١٩٦٧م) زانای به ناوبانگی كورد «مووسا عەنتەر» كه خۆی له كوردوستانی تۆركیا ژیاوه فەرهەنگیكی بەنێوی (فەرهەنگی كوردی به تۆركی)ی له چاپ داوه كه ده هەزار وشەی كوردی كرمانجی باكووری تێدا گونجاوه كه یەكەمین فەرهەنگی كوردی به توركییه.

٣١) له ساڵی (١٣٤٨-١٣٤٧) دوو پەرتووكی كوردی به فارسی له (ئەلیف) تاكوو (ت) له لاین موراد ئەورەنگ بڵاو بووەتەوه.

٣٢) له ساڵی (١٩٧٢م) فەرهەنگی (اصطلاحات علمی) له لاین«عەبدووڵ قادری بەرزەنجی» له چاپ دراوه.

٣٣) له ساڵی (١٩٧٢م) فەرهەنگی (اصطلاحات كشاورزی) له لاین ماموٚستا «مارفی قەرەداغی» له چاپ دراوه.

٣٤) له ساڵی (١٩٣٤م) فەرهەنگیكی كوردی به ئنگلیزی له لاین ماموٚستا «شاكر فەتاح» له چاپ دراوه.

٣٥) له ساڵی (١٩٦٢م) ماموٚستا «عەلائودینی سەجادی» فەرهەنگیكی كوردی به فارسی و عارەبی له بەغداد بڵاو كردووه.

٣٦) له ساڵی (١٣٦١هە) فەرهەنگێك به نێوی (فەرهەنگی ماد) كه تەنیا بریتیه له پێتی «ئـ ـ ئا» له لاین «سدیقی سەفیزاده» بڵاو بووه.

٣٧) فەرهەنگی كوردی به عارەبی به شێوەزاری كرمانجی شەبەك له لاین «مەلا خەلیلی سلێمانی» له چاپ دراوه.

٣٨) فەرهەنگی (بووز ئەرسەڵان) كه نامیلكەیكه له سەر «مەم وزین»ی ئەحمەدی خانی و تۆركی به ئنگلیزیه.

٣٩) فەرهەنگی (ئەستێره گەشه) كه كوردی به عارەبیه له لاین «فازڵی نەزامەدین» له بەغداد چاپ كراوه.

٤٠) فەرهەنگی (فەرهەنگا كوردی نوژەن) به شێوەزاری كوردی به عارەبی له لاین ماموٚستا «عەلی سەیدو گورانی» له عومانی ئوردون چاپ كراوه.

٤١) له ساڵی (١٩٤٨م) فەرهەنگی (دمڵەكی زازاكی) له لاین ماموٚستا «مال مسیانژ» له ژنڤی پاریس له چاپ دراوه.

٤٢) له ساڵی (١٩٨٧م) فەرهەنگی كوردی به توركی له لاین «د. ئیزولی» له هوڵەندا چاپ كراوه.

٤٣) له ساڵی (١٩٦٨م) فەرهەنگیكی به نێوی (فەرهەنگی هەڵبەست) له لاین «ئەحمەدی رەشوانی» له بەغداد له

چاپ دراوه.

٤٤) له ساڵی (١٩٧١م) فەرهەنگێکی به نێوی (قامووسی ناوەکان) له لاین مامۆستا «عەبدولّقادری بەرزەنجی » له سلێمانی له چاپ دراوه.

٤٥) له ساڵی (١٩٧١م) فەرهەنگێک به نێوی (فەرهەنگی زانیاری) له لاین «عەبدولّقادری بەرزەنجی» له سلێمانی چاپ کراوه.

٤٦) له ساڵی (١٩٧٧م) فەرهەنگێکی کوردی به نێوی (قامووسی کوردی) له لاین مامۆستا «عەبدورەحمانی زەبیحی» له بەغداد چاپ کراوه.

٤٧) له ساڵی (١٣٦٢هە) فەرهەنگێک به نێوی (گویش کردی مهاباد) له لاین خانمی «ئێرانی کەڵباسی» چاپ کراوه.

٤٨) له ساڵی (١٣٦٧هە) فەرهەنگی (وشه دووانه زمانی کوردی) له لاین «طه فەیزیزاده» له ورمی چاپ کراوه.

٤٩) فەرهەنگی کوردی مامۆستا «جەلادەت بەرخان»

٥٠) له ساڵی (١٩١٣م) فەرهەنگی ئنگلیزی به کوردی له لاین «ی.ب. سوەن» له چاپ دراوه.

٥١) له ساڵی (١٩٦٣م) فەرهەنگێکی ئنگلیزی به کوردی له ناوەندی بڵاوکردنەوەی زانستی ئەمریکا له چاپ دراوه.

٥٢) له ساڵی (١٩١٦م) فەرهەنگی رووسی به کوردی له لاین «ف.نیکیتین» له ورمی له چاپ دراوه.

٥٣) له ساڵی (١٩٦٠م) فەرهەنگی رووسی به کوردی له لاین «ای.فاریزوف» له موسکو له چاپ دراوه.

٥٤) له ساڵی (١٩٧٧م) فەرهەنگی رووسی به کوردی به هاوبەشی «ی.ای.کیدایتینی» و «کوردوستان موکریانی» و «ف.ای.میتروخینه» له موسکو له چاپ دراوه.

٥٥) له ساڵی (١٩٤١م) فەرهەنگێکی کوردی به عارەبی به نێوی (ئەختەر) له لاین مامۆستا «عەبدولازیوەر» له بەغداد له چاپ دراوه.

٥٦) له ساڵی (١٩٥٠م) فەرهەنگێک به نێوی (فەرهەنگی ئەلمورشد) له لاین مامۆستا «گیو موکریانی» له هەولێر بڵاو بووه.

٥٧) له ساڵی (١٩٥٠م) فەرهەنگێکی عارەبی به کوردی به نێوی (فەرهەنگی رابەر) له لاین مامۆستا «گیو موکریانی» له هەولێر له چاپ دراوه.

٥٨) له ساڵی (١٩٥٥م) فەرهەنگێکی عارەبی به کوردی له لاین مامۆستا «عیزەدین موستەفا رەسووڵ» له بەغداد چاپ کراوه.

٥٩) له ساڵی (١٩٧٤م) فەرهەنگێکی عارەبی به کوردی له لاین «کەماڵ جەلاڵ غەریب» له سلێمانی چاپ کراوه.

٦٠) له ساڵی (١٩٦١م) فەرهەنگی فارسی به کوردی له لاین «شوکورولا بابان» له چاپ دراوه.

٦١) له ساڵی (١٩١٩م) فەرهەنگی کوردی به ئنگلیزی له لاین «میجرسۆن» له لەندەن چاپ کراوه.

٦٢) له ساڵی (١٩٦٥م) فەرهەنگێکی کوردی ئنگلیزی فەرانسەوی له لاین«جویس بلّو»له پاریس چاپ کراوه.

٦٣) له ساڵی (١٩٦٧م) فەرهەنگێکی کوردی به ئنگلیزی له لاین «ئێرنێست مکاروس» له میشیگان له چاپ دراوه.

٦٤) له ساڵی (١٩٥٧م) فەرهەنگی کوردی به رووسی له لاین «پیوتر لیرخ» له چاپ دراوه.

٦٥) له ساڵی (١٩٦٠م) فەرهەنگێکی کوردی به رووسی له لاین دۆکتور «قەنات کوردو» له ئێرەوان چاپ کراوه.

٦٦) له ساڵی (١٩٧٩م) فەرهەنگێک به نێوی (فەرهەنگی ئایدیوومی) که کوردی به رووسیه له لاین دۆکتور

«مەکسیمی‌خەمو» لە موسکو چاپ کراوە.

٦٧) لە ساڵی (١٩٨٣م) فەرهەنگی (سورانی رووسی) لە لاین دۆکتور «قەنات کوردو» و دۆکتور «زاری یووسف» لە موسکو چاپ کراوە.

٦٨) فەرهەنگیکی کوردی بە رووسی بە دەستی «آ. ئوربیلی» لە دانشکەدەی رۆژهەڵات ناسی لینینگراد لە چاپ دراوە.

٦٩) فەرهەنگیکی فارسی سورانی هەورامی کرمانجی لە لاین دۆکتور «تەقی ئیبراهیم پوور» لە تاران چاپ کراوە.

٧٠) لە ساڵی (١٣٦٩هە) فەرهەنگیکی کوردی بە فارسی بە نێوی (بدایع‌اللغه) بە نووسەرایەتی «عەلی ئەکبەری وەقایع‌نیگار» کە بە تێکۆشانی«موحەمەد رەئووفی تەوەکولی» لە ئێران چاپ کراوە.

٧١) لە ساڵی (١٣٦٩هە) فەرهەنگی (هەنبانەبورینە) لە لاین خوالێخۆشبوو مامۆستا «هەژاری موکریانی» لە هەزار و سی و پێنج لاپەڕە لە تاران بڵاو بوو کەبێ‌گومان باشترین فەرهەنگوکی کوردی تا ئێستە بووە.

٧٢) لە ساڵی (١٣٧٩ هە) فەرهەنگێک بە ناوی (فەرهەنگی هەرمان) لە لاین مامۆستا «عەلی نانەوازادە» بڵاو بووە کە تەنیا بەشی «ئا – ئـ»ی تێدایە.

لە هەموو ئەم فەرهەنگانە کە لە لاین مامۆستایان و گەورە پیاوانی کورد و غەیری کوردی بڵاو بووە کوردی باشوور واتە ناوچەی «کرماشان، ئیلام، لوڕستان» بە کورتی بەرچاو بووە یان هەر نەبووە کە بۆخۆی جیگای رەخنەیە. ئەڵبەتە لەێرەشدا کەسانەهایک وەک «مەلاحەقعەلی سیاهپووش» زۆربەی وشەکانی زاراوەی لەکی بە شێوەێ فەرهەنگی نەوبەهار تەرخان کردووە هەروەها کاک «حەمیدی ئیزەدپەناە» کە دوو فەرهەنگی«لوڕی» و«لەکی»ی بڵاو کردووە کە شایانە رێزی ئەم بەڕێزە بەرچاو بێت یان «فەرهەنگی مەنسووری» لە لاین «حەبیبولا مەنسووری» کە بەشیکی بچووک لە وشەگەلی ناوچەی ئیلامە وە هەروەها کاک (مەنووچێهری نوورموحەمەدی) ناسیار بە (خورجەک) و کوڕەکەی (کیانووشی نوور موحەمەدی) دەیان وشەی لەکی لە ناوچەی لەکستانیان تەرخان کردوونە کە بە داخەو لە چاپ نەدراوە.

## سەرچاوەکان


| | |
|---|---|
| هەنبانەبۆرینە | مامۆستا هەژار |
| فەرهەنگی‌خاڵ | مامۆستا خاڵ |
| فەرهەنگی‌لەکی | حەمیدی ئیزەدپەناه |
| فەرهەنگی‌مەنسووری | حەبیبولامەنسوری |
| فەرهەنگی‌دیهخودا | مامۆستاعەلی‌ئەکبەری دیهخودا |
| فەرهەنگی‌موعین | دۆکتور موعین |
| فەرهەنگی‌ئەویستا | مامۆستا فرەیدوونی‌جونەیدی |
| دەفتەری نەوروز | «کەڵامی‌یارسان» |
| جوغرافیای‌غەربی‌ئێران | خوالێخۆشبوو عیمادالدینی‌دەوڵەتشاهی |
| فەرهەنگی‌سەکزی | |
| فەرهەنگی‌فەرانسە | دۆکتور ئعتمادی |
| فەرهەنگی‌ئنگلیزی‌فارسی | دۆکتور ئاریانپوور |
| فەرهەنگی‌بدایع‌الغە | عەلی‌ئەکبەری وەقایع نیگار |
| مەشاهیری‌یارسان | سدیقی‌سەفی‌زادە (بورەکەیی) |
| ئیلات‌وعەشایری‌کرماشان | مامۆستا موحەمەد عەلی‌سوڵتانی |
| رۆستەموسوهراب بە رەوایەتی‌ئەویستا | خوالێخۆشبوو عیمادالدینی‌دەوڵەتشاهی |
| گوڵزاری ئەدەبی لوڕستان | خوالێخۆشبوو ئەمرولا غەزەنفەری |

له دووایی سپاسی ئەو کەسانە دەکەم کە لە کووکردنەوەو ساقکردنەوەی ئەم فەرهەنگوکە یارمەتی منیان داوە و بە ئەرکی سەرشانی خۆم ئەزانم کە پڕ بە دڵ سپاسی ئەم بەڕێزانە بکەم:

| | |
|---|---|
| دایکیبەڕێزم | خوالێخۆشبوو شیرینعەباسی |
| خاڵوی بەڕێزم | کاک هووشەنگ رەشیدی |
| بنەماڵەی | کاک خوسرەو قەمەری |
| رێزدار | کاک عەلیفەیلی |
| رێزدار | کاک بەهرام وەڵەدبەیگی |
| رێزدار | کاک جەبار بەساتی |
| رێزدار | کاک حوجەت نەزەری |
| رێزدار | کاک فەرهاد جەهانبەیگی |
| رێزدار | کاک قودرەت حاتەمی |
| رێزدار | کاک مۆحەمەد حوسەین شەریفی |
| رێزدار | کاک ئەکبەر قەنبەروەیسی |
| رێزدار | کاک عەلیبەخش رەزایی |
| رێزدار | کاک بابەک ئەڵماسی |
| رێزدار | کاک مەرزەبان رەجەبی |
| رێزدار | کاک مەهدی خانەبەیگی |
| رێزدار | کاک شێردڵ ئێڵپوور |
| رێزدار | کاک سادق سامرەیی (سارێژ) |
| رێزدار | کاک ئەفشین غولامی |
| رێزدار | کاک جەواد شەریفی |
| رێزدار | کاک ئەلاموراد جەباریان |
| رێزدار | کاک ئارەش زەیندین |
| رێزدار | کاک عەبدولا عفەتی |
| رێزدار | کاک موشتەبا شەفیعی |
| رێزدار | کاک فەریبورز نیکوونژاد |
| رێزدار | کاک ئەیووب شەریفی |
| رێزدار | کاک ئومید تەیمووری |
| رێزدار | کاک موشتەبا کەریمی |

وە هەروەها بەڕێوبەرانی ئەنستیتووی فەرهەنگی کوردستانی ئێران ودەزگای چاپەمەنی«ئاراس» و ئەنستیتووی کەڵەپووری کوردی لە سلێمانی کە بۆ لە چاپ دانەوەی ئەم فەرهەنگوکە چالاکیەکی کوڕانەیان کرد

خوشک و برایّ بەڕێز تا لە بیرم دێ، هەر کاتێک گەرەکم بوو بنووسم وشەکان خۆیان لێم هەشار دەکردن. وا دیارە ئەمجارەش هەشارهەشارە. بە راستی دەسپێکردنەوە دژوارە، من کە دەریای هەستم بە سروەییک دەخروشایەوە ئێستە بە دەستی تۆنە بای بێ وچانیش لەرەێ پێ ناکەوێ. هیچ وشەیەک ناتوانێ ئەو پەڕی خۆشەویستیم دەرببڕێ کە ئەو زەحمەتەم لە پایتەختی کوردوستان و لە چاپەمەنی ئاراس بڵاو بووەتەوە بە راستی ئەوە بۆمن جێگەی شانازیە کە هەتا هەتایە لە بیرم ناچێتەوە. بە داخەوە چاپی یەکمی فەرهەنگەکە لە بوواری رێنووسی لاتینەوە هەڵەی زۆری تێا بوو کە ئەوەش تاوانی من نەبوو چۆنکە من«سی‌دی» پێداچوونەوە و ساقکراوەی ئەم فەرهەنگەم داوە بە کابرایەک کە بنێرێ بۆ چاپەمەنی و بەداخەوە «سی‌دی»کە فەوتا و چاپەمەنی ئاراسیش بێ ئەوەی کە ماڤی من لە بەر چاویان بێت لە چاپی دان. هەرچەندەکە لەم بابەتەوە توڕەم بەڵام جاریکی‌تریش سپاسیان دەکەم. سەر لەنوو باسی‌کورد و کوردەواریە ئاخۆمن ئەمەوێ سەبارەت بە«زووانی‌یەکگرتوو» و زووانی کوردی بنووسم ئەشێ چی بنووسم؟ کە بیر دەکەمەوە رەنگە بیرەکانم هەڵە بێت و لێم هەڵقەشاوە بووی بەڵام نووسەر «کە من بە راستی نووسەریش نیم بەڵکوو هۆگرێکم لاواز» ئەشێ رووداوەکان و واقعیەتەکانی گەلی خۆی بنووسێ و لە سەرێ ورد بووتەوە. جا واقعیەتەکانی زووانی کوردی چییە؟ راستیەکەی وایە ئەبێ بزانین «کورد» کییە؟ کە لاپەڕەی مێژوو ئەدەینەوە زۆر وتار و

لێکۆڵێنەوەی جوان ئەبینین کە هەمووی دەساوەی تێکۆشانی گەلی کورد و غەیری کورد بووە بەڵام بووە، ئێستەش هەس؟ کورد وا بووە، فڵان بووە، فیسار بووەو... هتد ئێستەش هەین؟ من دەڵێم: کورد بنیامیکی دڵ پاک و بێ سیاسەتە کە زیاتر لە پێنج نیشتمانی هەیە، چەند زووانی رەسمییی هەیە و دەهـ دووانزە ئایین و دین و بیست و دوو زاراوە، جا تۆ بۆچۆنت چییە؟ ئێمە نیشتمانمان هەس، خاوەن فەرهەنگین، خاوەن مێژووین، خاوەن زووانین، سەرۆک و گەورەپیاومان زۆرە هەموو شتێکمان هەس و هیچمان نییە. چۆن ئەتوانین ئەو هەموو لەتە یەک پارچە کەینەوە؟ شەڕی چەکداری و پێشمەرگایەتی تا بە کەی ماڤەکانی رەوای کورد بپارێزێ ؟ لە سەر ئەو هەموو چەرمەسەریە داهاتووی گەلی کورد چۆن دەبینین؟ ئاخۆبە تەمای مۆعجیزە بمینین یا کوو کوڕانە دەست هەڵوەرێنین و بێنە گۆڕەپانی خەباتی قەڕنی بیست ویەکم؟ دەزانین ئەم قەڕنە بە چی ناودارە؟ سەردەمی «جۆڵینەوەی نەرم ئەمزاری» ئێمەش پێویستە لەم خەباتە بەشداریەتییکی بەرچاومان ببێت تاکوو گەلانی سەربەخۆی دۆنیا باشتر بزانن نەتەوەی کورد کییە. پێویستیەکانی ئەم خەباتەش، دەستی بەتوانا و بیری چاک و بنکەیکیی بە هێزە کە ئەشێ خۆمان بۆ خۆمان لدابخەین. لە پێشوو بە بێ پەیوەندی و هاتوچوو،گەلی کورد زووانی یەکگرتووی هەبووە کەچی ئێستە لەسەر ئەو هەموو پەیوەندیانە وگۆڤار و رۆژنامەو... زووانی یەکگرتوو بووە بە بەردی سەر رێگاێ کورد کە لابردنی ئەم بەردە بووە بە «تابوو»یکی کە کەس زات ناکا لە سەری بدوێت کاتێک دەنواڕینە دەسنووسەکانی جێماو لە پێشنان دەبینین زاراوەی گۆرانی زووانی ئەدەبیاتی گەلی کورد بووە هەر لە باکوورەوە تا کوو باشوور نووسەران و شاعێران نووسراوەکانیان بەم زاراوەیە بڵاو کردنە لە شێعرەکانی «مەلای جەزیری» بگرە تا «خەسرەو وشیرینی خانای قۆبادی» ئاخۆ کی وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوە کە چۆن بوو کە ئەم کارەساتە بۆ کورد رەخساوەتەوە؟

ساڵەهایَ ساڵە بە تەمای دارِشتنی چوار چێوەییکی ناسیارین کە بتوانین وتارەکان و لێکۆڵێنەوەکانمان بە پیَ بنووسین و لێدوانەکانمانی پیَ بڵێن وا دیارە چالاکی زۆرێک لە سەری کراوە و جێگەی متمانایە کە سپاسی قەڵەم بەدەستانی کورد بکەین بەڵام چەند خاڵی سەرەکی دەست نیشان کەین کە هیوادارم لە سەری بدوێن. ئەم چەند دێڕە تەنیا پێشنیارە نەک دەستوور کە تکامە گەلی کورد و بەتایبەت خوێنەران و نووسەران لە بەر چاویان بێت من باوەڕیم وایە هەر نەتەوەیەک کە فەرهەنگی وشە و ڕێزووانی نەبێت زووانەکەشی زووانیکی مردووە و ناتوانی راستەوخۆ بڵیَ ئەمنیش بوونم هەیە. پەندیکی ئنگلیزی هەیە کە ئەڵیَ : «هەر نەتەوەیەک قارەمانی نییە، شانازیشی نییە» هەر چەندەکە گەلی کورد قارەمانی نەبەزێان زۆرە .

**یەک)** دارِشتنی رێزووانیکی تایبەت بۆ کورد بە گشتی نەتایبەت بە یەک زاراوە و... بێت وادیارە ئێمە هێشتا رێنووسیکی یەکگرتوومانیش نییە و کەسەک لە سەر ئەوە بیرناکاتەوە. بەشێک بە رێنووسی لاتین دەنووسن و بەشێک ئارامی. من رام وایە باشترین رێنووس بۆ کورد بەشی لاتینیە چۆنکە خوێندنەوە و نووسینەوە بەم پێتە ساکارترە بە تایبەت بۆ باشووری رۆژهەڵات کە زۆربەی وشەکانیان دوو ئاواییە و بە رێنووسی ئارامی باش نانووسریَ وەک: کورْ خاس kwirî xas ئەگەر بنووسیم کوڕی خاس kwirî xas ئەوە لەفزی ئێمە نییە ئەگەر بنووسیم کوڕٍ خاس kwirî xas ئاخۆ ئەم« ِ» چیە؟ دووای ئەوە دوو ئاوا لە سەر یەک پێت ناگۆنجێت وهەر هەڵەیە یان ئامێتە بوونی«ن» و «گ» لە باشوور ئەم پێتە بە جووریَ منگە کردنەوە دەگۆتریَ یان پێتی« ۆ- ئۆ» کە تەنانەت لە باکووریش ئاخاوتنی پێدەکەن و بەداخەوە هێشتا لە نێو خۆدی باشووریشدا بە درۆستی نانووسریَ و هەر کەسەک بۆ خۆی رێنووسیکی هەیە بە کورتی و کوردی بڵێم لەم بەشە لە کورد و کوردوستان چەند بزوێن و پێتی تایبەتی هەیە کە ناشی لە سەرێدا رابوورین و بە تۆزێک جیاوازی لە نێو گەلانی تری کورد ئاخاوتنی پێدەکەن کە ئەشیَ چارەسەر بکریَ .

**دوو)** بۆ ئەوەی کە زووانەکەمان خاوێنتر و کارامەتر بیَ ئەشیَ فەرهەنگوکی هەموو زاراوەکانی کوردی هەر لە باکوورەوە تا کوو باشوور و رۆژهەڵات بدۆزرێتەوە و ساقبکرێتەوە کە وادیارە لەم بابەتە دەوڵەمەندین.

**سیَ)** داخستنی بنکەییکی زانستی کە بەڕێوەبەرانی ئەم کۆڕە لە مەڵبەندەکانی کورد بێت کە بتوانن زاراوەکەی خۆیان بۆ کۆڕەکە دووپات کەنەوە و ئەندامانی کۆڕەکەش تێبگەن. کە وا بزانم ئاوەها کۆڕێک داکراوەیە و لە گەڵ ئەنستیتووەکانی کوردناسی دۆنیادا لێدوانە و پەیوەندی فەرهەنگیان هەیە.

**چووار)** دیاری کردنی یەک زاراوە بە نێوی زاراوەی سەرەکی کە چوارچێوەی زووانی کوردی لە سەر ئەو زاراوە بووبی و زاراوەکانیتر هاریکاری و هامیاری ئەو بکەن .

**پێنج)** دۆزینەوەی وشەی دەسکار بۆ ئەوشتانەی کە نیمانە بەتایبەت لە سەر زاری تکنولووژی ئەوەش بەو مەرجە کە کۆڕی ناو براو چاوەدێریی بکات و وا نەبیَ هەر کەسەک لە شەقامێک دا کەوتە ریَ و هەر چشتەک دی بگۆڕینیتە سەر زاری کوردی کە ئەوە نە تەنیا خزمەت نییە بەڵکوو خیانەتە. گەلی کورد بە بۆنەی ژێردەسەڵاتی و پارچە پارچە بوونی نەیتوانیوە لە گەڵ زووانەکانی دراوسیَ هامالی بکات هەر چەندەکە وشەی زۆری هەیە کە زیاتر ئەدەبیە تا کوو تکنولووژیکی و واقعیەتیش وایە ئێمە خاوەن شارستانیەتین نە خاوەن تکنولووژی بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوە کە دەس بەتاڵ دانیشین. وشەی دەسکار پێویستی سەردەمی ئێمەیە بەو مەرجە کە چاودێری بکرێت بۆ نمونە لە سەردەمی پێشوو باسی«گفتمانتمدنها» کە لە لایەنی سەرۆک کۆماری ئێران بڵاو بووەتەوە زووبەزوو گۆڕاوە سەر

زاری کوردی و بووه«وەتووێژی شارستانیەت» کە بە  بڕوایٚ من رازاوەتر وجوانتر  لە باسی«گفتمان تمدنها» بوو یان بۆ وشەی«عینک» چاوێلکە دۆزراوەتەوە کە جگە لە مانای عەین بە عەین زوو بەزوویش لە نێو خەڵک جی کەوت.

**شەش)** باس کردنەوە لە سەر چالاکییەکانی زاراوەکانی کوردی، واتە روون بکرێتەوە کە هەر زاراوەیەک چ تواناییکی هەیە و چۆن ئەتوانێ یارمەتی زووانی یەکگرتووی کورد بداتەوە. من بەش بە حاڵی خۆم تا ئەو جیگەی کە توانیمە و ویستم هەبووە لە سەر زاراوەی باشووری رۆژهەلاّت ورد بوومە و بە ئاشکرا دەڵێم: ئەم زاراوەیە پاشماوەی زووانی گۆرانییە و زاراوەیەکی ئەدەبیە کە خاوەنی بەشی هەرەزۆری فۆلکلۆری کوردیە و وشەکانی ئەم بەشە باری مەعنایی و ئەدەبیاتیکی زۆر بە قەوەتی هەیە. لە خوار ئاماژە بەچەند تایبەتمەندی زاراوەی باشوور دەکەم.

ئا) وشەی کوردی ئەم مەڵبەندە مێژووی دوور و درێژی هەیە و بۆ خۆی بەشێک لە مێژووی کورد دووپات ئەکاتەوە کە لە فەرهەنگەکە ئاماژەم پیٚ کردووە کە ریشە لە ئەویستا و پەهڵەویی هەس.

ب) وشەکانی ئەم ناوچەیە مەفهووم و مەنتقی هەیە جگە لەوەش هەستی کوردایەتی لە پشتیدا هەشارە. واتە خۆڕسک نییە دیارە دەسپەروەردی بیر و راییکی کوردانەیە وەک:

ئازا: «ئا، ئانە، ئەنە، ئەن= پێشگری نەبوون و نەفیە+ زا = زام» واتە ئەو شتەی کە بیٚ نەخسە

زاما: «زا = زام+ ئا = ئاویشتن» ئەو کەسە کە زام ئەخاتە کەسەک کە وشەی «زەماوەن» لەوە وەرگێڕ بووە

قۆڕشقە: «قۆڕ = قۆڕگ+ رشقە، رژنگە» واتە ئەو چشتە کە خواردەمەنی بە قۆڕگ دەڕژێنیٚ

کەڵکان: «کەڵ = کڵ+ کان= شوێن» ئەو شوێنە کە کڵی لیٚ بدەن

لێوە: «لێو = لوْنیٚ+ وە= ون بوون» ئەو کەسە کە ئازایەتی و لونی لیٚ ون بووە

هۆرە: «هۆر = بیر+ رە= راچوو» ئەو کەسە کە بیری لە سەر راچووە

پ) زۆر وشە هەسمان کە بە راستی پێویستە لە دەسنووسەکان و رۆژنامەکان بە کاریان بێنین کە نووسراوەکە رازاوەتر و کوردیتر ئەکاتەوە کە لە زاراوەکانی تری کوردی نییە وەک:

بەریەزمە: واتە «تحریم، تحریم اقتصادی. یەزمە یان زمنەت بە مانای تفاقە و بەر لێرە بە مانای بەرگیریە»

خەسپەن: واتە «وظیفە» کە وابزانم لە کرمانجی «خەپتەن»ی پیٚ ئەڵێن. «ئەرکی سەرشان» ئامێتگەڵیکی دەسکارە کە هەر چەندەکە ئێستە جێگیر بووە بەلاّم هەرچیٚ نەبێت دەسکارە .

خوەیٚ رەوز یان خوەیٚ رەوش : واتە «خود ساختە» ئەو کەسە کە لە سەر خۆی چۆزەڕەداوە

خوەیٚ رەوزی یان خوەیٚ رەوشی: واتە «اعتماد بەنفس» کە بریتیە لە «خوەیٚ = خۆد+ رەوز = چوزەڕە» واتە ئەو کەسە کە لە سەر خۆیدا پەروەردە بووە و پاڵپشتی خۆیە

دزکوشیە: واتە «نقطە ضعف» کە لە زاراوەکانیتری کوردی شتێکم نەدیوە

خوەڵسی: واتە «متانت»

کش و ورد: واتە «مانور کردن»

قەسیلهەڕشانن: واتە «اغوا و تطمیع کردن، چراغ سبز نشان دادن»

داڵغە: واتە«عذاب وجدان» «داڵ یان دڵ+ غە = غەم» سەرجەم واتە غەمی دڵ

رێز وگول: واتە «انعطاف پذیری»

فرمانکار: واته «فاعل» ئەو کەسە کە فەرمانی لێ دەدا

فرمانی: واته «مفعول» ئەو کەسە کە فەرمانبەرداره

نامشتێ: واته «غیر قابل اعتماد»

ت) بابەتیتر، بە کار هێنانی وشەی تایبەت بۆ یەک یان دوو شت. واتە ئێمە بۆ هەر چشتەک ناوی تایبەتیمان هەیە کە چۆنیەتی، ویەردە یا ئێستە، نێر یان مێ بۆمان روون ئەبێتەوە کە ئەو تایبەتمەندیە لە عەرەبیشدا هەیە وەک:

زبوورد: واتە «مجرد» کوڕی ئازەو «ز = زە، زەم، زام+ بوورد = برد نەکردن» واتە کوڕێک کە تا ئێستە «بوورد» نەکردووە زێژێ ئەوە ئەبێتە «زگورد» واتە کچی ئازەو«ئەو کچە کە گورتینە یان گورتگەی زەدە نەبووە»

راێڵ: واتە چەپەری خۆش خەبەر «رایَ = را، چۆنیەتی+ دڵ» واتە رایَ دڵ ئەو چشتە کە بە دڵی کەسەک بێت زێژێ ئەبێتە «سائێڵ» واتە «سایَ = سارۆکی یان سیاتی+ دڵ» واتە چەپەریک کە خەبەری ناخۆش دێنێ .

قرانگسە: هەوساری تایبەت بە مانگا، مەرەس یان سیتە واتە «قلادە» بۆ سەگ، قەمتەر بۆ وشتر و رەژمە بۆ ئەسپ

ژ) بابەتیتر، هەڵسنگاندی وشەی باشوور لە گەڵ ئەویستا و پەهڵەوی و زاراوەکانی دراوسێ کورد لە ئێرانە کە بۆمان روون ئەکاتەوە کە وشەی ئەم مەڵبەندە تا چ رادەیەک لە سەر رەگەزی ئەویستایە. ساڵەهایە کە ئێمە دەڵێن: وشەی کوردی پاشماوەی زووانی ئەویستا و پەهڵەویە، بەڵام «کەس بە کوێر ناڵێ ماڵت لە کوێ دایە» ئەشێ خۆمان هەوڵ بدەین ئەوە بگەینینە حەقجییەی خۆی. خۆم گەلەک پێم خۆش بوو کە دیتم بەشێک لە وشەی کوردی باشوور هەر بەو فۆنووتیک و مانا لە ئەویستا و پەهڵەویدا هەس لە چاپی یەکمی «باشوور» چەندەها کەس کە وا دیار بوو وتارەکەیان لە رووی زانستی نەبوو رخنەیان گرت کە : فەرهەنگی وشە بۆ خۆی دێکوراسیوونی هەیە کە ئەشێ هەر چشتەک لە شوێنی خۆی بێت ئەتۆ ئەو رەواڵەتە پشۆکاو کردویتە جارێک ئەویستا و جارێک پەهڵەوی و لاتین و فەرانسە و.... ئەم کارە فەرهەنگەکە تووشی هەڵ ومەرج و ئاڵۆز وپشۆکایی کردووە. لە وەڵامی ئەو دۆستانە دەبێژم: بەرێز گیان بابەتەکانی گەلی کورد زۆر تووشی ئاڵ و گۆڕ و پشۆکایی بووە کە پێویستە تێڕوانینیکی نوێمان هەبێ و هەر چشتەک بگۆڕینینە سەر بنکەی خۆی و ناسنامەیەک بۆ درۆست بکرێت تا گەلانیتر دەسدریژی بە زووانەکەمان نەبەن. ئاخۆ گەلی کورد بزانن فلان وشەی کوردی لە سەر رەگەزی ئەویستایە وماناکەی وایە ولە زووانە کانیتر وایَ پێ ئەڵێن باشترە یان کوو هەر بە ماناکەی خۆمان قانێع بکەین؟ بە رایَ من هەڵسنگاندنی وشەکانی کوردی لە گەڵ ئەویستا ئەگەینێ کە وشەی کوردی وشەییکی بەتەمەن و بەمانایە و ئەتوانێ بەشی لە بیر چووی مێژووی کورد بۆمان روون بکاتەوە بەس پێویستە ئێمە ئاماژە بەوانە بکەین و ریشەیان بنووسین، تا خوێنەر تێبگاتەوە کە وشەییەک کە بە کار دێنێ کوردیە یان نە. بۆیە لە خوارو ئاماژە بە وشەگەلی کوردی دەکەین کە لە گەڵ ئەویستا و پەهڵەوی هاوسنگ و هاو مانایە. هیوادارم بە دڵتان بێت.

ئاخوڕ axwir̂ شوێنی خۆراکی ئاژەڵ، لە پەهلەوی (exwer ئەخوەر) و (exwerpetan ئەخوەرپتا ن) نووسراوە

ئار ar نەنگ، لە ئەوستا (erye ئەریە) بە مانایَ شرافەتە و ئەم وشەیە لەوە وەرگێڕ بووە

ئارام aram هێمن، لە ئەوستا (arem ئارەم) نوو سراوە

ئارۆنئاوا arün awa ئارین ئاوا، ناوی پێشووی شاری شائاباد، لە ئەوستا (arunyawa ئارو نیاوا) نووسراوە کە بەندیخانەی «سولوسونو» ناسیار بە «ئارون» بووە

ئارەزوو arezû دڵپەسەن، تاسە، دڵخواز، لە ئەوستا (azî ئازی) نووسراوە

ئارەش areş ناوێکە کوڕانە، لە ئەوستا (rexşe رەخشە) بە مانایَ تەوانا لە تیرئەنازی نووسراوە و لە ئەرمەنی «ئارشین» و« ئارسن» بە مانایَ مەرد و پەهلەوانە کە لەم ناوە دەرچووە و لە فەرانسەی (archer) بە مانایَ تیرئەنازە

ئازا aza نەترس، زاتدار، لە ئەوستا (azav ئازاوڤ) بە مانایَ چالاک و زرنگە

ئازاد azad رزگار، لە ئەوستا (azate ئازاتە) و لە فورسی باستان (adate ئاداتە) نووسراوە

ئازار azar ئێش و ژان، لە ئەوستا (azar ئازار) نووسراوە

ئازما azma ئەزما، لەئەوستا (ama ئاما) و (ma ما) و لە پەهلەوی (azmayşn ئازمایشن) نووسراوە

ئازەو azew کوڕی بێ ژن یا کچی بێ شۆ، لە ئەوستا (azerme ئازەرمە) بە مانایَ هەمیشە جووان نووسراوەو (azermidoxt ئازەرمیدوخت) واتە «ئا: پاشگری نەفی+ زەرم: پیری+ دوخت: کچ» واتە کچی هەمیشە جووان

ئاسان asan ساکار، هاسان، لە پەهلەوی ( asan ئاسان) نووسراوە

ئاسمان asman بەرزایی هەوا، ئاسمین، لە ئەوستا (emse ئەسمە) و (esmen ئەسمەن) نووسراوە، لە سەکزی «ئاسمو»ی دەڵێن

ئاسوو asû بەرزایی، بڵێنی، لە ئەوستا (uske ئوسکە) و (usna ئوسنا) بە مانایَ بڵێند و بڵێند پایە نووسراوە

ئاسووار asuwar پاک وگەورە «نائووسنانی مینانی چە سەڕتێخْ دۆ دەمم بەسا نە کەمەڕ– نە سینەم مەکنیوو خۆڵاسەیَ گەوهەڕ زاتْ ئاسوارنان نامەشەن حەێدەر» لە ئەهوورا وەرگێڕ بووە، لە وشەی سانسکریت (asura ئاسورا) و (asure ئاسورە) بە مانایَ رووحانی و پاک لە ریشەیَ ئەهوورایە

ئاسیاو asyaw شوێنی هەڕینی ئارد، لە پەهلەوی (asyap ئاسیاپ) و (asyaw ئاسیاو) نووسراوە و لە سەکزی «ئاس» پێ دەڵێن

ئاشت aşt خس، خست، پشان، لە ئەوستا (aşte ئاشتە) نووسراوە و لە هەورامی «هاشتن»ی پێ دەڵێن

ئاشکرا aşkira پەیدا، لە ئەوستا (eşkerê ئەشکە رێ) و (eşkere ئەشکەرە) نووسراوە

ئافتاوە aftawe ئەفتاوە، لە ئەوستا (efente ئە فەنتە) نووسراوە

ئافەرین aferîn ئافەرم، لە پەهلەوی (afrivene ئافریڤەنە) نووسراوە

ئاگا aga زانا، بەفێر، لە ئەوستا (akase ئاکاسە) نووسراوە

ئاگر agir ئاتەر، لە ئەوستا (ater ئاتەر) و (aters

ئاتەرس) و لە پەهڵەوی (atur ئاتور) و (atexş
ئاتەخش) و لە فورسی باستان «ئاترو» و لە عبری (aeyr ئاێر) نووسراوە
ئاگە age تەمەڵ، لە ئەوستا (ake ئاکە) بە مانایۍ نەخس و کەلەمە نووسراوە
ئاڵووز aĺûz خەم و پەژارە، لە ئەوستا (a-yuz ئایووز) نووسراوە
ئامای amay هاتی، لە پەهڵەوی (meten مەتەن) نووسراوە و لە زاراوەی لەکی«مام»پێ دەڵێن
ئامختە amixte هووکارە، فێربوو، لە ئەوستا ( mirite مـْرْتە) نووسراوە و لە سەکزی«موختە» و لە کرمانی«ئوموختە» پێ دەڵێن
ئامینە amîne ئامنە، ناوێکی ژنانەیە، لە ئەوستا (hgnenema ئامەننگهـ) بە مانایۍ نیرووۍ بیر کردنەوە و ئەندیشە نووسراوە
ئاو aw ئاوی خواردەمەنی، لە ئەوستا (ape ئاپە) و لە پەهڵەوی (ap ئاپ) و لە سمنانی (ow ئو) نووسراوە
ئاواز awaz دەنگ، لە پەهڵەوی (awaz ئاواز) و (îvaç ئیڤاچ) نووسراوە لە هەورامی وکەڵهوڕی «واچ، واچە»ی پێ دەڵێن
ئاوخوەری aw xwerî هەرچێ کە ئاو پێوە بخۆن، لە پەهڵەوی (xwerneawe ئاوەخوەرنە) نووسراوە
ئاودار awdar وڵاتی پڕلە ئاو، لە ئەوستا ( fre-ape فرەئاپە) نووسراوە
ئاوریشـْم awrîşim خاو، هەوریشـْم، لە پەهڵەوی (eprîşum ئەپریشوم) نووسراوە و لە سەکزی « ئەبرشوم»ی پێ دەڵێن
ئاوش awş باوش، هاوش، لە ئەوستا (awşe ئاوشە ) نووسراوە
ئاوکەن aw ken ئاودڕ، لە ئەوستا (evekene ئەڤە
کەنە) نووسراوە
ئاهڕان ahiȓan گوندێگە لە مەلبەندی «هلێران» کە بە زاراوەی لەکی ئاوخاتن دەکەن و هەروەها کێویکە لەم مەڵبەندە کە لە ئەوستا (ahuran ئا هووران) نووسراوە
ئسا ısa کارامە، ئۆسا، لە پەهڵەوی (ostat ئوستات ) نووسراوە
ئشکەفت ışkeft ئەشکەفت، لە ئەوستا (eşkete ئیشکەتە) نووسراوە
ئمڕوو ımȓû ئیمڕووژ، لە پەهڵەوی (emroch ئمروچ) نووسراوە و لە سمنانی (earu ئاروو)ی پێ دەڵێن و لە هەورامانیش هەر «ئارو» دەبێژن
ئمێد ımêd ئۆمێد، هۆمێد، لە پەهڵەوی (umet ئومێت) و (ımêt ئمێت) نووسراوە
ئۆُخرا ûxûira بەخێر بچیت، لە ئەوستا (ûx́r ئوغر) نووسراوە
ئۆُخەیش ûxeîş ئووخەی، لە ئەوستا (axşte ئا خشتە) و (beuxşne بەئوخشنە) بەمانایۍ ئارام و دوستانە نووسراوە
ئۆشم üşim ئەمن دەڵێم، لە ئەوستا (eşim ئەشم) نووسراوە
ئەخراج exrac ئەقراژ، ئەخراژ، رازاننەوەی کەل و پەل، لە ئەوستا (ex́rîe ئەغریە) نووسراوە
ئەڕا eȓa ئڕا، بۆ، لە ئەوستا (er ئەر) و (erda ئەردا) نووسراوە
ئەردەشێر erdeşêr ناوێکیکوڕانە بە مانایۍ شێری رووی زەوی«ئەرد: هەرد + شێر» لە ئەوستا ( ertexşetere ئەرتەخشەترە) بە مانای پاتشایۍ درۆستکار و (xişeyter خشەیتەر) بە مانایۍ پاشا نووسراوە، هەروەها لە ئەوستا (erye ئەریە) بە مانایۍ شرافەتە

ئەرزیز erzîz قەلع، لە پەهلەوی (arçîç ئارچیچ ) و لە ئەرمەنی ئارچیچ ولە سەکزی ئاجیچ دەڵێن

ئەرغە erẋe ئەرخە، لە سەکزی ئەرغە دەڵێن و لە ئەوستا (arqent ئارغەنت) رازایکی بۆ جەهەنەمە

ئەروا erwa رووح، لە ئەوستا (ûrwen ئوروەن) نووسراوە

ئەریە erîe باشەرەف، شەرەف، نەنگ، لە ئەوستا ( erîe ئەریە) بە ماناێ شرافەتە

ئەزما ezma سەنگین و سووک کردن، ئەزموون، لە ئەوستا (ama ئاما) و (ma ما) ولە پەهلەوی ( azmayşn ئازمایشن) نووسراوە

ئەژدەها ejdeha هەیژدەها، ماری هەرە گەورە، لە ئەوستا (ajhî ئاژهی) نووسراوە

ئەسپ esp نێرینەی ماین، لە اوستا (espe ئەسپە) و لە پەهلەوی (esp ئەسپ) و لە ئاشووری (ousp ئوسپ) نووسراوە

ئەسپێ espê سفێد، لە ئەوستا (speŷtini سپە ئێتێنێ) و (spête سپێتە) و لە پەهلەوی (sipêt سپێت) نووسراوە

ئەسر esr فرمێسک، لە ئەوستا (esrû ئەسروو) و (esrou ئەسرئو)و (eşen ئەشەن) ولە پەهلەوی (ers ئەرس) نووسراوە و لە سمنانی (esre ئەسرە) و لە عبری (ers ئەرس) دەڵێن

ئەفتاوە eftawe ئەفتووە، لە ئەوستا (efente ئەفە نتە) نووسراوە و لە مازندرانی (eftow ئەفتوو) دەڵێن

ئەمروو emrû هەمروو، لە ئازەری (armût ئارمووت ) و لە ئاستارایی (ermût ئەرمووت) و لە فەسایی (xumrûd خومروود) و لە کرمانی (armûk ئارمووک) و لە ئارامی (kumtra کومترا) و لە ئەرەوی (کمثرا) لە زەردەشتی (midve مدڤە) لە پەهلەوی (emrot ئەمرۆت) و (enbrot ئەنبرۆت) نووسراوە

ئەنازە enaze ئەقد، لە پەهلەوی (endaçek ئەندا چەک) نووسراوە

ئەنام enam هەندام، ئەندام، لە ئەوستا (hendame هەندامە) نووسراوە

ئەندیشە endîşe بیر، بیر کردنەوە، لە پەهلەوی ( hendêşişn هەندیشیشن) نووسراوە

ئەنگەمە enĝeme گیر و گرفت، لە ئەوستا (eng ئەنگ) بە ماناێ چەم و خەم لە کارە

ئەنەزا eneza هەنەزا، منداڵی هەو، لە ئەوستا ( enezante ئەنەزانتە) بە ماناێ پەیدا نەبوون لە دایکە کە نازناوی ئەهوورا مەزدایە

ئەور ewr هەور، لە ئەوستا (ewre ئەورە) و (ewra ئەورا) لە پەهلەوی (ewr ئەور) نووسراوە

ئیچە îçe ئێرە، لە ئەوستا (ince ئینجە) نووسراوە

ئیسە îse ئیسا، لە سمنانی (îse ئیسە) و لە ئازەری (îse ئیسە) و لە کرمانی (îsa ئیسا) و (îsayî ئیسایی) و لە خارکی (îsa ئیسا) و لە لوڕی (îse ئیسە) و لە بۆێرئەحمەدی (îso ئیسۆ) و لە هەورامی (îse ئیسە) و لە گیلەکی (hisa هسا) و لە گورگانی (ısa ئسا) و لە تەبەری (ısa ئسا) و لە بهبەهانی (îse ئیسە) و لە ئاشتیانی (ıas ئسا) و لە ئامرەیی (ısa ئسا) نووسراوە

ئێش ıês ژان، لە ئەوستا (êşe ئێشە) و (tbeŷşe تبەئێشە) نووسراوە

ئیما îma ئیمە، لە ئەوستا (îmaw ئیماو) و لە پەهلەوی (îma ئیما) نووسراوە

ئیمە îme ئێمە، لە پەهلەوی (îma ئیما) و (emah ئەماهـ) نووسراوە

ئێوارە êware تاریکان، خۆرئاوا، لە پەهلەوی (

êwarek ئێوارک) نووسراوە و لە کرمانی ئێوار و لە سەکزی ئیرە بە مانایٚ دێرە

باختن baxtin دۆڕاندن لە گەمە، لە پەهڵەوی ( waxten واختەن) نووسراوە

باربۆد barbod ژەنیاری سەردەمی خەسرەو پەروێز، لە ئەوستا (pehÎbed پەهڵبەد) نووسراوە

بارجامە barcame پریازگ، بۆخچە، لە پەهڵەوی ( baryamek بارِیامەک) نووسراوە

باڵا baÎa بەژن، لە پەهڵەوی (beşn بەشن) نووسراوە

بانوو banû خاتوون، لە پەهڵەوی (banuk بانووک) نووسراوە

باوەڕ bawer̂ قەبووڵ کردن، لە پەهڵەوی (wawer واوەڕ) نووسراوە

برجەبرج bircebirc برجیان، بریجە، لە ئەوستا ( berecaye بەرەجایە) و (beric بەرْج) نووسراوە

برنج birinc تۆمی مەڕەزە، لە پەهڵەوی (birênc برێنج) و (birêcye برێجیە) و لە گیلەکی (bec بەج) و (bûc بوج) نووسراوە

برۆ birü برۆیە، برم، برو، لە ئەوستا (breve برەڤە) و (birevet برەڤەت) و لە لاتین (brow)ی پێ دەڵێن

بزْن bizin بز، لە پەهڵەوی (buz بووز) نووسراوە و لە کرمانی بوزگیسە پێ دەڵێن

بزواق bizwaq گیایەکی وەک کەنگرە کە جارز و وڵەیشی پێ دەڵێن ساقەکەی وەک چوو پەمەیە و هەر وەها بە مانایٚ وشک وسفت، لە ئەوستا ( bizvent بزڤەنت) بە مانایٚ سفت وسەختە

بژار bijar وژار، وژین، لە ئەوستا (becîne بەجینە) نووسراوە

بڵووزە biÎûze بەلیسە، گڕی ئاگر، لە ئەوستا ( biraze برازە) نووسراوە

بنکە binke بنگە، لێژنە، لە پەهڵەوی (bunek بونەک) نووسراوە

بنە bine ریشە، لە پەهڵەوی (bûn بوون) نووسراوە

بنیات binyat بنکە، لە پەهڵەوی (bûndat بووندات ) نووسراوە

بۆ bü دژی نەبوون، لە ئەوستا (bu بۆ) و لە سمنانی (bood بوود) نووسراوە

بوور bûr رەنگی بوور، لە ئەوستا (bevre بەڤرە) و لە پەهڵەوی (bûr بوور) نووسراوە

بەچکە beçke بەچگە، بەچە، لە پەهڵەوی ( bechek بەچەک) نووسراوە

بەخت bext رەژەن، شانس، لە ئەوستا (bexte بەختە) و (bexş بەخش) و لە پەهڵەوی (bext بەخت) نووسراوە

بەخشان bexşan بەخشین، رابۆردن، لە پەهڵەوی ( bexşeiti بەخشەئیتی) نووسراوە

بەزە beze بەزەیی، لە پەهڵەوی (beçek بەچەک) و (bezek بەزەک) و (bezeg بەزەگ) نووسراوە

بەر ber میوە، لە پەهڵەوی (ber بەر) نووسراوە و هەروەها پاشگرە بە مانایٚ هێنەر«ئاوبەر، دڵبەر» لە ئەوستا (ber بەر) و (bero بەرئو) نووسراوە

بەرجەوەن bercewen بەرژەوەند، لە ئەوستا ( verîçevent ڤەریچەڤەنت) و لە پەهڵەوی ( verçavend ڤەرچاڤەند) و (vercavend ڤەرجا ڤەند) نووسراوە و لە زمانی فارسی (وەرجاوەند) نووسراوە

بەرز berz بڵێن، بڵێنای، لە ئەوستا (bereze بەرزە ) و (beric بەرْج) و (beriz بەرْز) و (beriza بەرْزا) و (berzenge بەرزەنگە) نووسراوە و کێفی ئەڵبۆرز (horebereze هۆرەبەرزە) و (here bereze هەرەبەرزە) نووسراوە و لە پەهڵەوی

burzak) بورژاک) و له لاتین (burg) هەر بە مانایَ بلَێنایَ کیفه

بەرِۆ berûi وەرِۆ، بەرِۆ، بەلۆ، له پەهلَەوی (belut بەلوت) نووسراوه

بەرەندە berende پاشگری هینانەوەیە، له ئەوستا (berent بەرەنت) نووسراوه

بەس bes بەسه، شتیَ ترم ناوی، له ئەوستا (ves ڤەس) له پەهلَەوی (ves ڤەس) له هەخامەنشی ڤەسییه نووسراوه

بەش beş بەخش، سەهم، له ئەوستا (bej بەژ) له پەهلَەوی (bexş بەخش) نووسراوه

بەگ beg گەورا، گەورایَ ئێلَ، له ئەوستا (bege بەگە) نووسراوه وله لاتین (big) وله دەسنووسه کانی هەخامەنشی (bex́ بەغ) بە مانایَ خودایه و لەئەوستا (bex́udate بەغوداتە) بە مانایَ بەغداد و خودادادە و له پەهلَەوی (bex́ubext بەغوبه خت) بە مانایَ کامەران له بەخشایشی خودایه و له تۆرکی ئۆزبەگ، بەگتاش، بەیگم پیَ دەلَێن

بەن ben زەنجیر، بەندە، له ئەوستا (bende بەندە) و (dneb بەند) نووسراوه

بەنگ benĝ شادانه، له ئەوستا (bengh بەنگە) نووسراوه

بەنگا benĝa بەنگە، بەنێە، له ئەوستا (vengh ڤەنگهـ) بە مانایَ جیَگرتن، جیَکردن نووسراوه و بە مانای وەنگە: شوینی بەنگەیە

بەهەشت beheşt دژی جەهەنم، له ئەوستا (vehîşte ڤەهیشتە) و له پەهلَەوی (vehîşt ڤە هیشت) نووسراوه

بەهمەن behmen ناویکی کورِانەیە، له ئەوستا (men مەن) بە مانایَ ئەندیشەیە و بەهمەن بە مانایَ نیک ئەندیشه

بێگانە bêgane دەرەکی، خاواره، له پەهلَەوی (bêganek بێگانەک) و (bêganık بێگانیک) نووسراوه

بیَئازار bê azar ئارام، له ئەوستا (enazar ئەن ئازار) له پەهلَەوی (enazar ئەنئازار) نووسراوه، ئەن: پێشگری نەفییه

بێلَ bêl̂ پامەره، له پەهلَەوی (bêl̂ بێلَ) و (vîlek ڤیلەک) نووسراوه

بێوەر bêwer زامەتی زۆر و بێوەلیفەت، که له ئەوستا (beivere بەئڤەره) و (beiîverê بەئیڤە رێ) بە مانایَ دە هزار و له پەهلَەوی (epêbehr ئەپێبەهر) بە مانایَ بیَ مەنفەعەته

پاتشا patişa پادشا، له پەهلَەوی (patişa پاتشا) و (patexşa پاتەخشا) و (pa tîxşa پاتیخشا) نووسراوه

پاره pare پۆل و پاره، هەم له ئەوستاو هەم له پەهلَەوی (pare پاره) بە مانایَ وام، قەرت و بەرتیل نووسراوه

پازن pazin کەلَی کێفی، له پەهلَەوی (paçin پاچن) نووسراوه

پاسەوان pasewan پاسەبان، له پەهلَەوی (paspan پاسپان) و (pazguspan پازگوسپان) و (pazgispan پازگسپان) نووسراوه

پاشنە paşne پاژنه، له پەهلَەوی وئەوستا (paşne پاشنە) نووسراوه

پاک pak خاوێن، پاقژ، پاکژ، له پەهلَەوی (paw پاو) نووسراوه

پالۆ palü پەراسۆ، له پەهلَەوی (pehluk پەهلوک) نووسراوه

پانزە panze پازده، ژمارەی پازده، له پەهلَەوی (panzdeh پانزده) نووسراوه

پایز paîz پائیز، وەرزی پاییز، لە پەهڵەوی (patiz پاتـْز) نووسراوە

پایە paŷe پلە و پایە، لە پەهڵەوی (padek پادەک ) نووسراوە

پرز pirz زهاک، زرنگ، لە ئەوستا (speriz سپەرْز) نووسراوە

پرسین pirsîn پرسیار، لە پەهڵەوی (peresse پەرەسە) نووسراوە

پرشنگ pirşinĝ مرۆڤی شەڕ خڕ، لە ئەوستا ( peşen پەشەن) نووسراوە کە بە ماناێ شەڕ خوازە، رەنگە «پەشەنگ» کە ناویکی کوڕانەیە لەم وشەیە وەرگێڕ بووە هەروەها بە مانای پرشنگی ئاوە کە لە ئەوستا (perşuye پەرشویە ) و (periş پەرْش) نووسراوە، وشەی پرشنگ بە مانای تاوی خۆرە کە لە پەهڵەوی (pêrok پێروک ) نووسراوە

پشت pişt پێشت، کووڵ، لە پەهڵەوی (pûşt پوشت ) نووسراوە

پشتی piştî کووڵەپشتی، لە پەهڵەوی (poştek پوشتەک) نووسراوە

پووپ pûp پووپی باڵەندە، لە پەهڵەوی (kofek کوفەک) نووسراوە

پۆتار pütar پوترکاو، لە ئەوستا (pûtê پووتێ) بە ماناێ گەنیاێ وپۆتارە، لە سەکزی «پوتک» پێ دەڵێن

پووڕ pûr̂ کوڕ، لە پەهڵەوی (pornaî پورنای) و ( pos پۆس) نووسراوە

پووز pûz لۆت، لە پەهڵەوی (poz پۆز) و (pozek پۆزەک) نووسراوە و لە سەکزی «پوز»ی پێ دەڵێن

پووس pûs کەوڵ، لە پەهڵەوی (postin پۆستن) نووسراوە

پووشانن pûşanin لە بەر کردنەوە، لە پەهڵەوی ( puşîten پوشیتەن) نووسراوە

پووڵا pûĺa جووری ئاسنە، لە پەهڵەوی (pûĺat پووڵات) و (pûĺavt پووڵاڤت) و لە سمنانی ( پووڵا) نووسراوە

پەتێارە petêare پێتی، پەتەری، لە ئەوستا ( peitîare پەئیتیارە) و لە پەهڵەوی (peitiîere پەئیتیيەرە) و (pitîarek پتیارەک) نووسراوە

پەخشە pexşe مێشولە، پێشی، پێشکە، تۆفانە، لە ئەوستا (mexşê مەخشێ) نووسراوە

پەڕ per̂ لا، کەنار، تەنێشت، لە ئەوستا (pero پەرئو ) نووسراوە

پەراسۆ perasü پراسو، لە ئەوستا (pirisû پرْسوو) و (peraswa پەراسوا) نووسراوە

پەڕاو per̂aw کێفیکی هەرەبەرزە لە کرماشان، لە ئەوستا (fireape فرەئاپەیە) نووسراوە

پەرنگە pernĝe رێگەی دەرچوون لە ناوی ئاودا، لە پەهڵەوی (perine پەرنە) و (pere پەرە) نووسر اوە

پەری perî فریشتە، لە ئەوستا (perîka پەریکا) نووسراوە

پەس pes پەز، لە ئەوستا (pesû پەسوو) و ( pesûk پەسووک) و (pezû پەزوو) نووسراوە

پەسا pesa هیشتا، لە پەهڵەوی (pesçe پەسچە) نووسراوە

پەسەن pesen دڵخواز، لە پەهڵەوی (pesend پەسەند) نووسراوە

پەسۆ pesü جز، سوچ، لە پەهڵەوی (piskm پسکم ) و (pişkim پشکم) و (piçkm پچکم) بە ماناێ سووچی بێ دەر وپەنجەرەیە لە ئەوستا (eşkep

**ئەمشەو** emşew ئمشەو، لە سمنانی (emşew ئە مشەو) ئۆشن ف امشب، درسمنانی (emşew امشو) گویند

**ئەمشێر** emşêr هەمشێر، چۆ شێر تێار بۆن ئەڕای کارێگ ف مانند شیر آماده شدن برای انجام کاری، داوطلبانه کاری را انجام دادن، کاندید، داوطلب

**ئەمشێربۆن** emşêr bûn هەمشێر بۆن، خوازیاری و تێار بۆن ئڕای کارێگ ف داوطلب شدن برای امری، کاندید شدن

**ئەمڵە** emĺe ١) کووچ وکووچبار «ئەمڵە داسە بار دۆیا خێڵانە ـ قوو قوو باێەقوش دەیشتْ گیەلانە» ٢) ناو ژۆنەیٚ گیەلان ٣) ئووردی ٤) دیەکەێگە لە چەرداوڵ ف ١) کوچ دسته جمعی ٢) نام قدیم گیلانغرب ٣) اردوگاه ٤) روستایی در چرداول

**ئەمن** emn هێمن، بێخووف ف امن

**ئەمەخان** emexan سووکە ناو ئەحمەدخان ف مخفف احمد خان

**ئەمەڵ قەمەڵ** emeĺ qemeĺ سەمەڵ یەمەڵ ف کار و کردار زشت و عجیب

**ئەمەیٚ قولی** emeŷ qwilî ١) ناوێگە کوڕانە ٢) دیەکەێگە لە چەرداوڕ ف ١) مخفف احمدقلی ٢) روستایی در چرداول

**ئەمیچ** emîç ١) ئەویش «گ» ٢) ئەیەش ف ١) او هم ٢) اینهم

**ئەمیچە** emîçe ئەوێش «گ» ف اوهم

**ئەمیر** emîr ١) فەرماندەر ٢) ناوێگە کوڕانە ف ١) امیر فرمانده ٢) نامی مردانه

**ئەمیرئاوا** emîr awa ١) دیەکەێگە لە ئارۆن ئاوا، ناو ژۆنەیٚ سراو قولی بۆیە ٢) دیەکەێگە لە ئیلام ٣) دیەکەێگە لە کرماشان ف ١) روستایی در اسلام آباد ٢) روستایی در ایلام ٣) روستایی در کرماشان

**ئەمیربەگ** emîrbeg دیەکەێگە لە جووانڕو ف نام روستایی در جوانرود

**ئەمیش** emîş بنووڕە ئەمیچ ف نگا **ئەمیچ**

**ئەمینئاوا** emîn awa دیەکەێگە لە ناودەرۆن ف روستایی در ناودَروَن

**ئەنار** enar هەنار ف انار

**ئەنارْک** enarik دیەکەێگە لە هووزمانەوەن لەکی قسیە کەن ف روستایی در هوزمانان با گویش لکی

**ئەناروو** enarû کوڵمْک «ل» ف برجستگی سر استخوان ران

**ئەناروون** enarûn ئەنارەک «ل»، ئەناروو ف نگا **ئەناروو**

**ئەنارە** enare ئەناروو «ل» ف نگا **ئەناروو**

**ئەنارەک** enarek ١) کوڵمْک «ل» ٢) دیەکەێگە لە چەوارْ ئیلام ف ١) برجستگی سر استخوان ران ٢) روستایی در چوار ایلام

**ئەناز** enaz ١) هەناز، رزار «لەیٚ ئەنازەو بچوو» ٢) داخراو «ژێر ئەناز» ٣) پاشگرە وە مانایٚ بخەر «تیر ئەناز» ف ١) موازی با... ٢) پهن شده ٣) پسوند به معنی انداز

**ئەنازکر** enazikr وە تەمامی، وە کولی «ئەنازکرێان هاتن» ف به کلی، تمامی

**ئەنازە** enaze ١) ئەقد، لە پەهڵەوی (endaçek ئەنداچەک) ئۆسریاس ٢) نیشانە گرتن ف ١) اندازه، در پهلوی (keçadne انداچک) نوشته شده ٢) هدفگیری

**ئەنازە گرتن** enaze girtin ١) ئەقدْ چشتیٚ گرتن ٢) نیشانە گرتن ف ١) اندازه چیزی را گرفتن ٢) هدف گیری کردن

**ئەنام** enam ١) هەندام، لە ئەوستا (hendame هەندامە) ئۆسریاس و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «هەندام» ئۆشن ٢) پاداشت، دەسخوەشانە ف ١) اندام، در اوستا (hendame هندام) نوشته شده، در دیگر گویشهای کردی «هەندام» گویند ٢) انعام

**ئەناو** enaw ١) هەناو، لە ئەوستا (hendû هەندو) و لە پەهڵەوی (hendûten هەندووتەن) و لە کرمانجی (henûn هەنوون) ئۆشن ٢) ئەنوود ف ١) تسطیح واندودن سطح داخلی اتاق، در اوستا (hendûten هَندوو) و در پهلوی (hendûten هَندو وتَن) و در کردی کرمانجی (henûn هَنوون) گویند ٢) اندود کردن پشت بام

**ئەنتریک** entirîk بنووڕە ئانتریک ف نگا **ئانتریک**

**ئەنتووفە** en tûfe تووفە ف تحفه ناقابل

**ئەنتەر** enter جووریٚ مەیمۆنە ف عنتر

**ئەنتیک** entîk کارامە، وە دەرد بخوەر ف بدرد بخور، مناسب

**ئەنتیکە** entîke نێاتە، نایٚفت، لە کرمانی «ئەنتیکە» ئۆشن ف عتیقه، در کرمانی «انتیکه» گویند

**ئەنتیکەخانە** entîke xane جائێگ کْ جسنْ قەدیمە لە تیٚ

ئەڵگرن ف موزه

**ئەنیکەفرووش** entîke firûş جسنْ قەیمە فرووش ف عتیقه فروش

**ئەنتیکەناس** entîke nas سەر بشەو لە جسنْ قەیمە ف عتیقه شناس

**ئەنج ئەولاْ** encewʕa ئەباو ئەژداد «ل» ف جد وآبا

**ئەنجام** encam دۆیاخر، ئاقوەت ف انجام، سرانجام

**ئەنجاخ** encax وەو شەرت، ئەگەر ف اگر، چنانچه

**ئەنجاوەروو** encawerû دیەکەێگە لە قڵاشاین ف روستایی در قلعه شاهین

**ئەنجز** enciz ئەنجام، ئاقوەت «ل» ف سرانجام

**ئەنجن** encin ١) هەنجنین، ورد کردن ٢) دەسوور وە هەنجانن ف ١) انجیدن ٢) امر به انجیدن

**ئەنجنئەنجن** encin encin ورد کردن ف انجیدن پیاپی

**ئەنجانن** encanin هەنجانن، لە سمنانی (ınce ئنجه) ئۆشن ف انجیدن، در سمنانی (ınce انجه) گویند

**ئەنجنیا** encinya هەنجنیا ف انجیده شده

**ئەنجنیاگ** encinyag هەنجنیاێ ف انجیده شده

**ئەنجنیان** encinyan هەنجنیان ف انجیده شدن

**ئەنجنیاێ** encinyaê هەنجنیاێ ف انجیده شده

**ئەنجووڵ** enûʕ ساچووڵ «ل» ف کلبه محقر

**ئەنجەڕ ومەنجەڕ** encer̂ û mencer̂ قەڵقورچ «ئە نجەڕ و مەنجەڕ جەڕێ وە لاشە ـ چووار گووش و دۆ دم هەیشت دەس و پاشە» ف کج، احول

**ئەنجەڵ** enceʕ هەنجەڵ، خرت و پرتْ ئاشپەزخانە ف وسایل زائد آشپز خانه

**ئەنجیر** encîr ١) هەنجیر، بەرْ دارێگە خواردەمەنی، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «تەوسکە» وە هەنجیرْ کۆیەی ئۆشن ٢) دیەکەێگە لە جووانرۆ ف ١) انجیر، در دیگر گویشهای کردی «تەوسکە» به انجیر کوهی گویند ٢) روستایی در جوانرود

**ئەنجیر بووسە** encîrbûse دیەکەێگە لە باوەجانی ف نام روستایی در ثلاث باباجانی

**ئەنجیرەناو** encîrenaw دیەکەێگە لە گوواوڕ ف روستایی در گواور

**ئەنجیرکْ** encîrik ١) دیەکەێگە لە هووزمانەوەن لەکی قسیە کەن ٢) دیەکەێگەلە هەرسین ف ١) روستایی در هوزمانان با گویش لکی ٢) روستایی در هرسین

**ئەنجیری** encîrî دیەکەێگە لە حەسەنئاوا ف نام روستایی در حسن آباد

**ئەنچسەک** ençisek ئەنچۆسەک ف لاغر وبینمود، ناتوان و بی‌نمود

**ئەنچۆسەک** ençosek ئەنچسەک ف نگا **ئەنچسەک**

**ئەنزەڵ** enzeʕ دیەکەێگە لە قڵاشاین ف روستایی در قلعه شاهین

**ئەنداز** endaz بنووڕە ئەناز ف نگا **ئەناز**

**ئەندازە** endaze بنووڕە ئەنازە ف نگا **ئەنازە**

**ئەندازەگر** endaze gir ١) ئەنازەگر، کەسێگ ک ئەنازەێ باڵا گرێد ٢) نیشانە گرتن ف ١) اندازه گیر، مساح ٢) تیر انداز، هدفگیر

**ئەندازەگرتن** endaze girtin بنووڕە ئەنازەگرتن ف نگا **ئەنازە گرتن**

**ئەندام** endam ئەنام، ئازای گیان ف اندام، نگا **ئەنام**

**ئەندیشە** endîşe ١) ئەنیش، لە پەهڵەوی (hendîşîşn هەندیشیشن) تۆسریاس ٢) خووف، ترس «چۆ وە دڵت هات وە بێ ئەندیشە ـ سوورەتْ شیرین تاشای وە تێشە» «خاناێ قۆبادی» ف ١) اندیشیدن، خوف، در پهلوی (hendîşîşn هندیشیشن) نوشته شده ٢) ترس و هراس

**ئەنقەس** enqes ئەنقەست، ئانقەس ف نگا **ئانقەس**

**ئەنقەڵ** enqeʕ ١) کڕانْ بار وە ڕۆ زەۆ لە ڕۆ نەتۆیەنسن ٢) کوتەڵکوو کردن «هەێ داد هەێ بێ داد ئەنقەڵم کردن ـ یاو لەڕ مەردم لە دەسم بردن» ف ١) باری را روی زمین غلتاندن و نتوان حمل کردن ٢) کتک کاری کردن

**ئەنقیرومەنقیر** enqîr̂ û menqîr̂ ئەنکیڕ و مەنکیڕ ف دو فرشته مامور پرسیدن در شب اول قبر

**ئەنکیرومەنکیر** enkîr̂ û menkîr̂ ئەنقیڕ ومەنقیڕ ف نگا **ئەنقیرومەنقیر**

**ئەنگ** enĝ پاشگرْ شناسینْ ئامراز «قوڵەنگ، تفەنگ» ف پسوند ابزاری

**ئەنگز** enĝiz دیەکەێگە لە کرماشان ف نام روستایی در کرماشان

**ئەنگڵ** enĝiʕ هەنگڵ ف زیر بغل

**ئەنگڵات** engʕat دارالتۆس «ل» ف آویزان

**ئەنگور** angûr هەنگۆر، لە سمنانی «ئنگیره» ئۆشن ف انگور، در سمنانی «انگیره» گویند

**ئەنگۆست** engost کلْگ «ل»، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «ئەنگوس» ئۆشن ف انگشت

**ئەنگەمە** engême گیچەڵ «کەفتمەسە یەێ ئەنگەمە ێگ نەۆش» لە ئەوستا (eng ئەنگ) وە ماناێ چەم و خەم لە کارە ف گیر و گرفت در کار، مخمسه، در اوستا (eng انگ) به معنی پیچاندن، خم کردن، چم خم کار آمده است

**ئەنگیر** engîr ئەنگۆر «ل» ف نگا **ئەنگۆر**

**ئەنۆ** enü ئێکە، دی «ئەنۆ چە بکەم؟ » ف پس

**ئەنوُ** enû لچەقوڵی، پەڵمەگیرە ف حالت گریه به خود گرفتن

**ئەنوا** enwa ١) لاناوە لەجاێ ستار گرتن ٢) دارای، ماڵ و مناڵ «ت چەنێ بێ ئەنوای- پەڕوو لە گیوە کەر تووای» ف ١) و ٢) کنایه از بینوا، نوا

**ئەنوُد** enûd بانئەنوود ف اندودن پشت بام با کاه گل، نگا **بان ئەنوود**

**ئەنوُد داین** enûd dayn بان ئەنوود داین ف اندودن پشت بام با کاەگل

**ئەنوُد کردن** enûd kirdin بان ئەنوود کردن ف اندودن پشت بام با کاەگل

**ئەنوُز** enûz لاناوە لە خەو، چرچ «ئەنووز لە بان چەوم نەچییە» ف کنایه از چرت، خواب اندک، قیلوله

**ئەنۆز** enoz ئەنووس «گ» ف نگا **ئەنوُس**

**ئەنۆچە** enü çe ئەێ چە ف پس چی

**ئەنوُس** enûs ١) ئاساش، ئاشاز، ئاساش ٢) چرچ، سەر خەو شکانن، لە لاتین (snooze) وە ماناێ چرچ دانە و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی نۆستن وە ماناێ خەفتنە ف ١) آسودگی ٢) چُرت، خواب اندک، در لاتین (snooze) به معنای چُرت است و دیگرگویشهای کردی «نۆستن» به معنی خواب است

**ئەنۆکی** enü kî ئەێ کی ف پس کی

**ئەنوُگرتن** enû girtin پەڵمەگیرە کردن ف حالت گریه به خود گرفتن

**ئەنە** ene١) هوو، هەو، دۆ ژن کْ یەێ شۆ بێاشتوون ٢) پاشگرْ نەفیە جوورْ «ئەنەخورد، ئەنەزا» کْ هەم لە ئەوستا و هەم لە پەهلەوی هاتێە و لە ئازەری (ane ئەنە) وە ماناێ «نە» هاتێە ٢) وەنە، وەگەرنە «حەێف کوڕ فڵانیدن ئەنە دیامە لێد» ف ١) هو ٢) پیشوند نفی، که هم در اوستا و هم در پهلوی آمده و در آذری (ane انه) به معنی نه است ٢) وگرنه، مگر نه

**ئەنەخورد** ene xwird هەنەخورد، دەژ، دەج «ئەنە، ئانە، ئانا، ئە» پێشگرەیلْ نەفییە لە ئەوستا ف نخورده شده که «ئەنە، ئانە، ئانا، ئە: پیشوند نفی در اوستا» هستند

**ئەنەزا** eneze هەنەزا، لە ئەوستا (enezante ئەنە زانتە) وە ماناێ پێا نەۆ لە داڵگە ک ناز ناو ئەهوورا مەزداسە و هاوتاێ «لم یلد و لم یولد» ف فرزند هو، فرزندی که از مادری دیگر است و در اوستا (enezente انزانته) به معنی زاده نشده نوشته شده که صفت اهورامزد است و همسان «لم یلد و لم یولد» آمده که در کردی هنوز این واژه گفته می‌شود

**ئەنەهوو** enehû ١) زوورْم ٢) ئەێنْ مەێن، وێنەێ «ئەنەهوو باوگێە» ف ١) بویژه ٢) مانند، چونان

**ئەنیش** enîşئەندیش، ئەندیشە، خووف «هەر شەو تەفتیش کەێ ئاتْ عێاڵدان ـ هۆچ ئەنیش نیەتێ لە خێاڵدان» ف بیم، خوف

**ئەو** ew ١) ئەۆ ٢) ئەوە ٣) وە، لە «ئەو کی کەێ؟ » ٤) ئاو ف ١) او، ضمیر اول شخص ٢) آن ٣) به ٤) آب

**ئەۆ** eü ئەو، فلانی ف او، ضمیر اول شخص

**ئەوار** ewar پاشگرْ بۆن «خوەنەوار، ئمێدەوار» ف پسوند مالکیت

**ئەوان** ewan ١) ئەوانەێ دۆر ٢) پاشگرْ پیەرێزەر«باخەوان » ٣) ئەیانە ف ١) آنها ٢) پسوند محافظ ٣) اینها

**ئەوانە** ewane ئەوان ف آنها

**ئەوانەێگْ** ewaneŷgi ئەوانەێ کْ ف آنهایی را که

**ئەوانەیل** ewaneyl ١) لاناوە لە جن و پری ٢) ئەوان ف ١) کنایه از جن و پری ٢) آنها

**ئەواوڵ** ewawiʃ ١) فره وڕای کردن ٢) گەنمێگ ک ئەڕاێ ئاسیاو کردن وە ناو دەفر کەن ف ١) پر چانگی، وراجی ٢) گندم را برای آسیاب کردن در ظرف مخصوص خود کردن

**ئەواوڵ کردن** ewawiʃ kirdin فره وڕای کردن و هەرچۆ پەرچۆ وەتن ف گزافەگویی کردن، بیهوده گویی

**ئەوپەڕ** ew per̂ خت، دۆر کردنْ سەگ ف کلمه راندن سگ

**ئەوج** ewc بەرزی، مووڵەق ف اوج

**ئەوجا** ewca لەوجا [ف] در آنجا

**ئەوجار** ewcar ئەوکەڕەت [ف] آن دفعه

**ئەوجارە** ewcare ئەوکەڕەتە [ف] آن دفعه

**ئەوجارەگە** ewcarege ئەو کەڕتەگە [ف] آن دفعه پیش

**ئەوجگە** ewcige بنووڕە ئەوچگە [ف] نگا **ئەوچگە**

**ئەوجی** ewcî لەجی، وەجی [ف] بجای…

**ئەوجی کردن** ewcî kirdin ۱) داکردن ۲) وە جی کردن [ف] ۱) خالی کردن مایعات ۲) در طویله کردن حیوانات

**ئەوچگە** ewçige ۱) تاتۆیەنی «ئەوچگە لە دەسْد تێ کووتای مەکە» ۲) هەرچێ «ئەوچگەداشتم لە دەسم چی» [ف] ۱) تا آنجا که میتوانی ۲) هر چه که بود و نبود

**ئەوچلە** ewçile بنووڕە ئەوچگە [ف] نگا **ئەوچگە**

**ئەودزە** ew dize کوسبڕەک «ل» [ف] آبدزدک

**ئەوخوەێ خڕین** ew xweŷ xirîn وە خوەێ خڕین، وە خوەێ بارکردن [ف] حرف یا عملی را به خود نسبت دادن

**ئەوخوەێ گرتن** ew xweŷ girtin ۱) وە خوەێ خڕین ۲) گرەوسیان، میيەێگ ک دۆیاێ وەرەن داین ئارەخا بوو [ف] ۱) حرفی را به خود نسبت دادن ۲) لقاء، میشی که جفتخواه شده و جفتگیری کرده و آبستن می‌شود

**ئەودەر** ew der ئەو دەیشت، وە دەر [ف] به بیرون، بیرون کردن

**ئەودەس** ew des ئەوکان [ف] آن طرف

**ئەودەیشت** ew deyşt وە دەیشت [ف] به بیرون انداختن

**ئەودیم** ew dîm لەو دیم، ئەو وتاق [ف] در آن اتاق، آن طرف

**ئەور** ewr هەور، لە ئەوستا (ewre ئەورە) و (ewra ئەورا) و لە پەهلەوی (ewr ئەور) تۆسریاس [ف] ابر، در اوستا (erwe اورە) و (ewra اورا) و در پهلوی (ewr اور) نوشته شده

**ئەورا** ewra ۱) ورسێ «گ» ۲) ئەورە [ف] ۱) گرسنه ۲) آنجا

**ئەوراز** ewraz وەزەن، بەرزایی [ف] بلندی، ارتفاع بلند کوه

**ئەورازە** ewraze دیەکەێگە لە جووانڕۆ [ف] نام روستایی در جوانرود

**ئەورائی** ewrayî ورسیەری «گ» [ف] گرسنگی

**ئەورامان** ewraman مەڵوەنْ هەورامان، ئەرامان [ف] منطقه اورامانات

**ئەوربردێ** ewr birdê هەور بردێ [ف] میوه و غله ابر زده، محصولی که در اثر تغییرات آب و هوایی از بین میرود

**ئەورْ تەڕ** ewri ter̂ ئەورْ واراندار [ف] ابر باران زا

**ئەوردا** ewrda ئەورە [ف] آنجا

**ئەوردانە** ewrdane ئەوردایلە [ف] همانجا

**ئەوردایلە** ewrdayle هەر ئەورە [ف] همانجا

**ئەورْ قوڵەکەر** ewri qwiĺe ker هەورْ واراندار [ف] ابر باران زا

**ئەورە** ewre ئەوردا [ف] آنجا

**ئەورەتریشقە** ewretirîşqe ئەورەتەرەقە، گرمْ هڕ [ف] آسمان غرنبه، رعد وبرق

**ئەورەتەرەقە** ewretereqe گرمْهڕ [ف] رعد و برق آسمان

**ئەورەویان** ewr̂ewyan رەویان [ف] پراکنده شدن در اثر…

**ئەورەی** ewrey خەڵکْ ئەورە، زایەندەێ ئەورە، زێزْ ئێرەی [ف] ساکن جایی غیر از اینجا، آنجایی، اشاره به جایی معرفه غیر از اینجا

**ئەورەیلە** ewreyle ئەورە، ئەوردا [ف] آنجا

**ئەورێ پاکڵاش نەمەنن** ew r̂ê pa kiĺaş nemenin هەڵەپڵە داشتن، تەنانەت وەختێگ ئەڕاێ هەڵکیشانْ کڵاش نیاشتن [ف] بسیار تعجیل داشتن به گونه‌ای که وختی برای پوشیدن «کلاش» باقی نگذاشتن

**ئەورێ شاتمان نەمەنن** ew r̂ê şatiman nemenin ئەوەێ ک فرە هەڵەپڵە کەێد وتەنانەت فرسەتْ وەتنْ « شهادتین» نەێرێد [ف] کسیکه بسیار عجول باشد را گویند به گونه‌ای که فرصتی برای گفتن شهادتین را هم ندارد

**ئەوریشْم** ewrîşim ئاوریشْم [ف] نگا **ئاوریشْم**

**ئەوزەڵ** ewzeĺ بنووڕە ئەوەزەڵ [ف] نگا **ئەوەزەڵ**

**ئەوزێنە** ewzêne تەرەختی کردن، هڕشت کردن [ف] رشد و نمو کردن، پیشرفت داشتن

**ئەوسا** ewsa وێەردە [ف] آن وقتها

**ئەوسار** ewsar هەوسار، لە سمنانی (owsar ئوسار) تۆسریاس [ف] افسار، در سمنانی (owsar اوسار) گویند

**ئەوساگە** ewsage وێەردەگە [ف] آن وقتها

**ئەوساڵ** ewsaĺ پارەکە [ف] آن سال، سال گذشته

**ئەوساڵە** ewsaĺe ساڵ ناسیاری [ف] آن سال اشاره به سال

«معرفه»

**ئەوساڵەگە** ewsaĺege ساڵێ کْ ناسیاره ف همان سال، اشاره بەسال «معرفه»

**ئەوساڵەیل** ewsaĺeyl ساڵەیلْ وێەردەف سالهای گذشته

**ئەوسەر** ewser لەو سەر، زێژْ ئیسەر ف آن قسمت، از آن سر

**ئەوشاریاێ** ew şaryaê بێ ناو نیشان ف گمنام

**ئەوقره** ewqire ئەوقەره، ئەقره ف آنقدر

**ئەوقە** ewqe ئەوقره، ئەقره «گ» ف آنقدر

**ئەوقەر** ewqer ئەوقره، ئەوقە ف آنقدر

**ئەوقەره** ewqere ئەوقە، ئەقره ف آنقدر

**ئەوکی** ew kî وەکی، لە کی ف به چه کسی

**ئەوگار** ewgar کز و سیس، لە سەکزی «ئەوگار» ئۆشن ف افگار، در سکزی نیز «اوگار» گویند

**ئەول** ewl وەل، با «ئەولْ منەو بەو» ف همراه با

**ئەوڵئەزیز** ewĺezîz سووکەناو عەبدوڵعەزیز هووره چڕ ناودارْ کورد ف مخفف عبدالعزیز هوره‌خوان نامدار کُرد

**ئەولا** ewla ۱) زێژْ ئیلا، لە لاتین (away) ئۆشن ۲) سوو کە ناوْ عەبدولله ف ۱) آن طرف، در لاتین (away) گویند ۲) مخفف عبدالله

**ئەولاتر** ew la tir ۱) دوٖرتر ۲) خاواره «فلاَنی ئەولاتر ێگە» ف ۱) آن‌طرف تر ۲) بیگانه، غیر خودی

**ئەولاد** ew lad ئەولاێ تْ ف آن‌طرف تو

**ئەوڵاد** ewĺad مناڵ ف اولاد، فرزند

**ئەولادان** ew ladan ئەولاێ ئۆیه ف آن‌طرف شما

**ئەوڵاق ئاوا** ewĺaqawa دیەکەێگە لە لوڕستان ف روستایی با گویش لکی از توابع لرستان

**ئەولام** ew lam ئەولاێ خوەم ف آن طرف خودم

**ئەولامان** ew laman ۱) ئەولاێ خوەمان ۲) لاناوه لە بنیاێ ماڵی «ئیمه هۆچ وە ئەولامان نیه» ف ۱) آن‌طرف ما ۲) کنایه از توان مالی

**ئەولاێ** ew laê ۱) ئەولاێ ئەو ۲) سووکه ناو ئەڤدللا ف ۱) آن طرف او ۲) مخفف عبدلله

**ئەولایان** ew laêan ئەولاێ ئەوان ف آن‌طرف آنها

**ئەولایه** ew laŷe ئەو دیمێه ف آن طرفش است

**ئەولْما** ewlima وەلْما ف با من

**ئەولْمان** ewliman وەلْمان ف با ما

**ئەولْمانا** ewlimana وەلْمانا ف با ما، همراه ما

**ئەولْمانەو** ewlimanew وەلْمانەو ف با ما

**ئەوڵە** ewĺe بنووڕە ئاوڵە ف نگا **ئاوڵە** وترکیباتش

**ئەوە** ewe یە، ئەیە، لە ئەوستا (eve ئەڤە) نۆسریا س و لە کوردی کرمانجی «ئەڤ» وە ماناێ «ئەوە» سە ف این، آن، همین، در اوستا (eve افه) نوشته شده و در کردی کرمانجی «اف» به همان معناست

**ئەوەجە** ewece هەوەجە ف نیاز

**ئەوەز** ewez ئاڵشت، ئەرەوییە ف عوض

**ئەوەزبێەڵ** ewez bŷeĺ ئاڵشتی، ئەرەوییە ف عوض و بدل کردن، عربی است

**ئەوەزەڵ** ewezeĺ زانا «گ» لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «ئاوەز» ئۆشن ف فهمیده

**ئەوەسانە** ewe sane ئەوەسێانە ف همان، همانها هستند، خودشانند

**ئەوەسە** ewe se ۱) خوەێە «ئەوەسە هات» ۲) قەیدْ چۆنیەتیە «ئەوەسە چی، ئەوەسە تێ» ف ۱) همان است ۲) قید حالت

**ئەوەسێانە** eweseâne ئەوەساز ە ف خودشان، همانها هستند، خودشانند

**ئەوەسێە** ewesŷe ئەوەسە ف همان است

**ئەوەکە** eweke ئەو یەکی ف آن دیگری

**ئەوەکەگە** ewekege ئەوەکیەگە ف آن دیگری

**ئەوەکی** ewekî ئەویەکی ف آن دیگری

**ئەوەکیەگە** ewekyege ئەویەکیەگە ف آن دیگری

**ئەوەگْ** ewegi ئەوەێگْ ف آنچه‌که...، هم او که....

**ئەوەڵ** eweĺ یەکم، یەکمین ف اول، اولین

**ئەوەڵ ئاشاریاێ** eweĺ aşaryaê ئەوشاریاێ ف گم نام

**ئەوەڵ بەریە** eweĺ berye وەرجلە یە ف اولاً، اول بر این، نخست آنکه...

**ئەوەڵپەڵە** eweĺ peĺe زێژْ پشت پەڵە ف اولین باران پاییزی

**ئەوەڵڤارە** eweĺvarê بنووڕە شاڵدۆرەکی «ل» ف نگا **شاڵدۆرەکی**

**ئەوەڵ کەڵەشێر** eweĺ keĺeşêr گوڵ سوو، بەیان ف

ابتدای سحر

**ئەوەڵ وێار** eweĺ wêar دیەکەێگە لە گیەڵان ف روستایی در گیلانغرب

**ئەوەێ** eweŷ بنووڕە ئەوەێگْ ف نگا **ئەوەێگْ**

**ئەوەێتر** eweŷ tir ئەوەکە ف آن دیگری

**ئەوەێترەک** eweŷtirek ئەوەکەگە ف آن دیگری

**ئەوەیش** eweyş ئەوێش ف اوهم

**ئەوەیشە** eweyşe ئەوەیش ف او هم

**ئەوەێگْ** eweŷgi ١) ئەوچگە ٢) چشتێ کْ ناسیارە « ئەوەێگْ تێ، برامە» ف ١) هر آنچە کە ٢) اشارە بە هر چیز معرفە

**ئەوێش** eüyş ئەوەیش ف اوهم

**ئەویش** ewiyş ئەوەیش ف اوهم

**ئەویەکە** ew yeke ئەوەکە ف آن دیگری

**ئەویەکەگە** ewyekege ئەوەکەگە ف آن دیگری

**ئەویەکی** ewyekî ئەوەکیەگە ف آن دیگری

**ئەویەکیەگە** ew yekyege ئەوەکیەگە ف آن دیگری

**ئەوهە** ewhe وەوحە، وشەێ گاوا دانْ مانگا ف کلمە ایست بە گاو

**ئەهـ** eh ئەح ف حرف بیزاری

**ئەها** eha ١) وشەێ ئاگادار کردن «ئەها هاها فلأنی هەوو» ٢) وشەێ حەسرەت خواردن «ئەها! شکا نمەێ» ٣) وشەێ سەر سڕمەنین «ئەها!! » ف ١) حرف آگاه کردن ٢) کلمە حسرت ٣) کلمەی تـصدیق وتعجب

**ئەهاو** ehaw بنووڕە ئەها ف نگا **ئەها**

**ئەهڵ** ehĺ ١) نیشتەجی ٢) خوازێار وخەریک «ئەهڵ حەق، ئەهڵ نماز» ٣) لاناوە لە ژنْ گەنەکار ف ١) مقیم ٢) مشغول بە... ٣) کنایە از زناهلبرنامە، فاحشە

**ئەهوو** ehû ئەێ هوو ف حرف بیزاری

**ئەهەک** ehek ١) ئاهەک ٢) وشەێ سەرسڕ مەنین «ئەهەک ماڵد برمێ ئەڕاێ درووەگەد» ف ١) آهک ٢) کلمەی شگفتی

**ئەی** ey ١) وڕاوە ئەوڵ خوەێ «ئەی بیلا بمرم» ٢) ئێکە دی «ئەی کەێ تیەی؟ » ٣) مان کردن «ئەی نەوەتم ئی کارە نەکە» ٤) وشەێ سەرسڕ مەنین «ئەی! کْ ناتیە» ٥) ئاخ و داخ «ئەیڕوو، ئەیماڵ وێرانم» ٦) نە «تۆیەنێ بچوود؟ ئەیئا» ٧) هەێ، وەێ «ئەی لەی بەدبەختییە» ف ١) حرف ندا ٢) پس ٣) حرف تحذیر ٤) حرف تعجب ٥) حرف تاثر ٦) نە، نتوانستن ٧) ای، آە

**ئەیئا** ey a ئانێدە ف قید حالت، نتوانستن

**ئەیان** eyan یانە ف اینها

**ئەیانە** eyane یانە ف اینها

**ئەێچە** eŷ çe ئەتۆچە ف پس چی

**ئەێچەمەر** eŷ çemer ئەیچێ ف وای براین بدبختی، کلمەای برای تعجب کردن

**ئەێچۆ** eŷ çü سەچۆ ف پس چگونە

**ئەیچێ** ey çê ئەیچەمەر ف وای بە این بدبختی، کلمەای برای تعجب کردن

**ئەێڕوو** eŷrû هەێڕوو«ئەێڕوو برام بمرێ» ف حرف ترسیدن خانمها

**ئەێشەرومەێشەر** eŷşer û meŷşer شینْ حەسەن و حسەێن ف محشر بە پا کردن

**ئەێ کی** eŷ kî ئەتۆکی ف پس کی

**ئەێن** eŷn ئەنەهوو ف مثل، مانند

**ئەێنْ مەێن** eŷni meŷn فیتْ میت، ئەنەهوو ف مثل، مانند

**ئەێنە** eŷne نە، نە لێوا ف نە، نەاینگونە

**ئەێوان** eŷwan ١) هەێوان، واین ٢) شارێگە لە ئیلام، ناوْ ڕۆنەێ «باخْ شا» بۆیە ٣) تاێرمە، وەرتاێرمە ف ١) امر بە فرار کردن ٢) شهری در ایلام کە نام قدیمش «باخ شاە» بودە، ایوانغرب ٣) ایوان

**ئەێوانیچڕ** eŷwanî çiȓ یەکێ لە بەزمەیڵ هوورە ف یکی از مقامات هورە

**ئەێ وەڕێ** eŷ weȓê دەسْد خوەش «تا دامە لێ مرد، ئەێ وەڕێ»ف دست خوش، ایوللە

**ئەێهوو** eŷhû هەێهوو ف حرف بیزاری و تنفر

**ئەیە** eye ١) هەریە ٢) ئەگەر یە «ئەیە تووای پۆل فێشترێ بێە» ف ١) این ٢) اگر این را ...

**ئەیەر** eyer ئەگەر، ئەر ف اگر

**ئەیەیش** eyeyş یەیشە ف این هم

**ئەیەیشە** eyeyşe ئەیەیش ف اینهم

**ئی** î یە، ئەیە «تْ وەێ قنگەو ئی قنگرە نیەکەنی» ف این

**ئێ** iê ئی ف این

**ئێارە** iêare کیلەمەن ف پیمانە

**ئی‌پا ئەوپا** î pa ewpa کەوشْ لنگەوەلنگ [ف] کفش چپ را به پای مخالف کردن

**ئی‌پائەوپاکردن** î pa ewpa kirdin دەس دەس کردن، ڕێ ڕێ کردن [ف] تاخیر و دودلی

**ئیجار** îcar ئی‌کەڕەت [ف] بار دیگر، این دفعه

**ئیجارە** îcare ئی‌کەڕتە [ف] این بار

**ئیجارەگە** îcarege ئی‌کەشەگە [ف] دفعه بعد

**ئیچش‌ئەلە** îçiş ele بنووڕە ئەلەشمەلەش [ف] نگا **ئەلەش مەلەش**

**ئیچە** îçe ئێرە «ل»، لە ئەوستا (ince ئینجە) نۆسریاس و لە فارسی ئینجا ئۆشن [ف] اینجا، در اوستا (ince اینجه) نوشته شده

**ئیدەس** îdes زێڕْ ئەودەس، ئیکان [ف] این‌طرف

**ئی‌دیم** îdîm زێڕْ ئەودیم [ف] این اتاق، این طرف

**ئێرا** ıêra ئێرە «گ» [ف] اینجا

**ئێرام** ıêram ١) ئۆرام، سووکە ناو ئبراهیم ٢) هامە ئێرە [ف] ١) مخفف ابراهیم ٢) اینجا هستم

**ئێرامە** ıêrame ئێرەمە «گ» [ف] این قسمت بدنم

**ئێران** ıêran ١) وڵاتێگە ٢) ناوێ ژنانە [ف] سرزمین ایران ٢) نامی زنانه

**ئێرانی** ıêranî کەسێ کْ لە ئێران ژیەێ [ف] ایرانی

**ئێردا** ıêrda ئێرە، لە تۆرکەمەنی «بوێەردا» ئۆشن [ف] اینجا ، در ترکمنی «بویردا» گویند

**ئێردانە** ıêrdane ئێرەیلە [ف] اینجا

**ئێردایلە** ıêrdayle ئێرەیلە [ف] اینجا

**ئێرنگە** ıêrnĝe ئێرەنگە [ف] حالا، الان

**ئێرە** ıêre ١) ئێرا ٢) ئیسە «ئێرە چە بکەیم» [ف] ١) اینجا ٢) الان، حالا

**ئێرەمە** ıêreme ئێرامە [ف] این قسمت بدنم

**ئێرەنگە** ıêrenĝe ئێرنگە [ف] حالا، الان

**ئێرەی** ıêrey خوەمانی«کوورەییگید؟ ئێرەی» [ف] اینجایی، خودمانی، اهل اینجا

**ئێرەیی** ıêreyî حەسۆدی «گ» [ف] حسادت

**ئێرەیلە** ıêreyle ئێرە [ف] اینجا

**ئیس** îs دەمێگ «ئیسێ تر تیەمەو» [ف] لحظـه‌ای، دمی

**ئیسا** îsa ١) ئیسە ٢) سووکە ناو عیسی ٣) ئێکە [ف] ١) الان، حالا ٢) مخفف عیسی ٣) سپس

**ئیساکْ** îsa ki ئێرە کْ [ف] حالا که...

**ئیساڵ** îsaĺ ساڵ بانان [ف] سال آینده

**ئیساڵە** îsaĺe ئمساڵ [ف] امسال

**ئیساڵەگە** îsaĺege ئیساڵ [ف] سال‌آینده

**ئیسفا** îsifa ١) مزنە ٢) قنیات [ف] ١) دقت کردن ٢) قناعت کردن

**ئیسفاگرتن** îsifa girtin مزنە گرتن [ف] بررسی کردن، دقت کردن

**ئیسکە** îske ئیسە «کوڕێ تووام هەر ئیسکە ـ ناوێ بنەمە وریسکە» [ف] الان

**ئیسوو** îsû یووسوو، سووکە ناو یووسف [ف] مخفف یوسف

**ئیسە** îse ئیسا، لە سمنانی (îse ئیسە) و لە ئازەری (îse ئیسە) و لە کرمانی (îsa ئیسا) و (îsayî ئیسا یی) و لە زاراوەێ خارکی (îsa ئیسا) و لە لوڕی (îse ئیسە) و لە بۆێرئەحمەدی (îso ئیسۆ) و لە هەورامی (îse ئیسە) و لە گیلەکی (hisa هسا) و لە گورگانی (ısa ئسا) و لە تەبەری (ısa ئسا) و لە بهبەهانی (îse ئیسە) و لە ئاشتیانی (ısa ئسا) و لە ئامرەیی (ısa ئسا) ئۆشن [ف] حالا، در سمنانی (îse ایسه) و در آذری (îse ایسه) و در کرمانی (îsa ایسا) و (îsayî ایسایی) در خارکی (îsa ایسا) در لُری (îse ایسه) در بویر احمدی (îso ایسو) در اورامانی (îse ایسه) در گیلکی (hisa هسا) و در گرگانی (ısa اسا) در طبری (ısa اسا) در بهبهانی (îse ایسه) در آشتیانی (ısa اسا) و در آمریی (ısa اسا) گویند

**ئیسەر** îser زێڕْ ئەوسەر [ف] این قسمت، از این سر

**ئێش** ıêş ژان، لە ئەوستا (êşe ئێشە) و (tbeîşe تبە ئیشە) نۆسریاس [ف] درد، رنج، در اوستا (êşe ئیشه) و (tbeîşe تبئیشه) نوشته شده

**ئیشالا** îşala وە ئمێد خودا [ف] ان‌شاءالله

**ئیشالاچڕ** îşala çiȓ کاکەوەنچڕ، یەکێ لە مەقامەیلْ موورْ لەکی [ف] یکی از مقامات مور لکی

**ئێشان** ıêşan ژانەیل [ف] دردها، رنجها

**ئێقراری** ıêqrarî ئەوقەرە «ئێقراری ئاێم هاتۆ» [ف] آنقدر، به حدی

**ئێقرە** ıêqre ١) ئەوقەرە ٢) قزمْ ئێقرە [ف] ١) آنقدر ٢) این

اندازه

**ئێقه** ıêqe ئێقره، له کرمانی «ئێقه»ئۆشن [ف] آنقدر، در کرمانی نیز «ئێقه» گویند

**ئێقه‌وره** ıêqewre ئێقره [ف] آنقدر

**ئیکان** îkan زێژْ ئه‌وکان [ف] این طرف رود

**ئێکه** ıêke ئێکه‌ش، ئێکه‌شه [ف] بعد، سپس

**ئێکه‌ش** ıêkeş ۱) ئێکه ۲) ئیجار [ف] ۱) بعد، سپس ۲) این بار

**ئێکه‌شه** ıêkeşe ئیجاره [ف] این بار

**ئیکه‌شه‌گه** îkeşege ئیجاره‌گه [ف] این دفعه

**ئیگل** îgil ۱) ئیجاره ۲) ئێکه [ف] ۱) این دفعه ۲) بعد، سپس

**ئیگله** îgile ئیجاره [ف] این دفعه

**ئیگله‌گه** îgilege ئیجاره‌گه [ف] این دفعه، باردیگر

**ئێڵ** ıêl̂ خێڵ، کوومه‌ڵ [ف] ایل

**ئێڵئووبا** ıêl̂ıuwba ئێڵ ئووماخ [ف] دار و دسته، طایفه

**ئێڵئووماخ** ıêl̂ı uwmax ئێڵ ئووبا [ف] دار و دسته، طایفه

**ئیلا** îla زێژْ ئه‌ولا [ف] این طرف

**ئیلاتر** îlatir زێژْ ئه‌ولاتر [ف] این طرف تر

**ئێڵاخ** ıêl̂ax زێژْ قشڵاخ [ف] ییلاق

**ئێڵاخان** ıêl̂axan ئێڵاخ [ف] ییلاقی

**ئێڵاخه** ıêl̂axe گیلاخه، گه‌یڵاخه [ف] گیاهی است

**ئێڵافه** ıêl̂afe بخت‌دان، بختێان [ف] تهمت زدن

**ئیلام** îlam ۱) زێژْ ئه‌و لام ۲) شارْ ئیلام، ناو زۆنه‌ێ «دێوالا» به ماناێ دیه‌که‌ی والی بۆیه [ف] ۱) این طرف من، مقابل آن طرف من ۲) شهر ایلام، نام قدیم این شهر «دێوالا» یا ده والی «ابوقداره» بوده

**ئێڵبه‌ر** ıêl̂ber گه‌وراێ ئێڵ [ف] راهنمای ایل

**ئێڵجاڕی** ıêl̂carî جاڕکیشان له ناو ئێڵه‌و [ف] همه پرسی، اطلاعیه، جار

**ئێڵخانی** ıêl̂xanî دیه‌که‌ێگه له چه‌مچه‌ماڵ سه‌حنه [ف] روستایی در چمچمال صحنه

**ئیلکه** îlke پاشگرْ بۆچگی «جامیلکه، کانیلکه» [ف] پسوند تصغر

**ئێڵه‌ک** ıêl̂ek ئه‌ڵه‌ک، سه‌ره‌ن بۆچگ [ف] الک

**ئیله** île ئیله‌که، ئه‌وه‌که «ل» [ف] دگر، دیگر

**ئیله‌که** îleke ئیله «ل» [ف] دگر، دیگر

**ئیم** îm ئی، یه «ئیمساڵ، ئیمڕوو» [ف] این

**ئیما** îma ئیمه «ل»، له ئه‌وستا (îmaw ئیماو) و له په‌هڵه‌وی (îam ئیما) نۆسریاس [ف] ما، ما ها، در اوستا (îmaw ایماو) و در پهلوی (îma ایما) نوشته شده

**ئێمات** ıêmat ئێوه‌ت [ف] پرورش دادن

**ئێمات کردن** ıêmatkirdin ئێوه‌تکردن [ف] پرورش دادن

**ئێمات که‌ر** ıêmat ker مخته‌و ده‌ر [ف] پرورش دهنده، آموزگار

**ئێمام** ıêmam سه‌ردارْ ئایینی [ف] امام

**ئێمامعه‌باس** ıêmam ébas دیه‌که‌ێگه له سه‌ر پیه‌ڵ [ف] روستایی در سرپـُل ذهاب

**ئیمان** îman دڵقایمی وه خودا [ف] ایمان

**ئێمان** ıêman دیه‌که‌ێگه له جووانڕو [ف] نام روستایی در جوانرود

**ئیمان هه‌رده** îman herde فره بێ تاو [ف] خیلی بیقرار از شدت...، از شدت بیقراری ایمان از کف دادن

**ئیمانهه‌رده بۆن** îman herde bün له شه‌ده‌تْ ... بێقه‌راری کردن [ف] از شدت... بیقراری کردن

**ئیمانهه‌رده کردن** îman herde kirdin بێتاو کردن [ف] بیقرار کردن

**ئیمجا** îmca بنووڕه ئمجا [ف] نگا **ئمجا** وترکیباتش

**ئیمڕوو** îmrû̂ ئمڕوو [ف] امروز

**ئیمڕووژ** îmrû̂j ئمڕووژ [ف] امروز

**ئیمساڵ** îmsal̂ هه‌ر ئی ساڵه [ف] امسال

**ئیمشه‌و** îmşew ئمشه‌و [ف] امشب

**ئێمڵ** ıêmil̂ هه‌رچۆپه‌رچۆ «هه‌م ئێمڵێ وه‌ت» [ف] حرف بی ربط، سخن بی سر و ته

**ئێمڵه** ıêml̂e باردار، ئاوْس [ف] حامله، باردار

**ئیمن** îmin بنووڕه هێمن [ف] آرام، نگا **هێمن**

**ئیمه** îme ئێمه، له زووانْ په‌هڵه‌وی (ıyma ئیما) و (emah ئه‌ماهـ) نۆسریاس [ف] ما، در زبان پهلوی (ıyma ایما) و (emah اماهـ) نوشته شده

**ئیمه‌یل** îmeyl ئیمه گشتێ [ف] ماها

**ئین** în ۱) پاشگرْ رازایی «شیرین، زه‌ڕین» ۲) نیشانه‌ێ بنچینه‌یی «گرین، کوڵین» [ف] ۱) پسوند توصیف ۲) علامت مصدر

**ئینه** îne پاشگرێگه رازا کەێده ناو «زەردینه، چەرمینه » ف پسوندی که صفت را به اسم تبدیل می‌کند

**ئێوار** ıêwar بنووڕە ئێواره ف نگا **ئێواره**

**ئێواره** ıêware تاریکان، له پەهڵەوی (ıêwarek ئێوارەک) نۆسریاس و له کرمانی «ئێوار » ئۆشن و له سەکزی «ئیره» وه ماناێ دێر ئۆشن ف غروب، در پهلوی (ıêwarek ایوارک ) نوشته شدەو درکرمانی «ایوار» گویند و در سکزی «ایره» به معنای دیر است

**ئیوه** îwe ئۆیه ف شما

**ئێوەت** ıêwet ئێمات ف سرپرستی، نگهداری

**ئێوەتکردن** ıêwetkirdin ئێمات کردن، هێوەت کردن ف نگهداری، سرپرستی کردن

**ئێوەتکەر** ıêwetker ئێماتکەر ف سرپرست

**ئێوەتەن** ıêweten دیەکەێگەلەلوڕستان ف روستایی از توابع لرستان

**ئێوەتەنچڕ** ıêweten çir̂ یەکێ له بەزمەیڵ مووڕ لەکی ف یکی از مقامات مور لکی

**ئییه** îye یه، ئەیه ف این

# ب

**ب** bi ١) کیشْ دۆیەمْ ئەلفبا ٢) پاشگرە لە کردارْ دەسووری «بخوە، بکە» ف ١) حرف الفبا ٢) پیشوند دستوری در فعل

**با** ba ١) بیل، بیلەو، لە ئەوستا (ba با) تۆسریاس ٢) وا ٣) باوگ ٤) دالْتە «تْ با کیید» ف ١) بگذار، باید، در اوستا (ba با) به معنی باید نوشته شده ٢) باد ٣) بابا، پدر ٤) پشتیبانی

**باباحەیدەری** baba heyderî یەکێ لە تائیفەیلْ ئالْ حەقە کْ ئۆوبایان رەسێدە سەی حەیدەر کورِ سەی مەنسوور ناسیار وە «سەیبراکە» و چەرخە نشینْ ئی تائیفە «سەی نەسردین و سەی حسام دینْ بابا حەیدەری»یە ف یکی از خاندانهای اهل حق منسوب به سید حیدر فرزند سید منصور ملقب به «سید براکه» و مسندنشینان این خاندان «سید نصر الدین و حسام الدین باباحیدری» هستند

**باباحەیران** baba heŷran دیەکەیگە لە رەوانسەر ف روستایی در روانسر

**باباعەزیز** baba ézîz دیەکەیگە لە رەوانسەر ف روستایی درروانسر

**باباشێخ** baba şêx دیەکەیگە لە سۆنقۆر ف نام روستایی در سنقر

**باباناعووسی** baba naûsî بابا ناعووسی، یەکێ لە بەزمەیلْ حەقانی «یارسان» کْ لە ناوْ باباناعووس گریایە و دۆ بەزمْ تن و سەنگین دێرێ و سەربەنێ لێواسە «نائووسنانی مێنانی چە سەر ـ تێخْ دۆ دەمم بەسا نە کەمەر ـ نە سینەم مەکنیوو خۆلاسەێ گەوهەر ـ زاتْ ئاسوارنان نامشەن حەێدەر» ف باباناعوثی، یکی از ٧٢ مقام حقانی است که بر گرفته از نام بابا ناعوث می‌باشد و دارای دو بزم تند و سنگین است و سربند آن چنین است: من از ذات حق هستم و در سینه‌ام خلاصه‌ی گوهر «علم» است و ذات مرد روحانی و بزرگی هستم که نامش حیدر بود

**بابایاری** baba yarî خواردەمەنیگە لە نژی ف خوراکی از عدس

**بابردە** ba birde ١) لاناوە لە لەرِ ٢) نەدار ف ١) کنایه از لاغر ٢) مفلس، ندار

**بابردەڵە** ba birdeĺe بابردە ف نگا **بابردە**

**بابردێ** ba birdê لەرِ و مردەنی ف لاغر مردنی

**بابڵی** babiĺî وە نازەو باوگ چرِین ف کلمه‌ای خطاب به پدر

**بابوو** babû باوگە، باوگ ف پدر

**بابووباپیر** bab û bapîr ئابا وئەژداد ف اجداد، نیاکیان

**بابەت** babet بنوورِە باوەت ف نگا **باوەت**

**بابەگەورا** babe gewra بابەگەورە، باوەگەورە ف پدر بزرگ

**باپیر** bapîr ١) باوەگەورە ٢) ناوێگەکورِانە ٣) خێڵێگە لە گوواورِ ف ١) پدر بزرگ ٢) نامی مردانه ٣) ایلی در گواور

**باپیرە** bapîre چرِینْ باوەگەورە ف کلمه‌ای خطاب به پدر بزرگ

**باپیرە** bapîȓe پیایێگ کْ وەلْ ژنْ منالْدارەو سۆر بکەێ بوودە باپیرەێ منالەگەێ، لە فەرانسەی (beau pere) ئۆشن ف پدر خوانده، مردی که با زن بچه دار ازدواج کند نسبت به فرزند زن «باپیرە» یا پدر خوانده‌است، در فرانسوی (beau - pere) به ناپدری گویند

**باتری** batirî باتلی، قووە ف باطری

**باتڵاخ** batiĺax باتلاق، جۆمجۆمە، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «چراف، زنە، زەل، زۆنگ، چەق، زەلکاو» ئۆشن ف باتلاق،

در دیگر گویشهای کردی «چراڤ، زنه، زەل، زۆنگ، چەق، زەلکاو» گویند

**باتلاغ** batiĺax́ جۆمجۆمە [ف] باتلاق

**باتلی** batlî باتری [ف] باطری

**باتمان** batman ١) فره، فرەوان ٢) دیەکەێگە لە بێڵەوار [ف] ١) زیاد، فراوان ٢) روستایی در بیلەوار

**باتوو** batû چەرمْ گون [ف] پوست روی خایه

**باتووبەن** batû ben گون بەن، بن گونی [ف] فتق بند

**باچە** baçe واچە، بۆش «شاکە لە سەردا، شاکە لە سەردا- راس باچە پەریم ئمجا لە سەردا» (خان مەسۆر) [ف] بگو، باز گو کن

**باج** bac ١) پارەێگ کْ ملهوڕ لە مەردم سێنێد ٢) خسن، پاشین «ل» ٣) قەلْقورچ، قاچ قاچ [ف] ١) باج ٢) انداختن، افشاندن ٣) نامنظم و ناریک

**باجباج** bac bac قاچ قاچ [ف] سری که نامنظم اصـلاح شده ، تاب و شکنج

**باجباجی** bac bacî باج باج [ف] سری که کوتاه و بلند اصلاح شده

**باجسەنن** bac senin باجگرتن [ف] باج گرفتن

**باجسێن** bac sên ملهوڕ [ف] باجگیر

**باجْ سێوڵ** baci sêwiĺ ملهوڕی [ف] باج سبیل

**باجگر** bac gir باج سێن [ف] باجگیر

**باجگرتن** bac girtin باج سەنن [ف] باج گرفتن

**باجگیر** bac gîr ملهوڕ [ف] باجگیر

**باجگیری** bac gîrî ملهوڕی [ف] باجگیری، قلدری

**باجم** bacim بخەم، بپاشنم «ل» [ف] بیاندازم، بیافشانم

**باجمەرێ** bacmerê بخەمە... «ل» [ف] بیاندازم به ...

**باجن** bacin بخە، بپشن «ل» [ف] بیانداز

**باجنە** bacine بخەنە... «ل» [ف] بیانداز به ...

**باجە** bace واچە، کوناواچە «ل» [ف] دریچه، روزنه

**باجی** bacî باوجی «باجی مْ ئەڕا بچم» [ف] کلمەای خطاب به خود، با این وجود...

**باخ** bax دارسان، لە سەکزی «باخ» ئۆشن [ف] باغ، در سکزی نیز «باخ» گویند

**باخان** baxan دار و دارسان [ف] باغها

**باخبر** bax bir̂ کەسێ کْ دارسان برێد [ف] هیزم شکن

**باخبڕین** bir̂în bax بڕینْ دارسان [ف] بریدن درختان

**باخت** baxt ١) کچیان، باختن ٢) ئەو باخت [ف] ١) سوختن، باختن در بازی ٢) او بازی را باخت

**باختن** baxtin ١) کچیان لە گەمە، لە پەهلەوی (waxten واختەن) تۆسریاس [ف] باخت در بازی، در پهلوی (waxten واختن) نوشته شده

**باختۆخن** bax tüxin دیەکەێگە لەک زووان لە کرماشان [ف] روستایی با گویش لکی در کرماشان

**باخچە** baxçe دارسانْ بۆچگ [ف] باغچه

**باخچەوقەتار** baxçe û qetar جی ئێلاخ و قشلاخْ ئێل سنجاوی کْ ئێرە بەشێگ لە کوردسانْ عراقە [ف] منطقەای گرمسیری در کردستان عراق که درگذشته قشلاق ایل سنجابی بوده

**باخْشا** baxi şa ناو زۆنەێ ئەێوان [ف] نام قدیم شهر ایوان غرب

**باخکوو** baxkû مەڵوەنێگە لە قەسر [ف] منطقەای در قصر شیرین

**باخڵە** baxiĺe ١) دیەکەێگەلە شازادەمامەد ٢) دیەکەێگە لە کولیایی [ف] ١) روستایی در امامزاده محمد ٢) روستایی در کلیایی

**باخەوان** baxewan ئەوەێگ کْ ها دیارْ باخەو [ف] باغبان

**باخەوانی** baxewanî وە دیارْ باخەو بۆن [ف] عمل باغبانی

**باد** bad بنووڕە وا [ف] نگا **وا**

**بادان** badan بنووڕە وادان [ف] نگا **وادان**

**بادْخام** badi xam بادْ لەش، جووری نەخوەشیە [ف] بیماریی نامشخص در بدن

**بادکمن** badkimin جووری مارە «ل» [ف] نوعی مار

**بادْلەش** badi leş بنووڕە بادْخام [ف] نگا **بادْخام**

**بادەوام** badewam دەوامدار [ف] محکم، بادوام

**بادەوان** badewan بەرزەهەوایلە [ف] بادبادک

**بادی** badî فیسو [ف] مغرور

**بار** bar ١) هەر چشتێ بنەیدەێ کووڵەو ٢) کار و کردە «تاوانبار، خەتابار» ٣) ڕەنج، مەێنەت «بارْ گرانێگە» ٤) پێشە «کار وبار» ٥) قووڕ بانْ زووان «بارْ زووانێ فرەس» ٦) لاناوە لە منالْ «دۆیەکە بارەگەێ نا» ٧) جار، کەڕەت ٨) کل بکە، بنار «پۆلەگە بار» [ف] ١) بار ٢) عمل ٣) رنج و محنت ٤)

پیشه، کار ٥) جرم روی زبان ٦) کنایه از جنین ٧) بار، دفعه ٨) بیاور

**بارا** bara بارەو ف برگردان

**باراسیاو** barasyaw ١) گەنمْ ماسیەیْ لە گوونی کریایْ ٢) لاناوە لە بار وبنە ف ١) گندم بوجاری شده و آماده بردن به آسیاب ٢) کنایه از بار وبنه

**باران** baran ١) بارێان ٢) واران ف ١) آنها را بیاور ٢) باران

**باڕان** bar̂an بووڕان، قووڕان ف صدای گاو، صدای زمخت

**باراناو** baranaw واراناو ف آب باران جمع شده

**بارانبڕان** bara bir̂an مانگْ بەختەواران ف موسم قطـع شدن باران، خرداد ماه

**باڕانن** bar̂anin بووڕانن ف صدای گاو وگوساله

**بارانە** barane ١) وارانە ٢) کل بکە وە... ٣) بەزمێگە ف ١) باران است ٢) بیاور به... ٣) بزمی است

**بارانەگەرد** barane gerd ئەولْ خوەدەو باران ف آنها را همراه خود بیاور

**بارانەو** baranew بارانە، بارەو ف آنها را برگردان

**بارانەوا** baranewa بارێانا ف آنها را برگردان

**بارانەوە** baranewe بارانەوا ف آنها را پس‌بده

**بارانەوەر** baranewer بکیشانە وەرەو ف آنها را بیاور به جلو

**بارانەوەرا** barane wera بارانە وەرەو ف آنها را بیاور به جلو

**بارانەوەرەو** barane werew بارانەوەرا ف آنها را جلو بیاور

**بارانەوەیْ** baraneweŷ ئەوانە بارەو ف آنها را بر گردان، پس‌بده

**باراێبار** baraêbar بارەیْ بار، کووچبار ف کوچ و کوچبار

**بارْبت** baribit باربۆدی، بارْتاویل ف دلیل غیر منـطقی

**باربردن** bar birdin بارکیشان ف حمل بار

**باربۆد** barbod ١) ژەنیارْ دەورەیْ خەسرەو پەروێز، لە ئەوستا (pehÎbed پەهلْبەد) نۆسریاس ٢) ناوێگە کوڕانە ف ١) آهنگساز و خوانندەی زمان خسرو پرویز، در اوستا (pehÎbed پهلبد) نوشته شده ٢) نامی مردانه

**باربۆدی** barbodî ١) یەکیْ لە بەزمەیلْ هوورەس ٢) بارْبت، بارْتاویل «کەم باربۆدی بۆش» ف ١) یکی از مقامهای هوره

٢) دلیل غیر منـطقی، غیرمنـطقی، توجیه

**باربەر** bar ber بارکیش ف باربر، بارکش

**باربەس** bar bes باربەن ف باربند

**باربەسان** bar besan تێار بوون ف آمادەی سفر شدن

**باربەسی** bar besî گورجەو بۆ، تێار بۆ ف آماده شده

**باربەن** bar ben باربەس ف باربند

**باربەنی** bar benî باربەسی ف باروبنه بستن، آماده شدن

**بارْتاویل** baritawyl باریاو، هۆکار نارەوا ف غیر منـطقی، دلیل غیرمنـطقی، توجیه

**بارتنگ** bartinĝ بارهەنگ «ل» ف نگا **بارهەنگ**

**بارتێ** bartê بار، بارا «ل» ف بیاور

**بارجامە** barcame پرێزێ، لە پەهلەوی (baryamek بار یامەک) نۆسریاس ف بغچه سفر، در پهلوی (baryamek باریامک) به معنی خورجین و بغچه است

**بارخسن** bar xisin ١) بەرخسن، زایین ٢) نیشتە جی بوون ف ١) بچه انداختن، سقط جنین ٢) اتراق کردن

**باردار** bar dar ئاوْس، ئێمڵە ف بادار، حامله

**بارداگرتن** bar dagirtin ١) گواڵە پڕ کردن ٢) بارێگ وە خوار هاوردن ف ١) جواله را پرکردن ٢) باری را خالی کردن

**بارداوەسان** bar dawesan قایم کردنْ بار ف باری را محکم بستن

**بار راسکردن** bar r̂as kirdin لاناوە لە هامێاری دان ف کنایه از کمک کردن

**بار راس هاوردن** bar r̂as hawirdin بار راس کردن ف کمک کردن

**بارسووک** bar sûk ١) زێزْ ماڵدووس ٢) خەم نەخوەر ئەڕایْ ماڵ دنیا ف ١) کم تعلق ٢) سبکبار

**بارسووک کردن** bar sûk kirdin لاناوە لە سەرْ مل شووردن ٢) لاناوە لە رەحەت بۆن ف ١) کنایه از شوخ بر گرفتن ٢) کنایه از آسوده شدن

**بارسووکی** bar sûkî ئاسوودەیی ف سبکباری، آسودگی

**بارْش** bariş ١) بارْشت، وارین ٢) بارەیْ «ل» ف ١) بارش ٢) بیاورش

**بارْشت** barişt وارین ف بارش

**بارکردن** bar kirdin ١) بار لە سەر ولاْخ نان ٢) کووچ کردن ٣) دارەڕا کردن ف ١) بار را بر پشت الاغ نهادن ٢) کوچ

کردن ۳) تدارک دیدن، فراهم کردن

**بارکوو** bar kû پووک، چەکوشْ گەورا ف پُتک

**بارکەفتن** bar keftin تۆشْ نامەی هاتن ف بد بیاری

**بارکەفتێ** bar keftê بەێ بەخت ف بدشانس

**بارْ کەو کردن** bari kew kirdin لاناوێگە ئەڕایٚ هەڵەپڵە داشتن«چمان بارْکەو کردێە» کەو وە ماناێ ئەسپْ کەهەرە ف کنایەای برای کسی کە تعجیل فراوان دارد «کەو» به معنای اسب کَهَر است

**بارکیش** bar kîş باربەر ف بارکش

**بارکیشان** bar kîşan زامەتْ مەردم وە مل گرتن ف بار مردم را به دوش کشیدن

**بارگا** barga بارێا ف بارگاه

**بارْ گران** bari giran زامەتْ فرە ف بارگران

**بارگلان** bargilan بانگلان ف بامکوب، تکه سنگی مدور که با آن بامهای گلی را می‌کوبند

**بارگووش** bar gûş چلەبڕانە ف دعایی که هنگام تولد نوزاد می‌نویسند و به شانه‌ی نوزاد می‌آویزند

**بارگە** barge ۱) بارێە، بارگا ۲) دیەکە و کۆیەێگە لە هووزمانان ف ۱) بارگاه ۲) روستا وکوهی در هوزمانان هلیلان

**بارگەبارگە** barge barge بارێەبارێە، یەکێ لە شەش بەشْ کەڵام یا دەفتەرْ یارسانە کْ لە بارەێ ئارەسە بۆنْ بارێاێ خوداسە لە زەمانەیلْ زۆنە ف بارگاه بارگاه، یکی از شش بخش کلام اهل حق درباره فرود آمدن بارگاهای ذات احدیت الهی در زمانهای کهن و سرزمینهای گوناگون و ایران و جهان و گردش ارواح در آنهاست

**بارگەپووش** barge pûşکەفەن دۆر، ئەو کەسە کْ کەفەن دۆرنێد «هەرکەس دزەڕای ڕەفیقانم کەێد- چمان بارگەپووشْ ئێمامانم کەێد» ف کفن دوز، آنکه کفن می‌دوزد

**بارگەوبنە** barge û bine جل وپیتوو ف بار و بنه، اثاثیه

**بارم** barim مْ ئەو چشتە بارم ف بیاورم

**بارما** barima بارْمەو ف برگردانم

**بارماخ** barmax پەڕەێ سیکار، تۆرکیە ف ورق کاغذ سیگار، اصل این واژه ترکی است

**بارمان** bariman ئەوانە بارْم ف آنها را بیاورم

**بارمانا** barimana بارْمانەو ف آنها را برگردانم

**بارمانە** barimaneئەوانە بارْمە... ف آنها را بیاورم به ...

**بارمانە گەرد** barimane gerd ئەوڵ خوەمەو بارم ف با خود بیاورم

**بارمانەو** barimanew بارْمانا ف آنها را برگردانم

**بارمانەوەێ** barimane weŷ بارْمێانەو ف آنها را برگردانم

**بارْمتە** barimte گرەوی ف گروگان

**بارمەو** barimew بارما ف برگردانم

**بارمەوا** barime wa بارمەوە ف دوباره برگردانم

**بارمەوە** barimewe بارمەوا ف دوباره برگردانم

**بارمەوەێ** barime weŷ ئەوە بارما ف آنرا بر گردانم

**بارمێا** barimiêa بارمێەو ف آنرا برگردانم

**بارمێان** barimiêan ئەوانە بارم ف آنها را بیاورم

**بارمێانا** barimiêana بارمێانەو ف آنها را برگردانم

**بارمێانەو** barimiêanew بارمێانا ف آنها را بر گردانم

**بارمێەو** barimiŷew بارمێا ف آنرا برگردانم

**بارن** barin ئۆیە بارْن ف بیاورید

**بارنا** barina بارْنەو ف برگردانید

**بارنامە** barname ۱) بارەگەم نامەسە... ۲) پەڕەێ سیاتی بازار ف ۱) بار گذاشته‌ام بر ... ۲) بارنامه

**بارنان** barnan وە بان نان ف غذا درست کردن

**بارنان** barinan ئەوانە بارْن ف آنها را بیاورید

**بارنانا** barinana بارْنانەو ف دوباره آنها را برگردانید

**بارنانە** barinane بارْنە... ف بیاورید به ...

**بارنانەو** barinanew ئەوانە بارْنا ف آنها را بیاورید

**بارنەوە** barinewe بارْنانا ف آنها را برگردانید

**بارنەوەر** barine wer بارْنە نووا ف بەجلو بیاورید

**بارنەوەر** barnewer وڵاخْ کەمەری یا نافەرمان ف الاغ تنبل یا نافرمان

**بارنەوەرا** barine wera بارْنە نوواتر ف بیاورید به جلوتر

**بارنەوەێ** barineweŷ بارْنێا ف آنرا برگردانید

**بارنێا** bariniêa بارنێەو ف آنرا برگردانید

**بارنێان** bariniêan ئەوانە بارن ف آنها را بیاورید

**بارنێانا** bariniêana بارنێانەو ف آنها را برگردانید

**بارنێانەو** bariniêanew بارنێانا ف آنها را برگردانید

**بارنێەو** bariniŷew بارنێا ف آنرا برگردانید

**بارۆت** barût زەڕنیقْ تفەنگ ف باروت

**بارۆتی** barûtî جووڕێ چایە ف نوعی چای است

**باره** bare ۱) بارێگه ۲) بارەیٚ... ف ۱) بار است ۲) بیاور به ...

**باڕه** bar̂e بووڕه، قووڕه ف صدای احشام

**بارهاتن** bar hatin گەورا بۊن «لێوا بار هاتێه» ف تربیت شدن، ادب شدن

**بارهاوردن** barhawêrdin ۱) هاوردنْ بارێگ له جیبگ ۲) ئەدەو کردن و گەورا کردن ف ۱) باری را آوردن ۲) تربیت کردن و بزرگ کردن فرزند

**باڕەباڕ** bar̂e bar̂ قاڕەقاڕ ف صدای پیاپی احشام

**باڕەکەو** bar̂ekew تۊله کەو کْ هێمان سەرەوە نەتۊیه ف کبک یک ساله

**بارەگا** barega بارێا، بارگا ف بارگاه

**بارهەڵگر** bar heĺgir زامەتکیش ف زحمت کش

**بارهەڵگرتن** bar heĺgirtin بارْ کەسێ سووکەو کردن ف به کسی کمک کردن

**بارهەنگ** barhenĝ گیاێگە وەڵنگەیلْ پیەنێ دێرێد و له زەمینەیلْ ئاوەزا سەونز کەێد و تۊخمەگەیْ زێزْ بەله فیرەس و وەڵنگەگەیْ ئەڕای ساڕێژْ سییەزام خاسه ف گیاهی با برگهای پهن که در زمینهای نمناک می‌روید و بذر آن برای درمان نفخ در کوکان خوب است وکوبیده برگ آن برای درمان سیاه‌زخم بکار می‌رود

**بارەشامه** bareşame دیەکەێگه له گاواره ف روستایی در گهواره

**بارەناز** bare naz بارەنداز ف بارانداز

**بارەو** barew بارێا ف برگردان، پس‌بده

**بارەوه** barewe بارەو ف دوباره برگردان

**بارەوەێ** barewêŷ بارێا ف آنرا برگردان

**بارەێ** bareŷ تْ ئەو چشته بار ف بیاورش، آنرا بیاور

**بارەێبار** bareŷ bar بارێ بار ف کوچ و کوچبار

**باری** barî ۱) تْ بار ۲) وڵاخ یا ئەسپێ کْ بارییه ف ۱) بیاوری ۲) اسب یا الاغی که تازه باری شده

**بارێ** barê ئەو بارێ، بارێد ف بیاورد

**باریاو** bariyw بارْتاویل ف غیرمنطقی، بیهوده، توجیه

**باریک** barîk ۱) لەڕ ۲) تەسک، له سەکزی «باروک» ئۊشن ف ۱) لاغر ۲) باریک، در سکزی «باروک» گویند

**باریکان** barîkan ئاێم لەڕ درێژ ف لاغر و دراز

**باریکڵانه** barîkĺane باریکەڵانه ف باریک اندام

**باریکەجوو** barîke cû جووْ باریک ف جوب باریک

**باریکەجینگ** barîkecînĝ جینگ، تڕْ بۊچگ ف گوز، صدای خفیف گوز

**باریکه ڕێ** barîke r̂ê تۊلەڕێ ف کوره راه

**باریکەکوڕ** barîke kwir̂ ساچڵگه کوڕ ف پسر باریک اندام و ورزیده

**باریکەڵه** barîkeĺe باریکڵانه ف باریک اندام

**باریکەمار** barîke mar جوورێ ماره ف نوعی مار باریک

**باریکەنان** barîke nan بنووڕه ئاوباریکه ف نگا **ئاوباریکه**

**باریکەی** barîkey دیەکەێگه له ئارۊنئاوا ف روستایی در اسلام آباد غرب

**باریکی** barîkî دەردەباریکه ف بیماری سل

**بارێگ** barêg ۱) یەێ بار ۲) بارێد، بارێ ف ۱) باری، یک بار ۲) بیاورد

**بارێگان** barêgan بارێدان ف آنها را بیاورد

**بارێگه** barêge ۱) ئەوه بارێگه ۲) بارێده... ف ۱) آن باری است ۲) بیاورد به..

**بارێگەو** barêgew بارێدەو ف برگرداند

**باریگەو** barîgew باریدەو ف برگردانی، بیاوری

**باریگەێ** barîgeŷ باریدەێ ف بیاوری، برگردانی

**بارێگەێ** barêgeŷ بارێدەێ ف بیاورد، برگرداند

**بارین** barîn ۱) بارشت ۲) ئۊیه بارْن ف ۱) بارش ۲) بیاورید

**باریه** barye ۱) یەکێ له بەزمەیلْ هووره ۲) بنووڕه بارگه بارگه ف ۱) یکی از مقامات هوره ۲) نگا **بارگەبارگه**

**باز** baz ۱) مەڵْ ڕاوچی ۲) لەێ نوو «هەم باز هاتەو» ۳) واز، وڵا ٤) پاشگرْ کارامەیی «کەمووتەر باز، قومار باز» ٥) وه دەس دەر «گیانباز» ٦) ئارەزوو مەند «ژنباز، بەچەباز» ٧) سییه و سفێد، بازێ، له سەکزی «بازەک» وه مانگاێگ کْ کرێگ له شانووکه تا دۊ بێاشتوو ئۊشن ٨) وەک، وێنەێ «بازْ خوەد» ف ۱) باز شکاری ۲) دوباره ۳) باز، گشاده ٤) پسوند مهارت ٥) باختن ٦) آرزومند ٧) رنگ سیاه و سفید، در سکزی «بازَک» به گاوی که خطـی سفید از شانه تا دم داشته باشد گویند ٨) مانند، مثل

**بازاڕ** bazar̂ شوونْ مامڵه کردن، له فەرانسەی و ئنگلیسی و

ئەرمەنی (bazar) ولە تۆرکی وبولغاری (pazar) ئۆشن ف بازار، در لاتین و فرانسوی و ارمنی (bazar) و در ترکی و بلغاری (pazar) گویند

**بازارتێژی** bazar̂ têjî بازارگەرمی ف بازار گرمی

**بازارکەر** bazar̂ ker ١) دلاڵی ٢) چشت سێن ف ١) دلالی ٢) کسی که خرید خانه با اوست

**بازارگەرمی** azar̂ germî بازارِ تێژی ف بازار گرمی

**بازاڕی** bazar̂î دکاندار، مامڵەکەر ف بازاری

**بازامە** bazame دەرامەێ «خەمْ دڵەگەم چەنە بەمووە - شەنیا شەنێ کەێد، بازامەێ کووە» ف بازده، محصول

**بازان** bazan ١) سراوێگە لە ئەێوان ٢) دیەکەێگە لە جووانڕو ف ١) سرابی در ایوانغرب ٢) روستایی در جوانرود

**بازانگیچان** bazan gîçan بڵا، بەرد ف مصیبت غیر منتظره

**بازباز** baz baz سیپە و چەرمێ ف سیاه و سفید

**بازبازین** baz bazîn بازباز ف سیاه و سفید

**بازْبوور** bazi bûr سیپە و چەرمێ وبوور ف رنگ سیاه و سفید با زمینه قهوه‌ای

**بازخورەک** baz xwirek نەرمە گووشتْ شکار ف آن قسمت از گوشت شکار که باز ابتدا آنرا می‌خورد، فیله

**بازڕ** bazir̂ جوورێ بازە ف از مرغان کوچک شکاری

**بازڕە** bazir̂e بازڵە ف کسی که چشم و گوشش باز شده، تازه آگاه

**بازقەپان** bazqepan ١) باز هەڵقاپێدەد، نووڕیگە ٢) جوورێ مارە ف ١) نوعی نفرین است، باز تو را بر دارد ٢) نوعی‌مار

**بازْگە** bazige دیەکەێگەلە دێزگران ف روستایی در دیزگران از توابع اسلام آباد غرب

**بازگیر** bazgîr ١) دیەکەێگە لە سەرپیەڵ ٢) دیەکەێگە لە لوڕسان ف ١) روستایی در سرپل ذهاب ٢) روستایی در لرستان

**بازڵە** baziƚe ١) بازڕە، وریا بۆ ٢) ئەو کەسە ک ڕۆ ڕەگاێ ڕزیاس ف ١) نگا **بازڕە** ٢) کسی که به دلیل آمد وشد کردن به جایی شرم و رودربایستی‌اش ریخته باشد

**بازمۆش** bazmüş جوورێ مۆش خۆرماس «ل» ف نوعی قاقم

**بازمەلە** baz mele دەس مەلە «ل» ف شنای کرال

**بازوو** bazû بەشێگ لە باڵ، لە مرک تا سەرْ شان، باهوو، لە ئەوستا (bazu بازوو) نۆسریاس ف بازو، در اوستا (bazu بازوو) نوشته شده

**باز وبوور** baz û bûr بازْبوور ف نگا **بازْبوور**

**بازووبەن** bazû ben هەر چشتێ ک بوەسیەێدە بازوو ف بازوبند

**بازە** baze ١) ناوێگە ئەڕاێ سەگ ٢) سیپە و چەرمێە ف ١) نامی برای سگ ٢) سیاه و سفید است

**بازەبازە** baze baze چڕینْ گەماڵێگ کْ ناوێ بازەس ف صدا کردن سگ

**بازەڵە** bazeƚe بنووڕە بازڕە، بازڵە ف نگا **بازڕە**

**بازەێ تەبەڵس** bazeŷ tebeƚis لاناوە لە لەموور و چەڵْ مل ف کنایه از طفیلی

**بازی** bazî گەمە ف بازی

**بازێ** bazê ١) بڕێگ، دەسەێگ «بازێ کەس نییەزانێ» ٢) ڕەنگْ باز ف ١) بعضـی، بعضـیها ٢) رنگ سیاه و سفید

**بازیدراز** bazî diraz کۆیەێگە لە گیەڵان ف کوهی در نزدیکی گیلانغرب

**بازیکەر** bazî ker چووپیکیش، کەسێگ کْ خاس هەڵپەڕگە کەێد ف چوپی‌کش ماهر، کسی که خوب چوپی می‌کشد

**باژ** baj ١) بەو «ل» ٢) بخە «ل» ف ١) بیا ٢) بیانداز

**باژتێ** bajtê بخە «ل» ف بیانداز

**باژە** baje بخە «ل» ف بیانداز

**باژەبان** baje ban بخە بان «ل» ف بیانداز به بالا

**باس** bas ١) وەتوویژ ٢) دەنگوباس ٣) بایەس، بایەد «باس بچم» ف ١) بحث ٢) خبر ٣) باید

**باساکەلبڕ** basa kelbir̂ قات بۆن، نیاشتن ف کنایه از نداشتن

**باساکی** basakî تەواری «گ»لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی « برس، برست» وە ماناێ تەواناسە و لە لاتین (brisk) وە ماناێ چالاکە ف چابکی، چالاکی، در دیگر گویشهای کردی « برس، برست» به معنای توانا و توان نوشته شده و در لاتین (brisk) به معنای چابک و چالاک است

**باستەن** basten باسەن، بەسبار ف مثلا، برای نمونه

**باسقول** basqwil ئاخڵەدان ف محاصره کردن

**باسقولدان** basqwil dan ئاخڵەدان ف محاصره کردن

**باسک** bask ۱) باهوو، بازوو ۲) کۆیەسان ف ۱) بازو، کتف و بازو ۲) کوهستان، منطقەی کوهستانی

**باسکردن** bas kirdin وەتووێژ ف گفتگو

**باسکلاو** bas kiĺaw گەڵاێ ڕێواس ف برگ ریواس

**باسکڵە** baskiĺe ۱) دیەکەێگە لە گیەلان، لە زووانْ کوردی « باسک» وە ماناێ بازوو و کۆیەسانە و باسکڵە شاخاوییە ۲) دیەکەێگە لە چەرداوڕ ف ۱) روستایی در گیلانغرب، در زبان کردی «باسک» به معنای بازو و منطقەی کوهستانی است و این روستا نیز در منطقەای کوهستانی است ۲) روستایی در چردوال

**باسکە** baske لیسان ف بازیی که با سکه انجام می‌شود

**باسکی** baskî ۱) کەسێ کْ مۆ سەر دەێدە بان ۲) ناوێگە کوڕانە، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی وە «بازوو، مرک» ئۆشن « باسک» گاهس باسکی وە ماناێ بڕ بازوو پیەن و زووردار بوود ف ۱) کسی که موی سرش را به سمت بالا شانه می‌کند ۲) نامی مردانه «باسک» در کردی سورانی به معنی بازو و ساعد است و «باسکی» یعنی صاحب بازوان توانا و نیرومند

**باسوخواس** bas û xwas دەنگوباس ف اخبار

**باسۆرمە** basorme بنووڕە بڵکاف ف نگا **بڵکاف**

**باسەن** basen بەسبار، باسەن قسە ف مثلا، برای نمونه

**باسەنقسە** basen qise بەسبار ف مثلا، برای نمونه

**باش** baş ۱) قوش، باشە، واشە «ل» ۲) خاس، خووب « خانم خوەێ خاسە، خانم خوەێ باشە- ناو سینانە گەێ بارێ قۆماشە» ف ۱) باشە، قوش ۲) خوب، عالی، مناسب

**باشْ باڵادەس** bşi baĺa des بنووڕە باشْقە ف نگا **باشْقە**

**باشبلۆک** baş bilük باشْقە «ئەێوانی جل قووز پا وە چەفتەو نەر ـ خوەێ وە باش بلۆکْ ئێڵەیل حساو کەر» ف سرور، بزرگ، بهتر

**باشجقە** başciqe بنووڕە باشْقە ف نگا **باشْقە**

**باشقا** başqa زهاک، زرنگ و توانا ف زرنگ، زرنگ و توانا

**باشْقە** başiqe باشْ باڵادەس، باشْقە گۆیەڕیاێ «باشە» و «واشە»س وە ماناێ تێژباڵ ف بلند پرواز، تیزپرواز، که خود معرب «باشه» و «واشه» است، کنایه از مغرور

**باشکانێ** başikanê مەچووزانم، گەمان نییەکەم «باشکانێ ئیکارە سەر بگرێد» ف دو دلی، مردد بودن

**باشکولان** başkûĺan دیەکەێگە لە کەنۆلە ف روستایی در کندوله

**باشوو** başû واشە، جوورێ بازە ف نوعی باز تیز پرواز، چرغ

**باشە** başe ۱) باشەد ۲) بەرجد «لە هۆرد نەچوو بچیدە ماڵمان؟ باشە» ف ۱) باشد ۲) حتما، صد در صد

**باشەد** başed ۱) باشە ۲) بەرجد ف ۱) باشد ۲) حتما

**باغڵە** baxíĺe دیەکەێگە لە چەرداوڕ ف روستایی در چرداول

**باغە** baxé ۱) باقە، قامێش ۲) نەخوەشی لە سم چووار پا ف ۱) نی ۲) بیماریی در سم ستوران

**بافە** bafe دەسەێ گەنم یا جۆیەێ درەو کریاێ، لە کرمانی و سەکزی «بافە» ئۆشن ف دسته‌بندی غلات درو شده، در کرمانی«بافه» گویند و در سکزی «بافه» چله مو یا نخ بافته شده را گویند

**بافەوەکووڵ** bafe we kûĺ لاناوە لە وە کارەو نەڕەسین، شەکەت بۆن ف کنایه از نرسیدن به کارگروهی، مثلا استادی که مشغول بنایی است شاگردش تمام مواد لازم را زودتر از کار استاد جلوی دستش قرار دهد بگونه‌ای بین شاگرد و استاد هماهنگی نباشد و استاد احساس خستگی کند

**بافیا** bafya چنیاێ ف بافته شده

**بافیاگ** bafyag بافیاێ ف بافته شده

**بافیان** bafyan بافیا ف بافته شده

**بافیاێ** bafyaê بافیاگ ف بافته شده

**بافین** bafîn چنین ف بافتن

**باقانن** baqanin باقەباق ف واق واق کردن

**باقراوا** baqir awa ۱) دیەکەێگە لە دێزگران ۲) دیەکەێگە لە شیان ف ۱) روستایی در دیزگران از توابع اسلام‌آبادغرب ۲) روستایی در شیان

**باقلە** baqile ۱) دانەێگە خواردەمەنی جوورْ لوبییە ۲) دیەکەێگە لە بیڵەوار ف ۱) باقلا ۲) روستایی در بیله‌وار

**باقە** baqe ۱) باغە، قامێش ۲) دەنگْ ئاژەڵ ف ۱) نی ۲) صدای بع بع

**باقەباق** baqe baq باقانن ف صدای باقه‌ی پیاپی

**باقەبەس** baqe bes تن و سفت بەسان ف محکم بستن هر چیزی

**باقی** baqî وە جی مەنی، وامەنە ف باقیمانده

**باگژه** ba gije وایَ نه شه‌ماڵ و نه زه‌لان ف باد میانه‌ی شمال و جنوب

**باگیژه** ba gîje واگیژه «گ» ف گردباد

**باڵ** baĺ ١) باڵ و باهوو ٢) باڵ په‌له‌وه‌ر ٣) قوڕنه «له چووار باڵه‌و ده‌ور دانه لێم» ٤) فڕین، په‌ڕین ف ١) بازو، دست و بال ٢) بال پرنده ٣) اطراف ٤) پرواز

**بالا** baĺa ١) به‌رزی، به‌ژن، له په‌هله‌وی (beşn به‌شن) نۆسریاس ٢) به‌رز ف ١) بلند قامت، در پهلوی (beşn بشن ) نوشته شده و در کردی به آن «بـَژن» گویند نگا **به‌ژن** ٢) بلند

**بالابه‌رز** baĺa berz بالا، به‌ژن ف بلند قامت

**بالابه‌رزه** baĺa berze کلگ ناوینه ف انگشت وسطـی

**بالاپووش** baĺa pûş کرواسْ سه‌رتاپا ف بالاپوش

**بالاپشت** baĺa pişt بالاپێشت، ته‌نکه‌بڕ کردن ف جدا سازی بوته‌های جالیزی برای رشد بیشتر

**بالاپشت کردن** baĺapişt kirdin بنووڕه بالاپشت ف نگا **بالاپشت**

**بالاجوو** baĺacû ١) دیه‌که‌یگه له که‌نۆله ٢) ئه‌مار ئاو، بان جوو، له هه‌ر ئاواییگ کیه‌نی یا ئه‌مار ئاوێگ ک ئاو ئرایَ خواردن لیَ تیه‌رن وه بالاجوو ناوداره ف ١) روستایی در کندوله ٢) چشمه یا آب انباری که آب شرب روستا را تامین می کند

**بالاخان** baĺaxan بالاخانه «ژێرخان بالاخان» ف طبقه‌ی دوم خانه

**بالاخانه** baĺaxane باڵه‌خانه ف طبقه‌ی دوم خانه

**بالادان** baĺadan ١) باڵه‌و داین ٢) باڵ باڵه‌و بۆنْ رییه‌ن ف ١) پرواز کردن ٢) پراکنده شدن گله در صحرا برای چرای بهتر

**بالاده‌س** baĺa des ١) ده‌سلاتدار ٢) لابان گرتن ف ١) با نفوذ ٢) قسمت بالایی

**بالار** baĺar ١) سییه ودڵ «له‌به‌و خه‌نیمن بالارمان بریا» ٢) قڕان ٣) سۆن، دیله‌ک ٤) باڵێار، بنووڕه باڵێار ف١) از فرط شادمانی بی حال شدن ٢) نگا **قڕان** ٣) دیرک، چوب ستون ٤) نگا **باڵێار**

**بالا رووا‌کانن** baĺa r̂uwakanin زۆزی به‌رز بۆن ف قد کشیدن

**بالاگرتن** baĺa girtin ١) باڵه‌و گرتن ٢) ئه‌نازه گرتن «به‌و بالا بگریم وه ئه‌قدْ بالا» ف ١) پرواز کردن ٢) اندازه گرفتن

**باڵگریوه** baĺagirîwe خێڵێگه له لوڕه‌یل کْ «قه‌ێه‌م خه‌ێر خانم» له‌و خێڵه بۆ ف تیره‌ای از لرها که «قدم خیر خانم» از آن تیره بود

**باڵگوڵ** baĺagwiĺ ناوێگه ژنانه ف نامی دخترانه

**باڵباز** baĺbaz ١) بڵباز، بڵباس٢) جوورێ مامراویه ف ١) صفتی برای تیزی، تیز ٢) نوعی مرغابی

**باڵباڵ** baĺ baĺ ١) فره‌فڕ کردن ٢) تۆچیانْ رییه‌ن ف ١) بال بال‌زدن ٢) پراکنده شدن گله

**باڵباهوو** baĺi bahû بڕْپازوو «گ» ف بازو وساعد

**باڵبه‌س** baĺ bes باڵبه‌ست، که‌ت به‌س ف کت بسته

**باڵبه‌سان** baĺ besan ١) باڵبه‌س ٢) که‌مووته‌رێگ کْ تووان ماڵییه‌و بکه‌ن باڵێ به‌سن تا هووکاره‌یَ ئه‌و ماڵه بوود ف ١) کت بستن ٢) کنایه‌ای در بین کبوتربازان، کبوتری که می‌خواهند به مکان جدید عادت کند پرهایش را می‌بندند تا مدتی پرواز نکند و به آنجا عادت کند

**باڵبه‌سته** baĺ beste که‌ت به‌سته ف کت بسته

**باڵته** baĺte ساتوور ف ساطور

**باڵچه‌و** baĺi çew نووڕسن وه بێژْ چه‌و ف با حالتی نیمه باز نگاه کردن، کنایه از زیر نظر داشتن

**باڵخه‌نجه‌ره** baĺxencere جوورێ سییه‌پرۆسنه‌که، شه‌مشێر باڵ ف نوعی پرستو

**باڵدار** baĺdar هه‌رچێ بفڕێ ف پرنده

**باڵدان** baĺdan ١) فره‌فڕ کردن ٢) باڵه‌و داین ف ١) بال بال زدن ٢) پرواز دادن

**باڵداین** baĺ dayn ١) هه‌ڵفڕانین ٢) باڵه‌و دان ف ١) پروازش دادید؟ ٢) پرواز دادن

**باڵزڕ** baĺ zir̂ مه‌لێگه ف پرنده‌ای است

**باڵش** baĺiş باڵشت، باڵنج ف متکا

**باڵشت** baĺişt باڵش، باڵنج ف بالش، متکا

**باڵفڕنه‌ک** baĺ fir̂nek ١) بالا گرتن «ل» ٢) لاناوه له زرکْ زنێ ٣) باڵوون ف ١) پرواز کردن ٢) کنایه از زرنگ ٣) باد بادک

**باڵکوڵ** baĺ kwiĺ ژێرشه‌ۆ، فانیله ف زیر پیراهن، آستین کوتاه

**باڵگرتن** baĺgirtin ١) فڕین ٢) ساجێگ ک حساوی داخ بۆیه و ئاماده‌یَ نان درْس کردنه ف ١) پرواز کردن ٢) کنایه از

**بەستە** beste جەڕە، دەسە ف بستە

**بەستەنی** bestenî شیر وشەکەرْ یەخ دریایَ، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «دۆندرمە، بوزە» ئۆشن ف بستنی، در دیگر گویشهای کردی «دۆندرمە، بوزە» گویند

**بەسْدانە** besidane ئەڕایَ ئۆیە بەسە ف شما را بس است

**بەسْدە** beside ئەڕایَ تْ بەسە ف تو را بس است

**بەسراوی** besrawî ناوێگە ژنانە ف نامی دخترانە

**بەسریا** besirya بەسیا ف بستەشد

**بەسریاس** besiryas بەسیاس ف بستە شدەاست

**بەسریاسا** besiryasa بەسریاسەو ف بستە شدە است

**بەسریاسەو** besiryasew بەسیاسەو ف بستە شدە است

**بەسریاگ** besiryag بەسریان ف نگا **بەسریان**

**بەسریان** besiryan ١) بەسریا ٢) بەسێان ف ١) بستە شدند ٢) ناتوانی داماد در شب زفاف

**بەسریانە** besiryane بەسیانە ف بستە شدەاند

**بەسریانەسا** besiryanesa بەسیانەسا ف بە هم بستە شدەاند

**بەسریانەسەو** besiryanesew بەسیانەسەو ف بستە شدەاند

**بەسریانەو** besiryanew بەسیانەو ف بە هم بستە شدەاند

**بەسریایَ** besiryaê بەسێایَ ف بستە شدە

**بەسریایە** besiryaŷe بەسیایە ف بستە شدە است

**بەسزووان** besizuwan لاناوەلە بەدبەخت ف کنایە از بیچارە، بستە زبان

**بەسکردن** bes kirdin ١) بەسبوون ٢) ناوجی کردن «ل» ٣) کووتا هاتن لە قسیە کردن ف ١) کافی بودن ٢) میانجی گری کردن ٣) کوتاه آمدن در گفتگو

**بەسە** bese ١) جەڕە، بەستە ٢) کافی‌یە ٣) ناوێگە ژنانە ف ١) بستە ٢) کافی است ٣) نامی زنانە

**بەسەزووان** besezuwan بەسزووان ف بستە زبان، بیچارە

**بەسی** besî ئەڤ بەسا ف او بست

**بەسیا** besya ١) بەسریا ٢) نەتۆیەنسن لە شەو سۆر ف ١) بستە شد ٢) ناتوانی داماد در شب زفاف

**بەسێا** besiêa بەسێدا ف می‌بندد

**بەسیاس** besyas بەسریاس ف بستە شدە است

**بەسیاگ** besyag بەسیا ف بستە شدە

**بەش** beş ١) بەخش، لە ئەوستا (bej بەژ) و لە پەهلەوی (bexş بەخش) ئۆسریاس ٢) دابەش کردن «بەشبەشێەو کردن» ٣) پاژ، پارچە «دنیا چووار بەشە» ٤) لە تووانْ خوەم «بەش وە حاڵ خوەم کارْدان خەمە رێ» ٥) کەسێگ کْ تۆیەنێد مار و ئەقرەو بگرێد، لە مەزدیەسنا «بەشی، بوجی، هەشی» ناو بریایە کْ چمانێ ناوْ هۆها یا نەخوەشیێگە کْ پیایَ پاک هەگْ دەس وە داوانْ ئەمشاسپەندان و خودایل بوو لە ئافات و ئاتەشەیل و نەخوەشیەیل دۆرەو بوود، هەشی لە زووانْ کوردی وە مار ئۆشن ف ١) بخش، سهم، در اوستا (bej بژ) و در پهلوی (bexş بخش) نوشتە شدە ٢) تکەتکە کردن ٣) جزء، قسمت ٤) درحد توان خود ٥) کسیکە توانایی گرفتن مار و عقرب… را دارد، در مزدیسنا از «بشی، بـُجی، هشی» نام بردە شدە کە گویا نام دیو یا بیماری باشد و مرد پاک باتوسل بە امشاسپندان و ایزدان از بلیات وآفات و دیوان در امان خواهد بود،«هـَشی» در زبان کردی بە معنی مار است

**بەشاکردن** beşa kirdin بەشەو کردن ف تقسیم کردن

**بەشاکەر** beşa ker ئەو کەسە کْ چشتێ بەش کەێد ف مقسم

**بەشبردن** beş birdin لە ماڵێگ بەشێگ بردن ف سهم بردن

**بەشبەر** beş ber میرات گر ف وارث

**بەشبەش** beş beş لەت لەت ف پارەپارە، تکە تکە

**بەشبەشاکردن** beş beşa kirdin بەشبەشەو کردن ف قسمت قسمت کردن

**بەشبەشکردن** beş beş kirdin بەشبەشا کردن ف تکە تکە کردن، قسمت قسمت کردن

**بەشبەشەوکردن** beşbeşew kirdin بەشبەش کردن ف قسمت قسمت کردن

**بەشدار** beşdar ١) کەسێ کْ تۆیەنێ مار و ئەقرەو بگرێد ٢) خاوەن بەش ف ١) کسی کە توانایی گرفتن مار و عقرب… را دارد ٢) سهیم

**بەشداربۆن** beşdar bûn بەشێگ لە کارێگ ئەنجام داین ف قسمتی از کاری را انجام دادن

**بەشداری** beşdarî خاوەن بەش بۆن ف شرکت کردن

**بەشرەقان** beşreqan بەچرەقان، جەڕ نیمەڕوو ف گرمای شدید ظهر

**بەشقەرە** beşqere یەکێ لە ئێڵەیڵ چووین، گاهس بنەچەکێان وە (beşxure بەشخورە) یەکێ لە کورە زاگانْ کاوەێ ئاسنگەر و دامەزرێنەرْ دۆدمان گوودەرزیەیل بڕەسێد ف یکی از ایلات چوبین که شاید نسبشان به (beşxure بشخوره) یکی از نوادگان کاوه آهنگر و بنیانگذار دودمان گودرزیان برسد

**بەشکا** beşka بەشکم، گاهس ف شاید، گرفتیم که

**بەشکردن** beş kirdin ۱) بەشەو کردن ۲) ڕەسین، بەس کردن ۲) نەزرێگ کْ سەید ئاڵحەق دوواێ دەێدو «سەرپا» بەشێ کەێد ف ۱) تقسیم کردن ۲) کفایت کردن ۳) نذری که توسط سید اهل حق دعا داده شده و توسط «سرپا» تقسیم می‌شود

**بەشکم** beşkim بەڵکم، بەشکا ف شاید که…

**بەشکە** beşke دەسوور وە بەشەو کردن ف امر به تقسیم کردن

**بەشکەر** beşker بەشاکەر ف مقسم

**بەشکەم** beşkem ۱) بەشکم، بەشکا ۲) مْ بەشا کەم ف ۱) شاید که ۲) من تقسیم می‌کنم

**بەشگ** beşg بنووڕە ئانگوو ف شبنم، نگا **ئانگوو**

**بەشمشێرە** beşimşêre جوورێ چیخْ نەخشدارە ف نوعی «چیخ» نقشدار

**بەشەر** beşer بنیاێم ف بشر، آدم

**بەشی حەمەجان** beşî ĥeme can دیەکەێگە لە جووانڕو ف روستایی در جوانرود

**بەشیناوخاس** beşî nawxas دیەکەێگە لە جووانڕو ف نام روستایی در جوانرود

**بەقا** beqa باقی مەنین، ئەرەوییە ف بقاء

**بەقاڵ** beqaĺ چشت فرووش ف بقال

**بەقاڵ قنگ وسان** beqaĺ qinĝ wisan لاناوە لە فیس و من من «بەقاڵ قنگ لە لێ وساێە» ف کنایه از غرور و خود ستایی، طلبکارانه نگریستن

**بەقانن** beqanin دەنگْ بەقەبەق ف صدای بز

**بەقاوبەفا** beqaû befa هەراێ هەری ف بقاء و وفا

**بەقْبووڵ** beqi bûĺ دەنگْ کاوڕە نێر یا بزْن لە هەێن پەڕین ف صدای گوسفند یا بز نر هنگامی که به سن جفت خواهی رسیده باشد

**بەقبەقوو** beq beqû دەنگ کەمووتەر، لە زاراوەیڵ ترەکْ کوردی «گمەگم» و لە سەکزی «بەقور بەقور» ئۆشن ف صدای بق بقو کبوتر، در دیگر گویشهای کردی «گمه‌گم» و در سکزی «بَـقور بَقور» گویند

**بەقەم** beqem ۱) زێوردە ۲) کاڵ ۳) لاناوە لە بێ شەرت و پەێمان ف ۱) غلات رسیده ۲) کمرنگ، هر چیزی که زود کم رنگ شود ۳) کنایه از سست پیمان

**بەقیە** beqiye تەقەڵداین ف بخیه

**بەک** bek قوڕواک «گ» ف قورباغه، وک

**بەکرە** bekre قرقرە ف قرقره

**بەکرەلەبان** bekre le ban جوورێ تفەنگە ف نوعی تفنگ

**بەگ** beg ۱) گەورا، گەوراێ ئێڵ و ئایینی، لە ئەوستا (bege بەگە) نۆسریاس و لە لاتین (big) و لە دەسنۆسەیڵْ هەخامەنشی (beg بەغ) وە ماناێ خوداس و لە ئەوستا (begudate بەغوداتە) واتە «بەغداد» واتە «شوونەوارْ عەدڵ وداد» و لە پەهڵەوی (begubext بەغوبەخت) وە ماناێ کامەران لە بەخشایشت خودا نۆسریاس ولە تۆرکی «ئۆزبەگ، بەگتاش، بەێگم» ئۆشن ۲) پاشگرْ ناوە وە ماناێ گەورا ف ۱) بزرگ، بزرگ ایل یا بزرگ آیینی، در اوستا (bege بگه) نوشته شده و در لاتین (big) و در هخامنشی (beg بغ) به معنای خداست و در اوستا (bexúdate بغوداته) «بغداد» یا «محل عدل وداد» آمده و در پهلوی (begubext بغوبخت) به معنی بهروز از بخشایش ایزدان آمده و در ترکی «اوزبگ، بگتاش، بیگم» آمده ۲) بَـیگ

**بەگتاشی** begtaşî تاێفەێگ لە یارسان کْ هانە تۆرکیە و شەورەوی ف تیرای از یارسان در ترکیه و شوروی و تفاوتهایی با مردم یارسان ایران دارند

**بەگزادە** begzade ۱) بەگزاێە ۲) ناوێگە ژنانە ۳) دیەکەێگە لە ئارۆن ئاوا ف ۱) بیگزاده، خانزاده ۲) نامی زنانه ۳) روستایی از توابع اسلام آباد غرب

**بەگزاێە** begzaŷe بنووڕە بەگزادە ف نگا **بەگزادە**

**بەگڵ** begiĺ بەێەڵ، شاتییە ف خُرد شده‌ی کشک که آنرا با آب و خرما و روغن مخلوط کرده و از آن حلوا سازند

**بەگم** begim ۱) ناوێگە ژنانە ۲) سووکە ناو بەگە میر و… ۳) وشەێ حرمەت نان لە ئەرواو ف ۱) نامی زنانه ۲) مخفف بگ میر ۳) کلمه احترام به ارباب

**بەگی** begî سووکە ناو بەگمۆراد، بەگ مامەد ف مخفف بگمراد، بگمحمد

**بەل** bel ١) بڕن گووش لۆل ٢) دارالۆس ٣) زت، زتن ٤) دریژ «مل بەل، بەلە پا» ٥) تاوداینْ گون ف ١) بز گوش پیچیده ٢) آویزان ٣) برجسته ٤) بلند ٥) راست کردن آلت تناسلی

**بەلا** bela بێە لا ف کنار بزن

**بەڵا** beĺa بڵا، ئافەت ف بلا

**بەلابۊن** bela bün تاو داین ف راست کردن آلت تناسلی

**بەلادان** beladan تاو دان ف راست کردن آلت تناسلی

**بەڵاڕۊ** beĺa r̂ü گیاێگە خاردار ف گیاهی خاردار

**بەلا کردن** bela kirdin تاو داین ف راست کردن آلت تناسلی

**بەڵا گەردان** beĺa gerdan قەزا گر ف بلاگردان

**بەڵاڵۊک** beĺaĺük بڵاڵۊک ف آلبالوی وحشی

**بەڵامْک** beĺamik بنووڕە بڵاوک ف نگا **بڵاوک**

**بەلان** belan دۆیەتْ باڵغ و بازڕە ف دختر جوان و بالغ

**بەلانجی** belancî بنووڕە لامنجی ف نگا **لامنجی**

**بەلاوەتەرە** bela we terê دیەکەێگە لە چەرداوڕ ف نام روستایی در چرداول

**بەلاوەهشکە** bela we hişke دیەکەێگە لە چەرداوڕ ف روستایی در چرداول

**بەلبەلەکانی** belbelekanî شاخ جەنگْ کاوڕ، لاناوە لە دەرگیر بۊن ئەوڵ زەفتی رووژگار لە زاراوەیڵ ترەکْ کوردی « بەربەرەکانی» ئۆشن ف شاخ به شاخ شدن گوسفندان، کنایه از به جنگ مشکلات رفتن

**بەڵخ** beĺx تارمایی «هەوا بی وە بەڵخ، زەمین بی وە تووز - ئەۆ چۆ فیلەتەن یەی چۆ ئەشکەپووس - پاێ چەپ دانە گەز لە یەک چینە قین - تاجْ زەڕینێان تەمام بی وە خۆن» ف تاریکی محسوس، گرفتگی هوا

**بەڵشت** beĺişt دیەکەێگە لە بێڵەوار ف روستایی در بیله‌وار

**بەڵغەم** beĺxem ئاخْ تف ف بلغم

**بەڵقوو** beĺqû کوناێڵ هاو رەدیف لە قەێ پلە ئەڕاێ چفت کردن لە ناو یەک ف سوراخهای موازی در تیر اصلی پله چوبی جهت چفت کردن پایه‌ها درتیر اصلی

**بەڵکا** beĺka بەشکا، بەشکم ف بلکه

**بەڵکم** beĺkim بەشکم، لە کرمانی «بەلکەم» ئۆشن ف بلکه، شاید

**بەڵکە** beĺke بەڵکم ف بلکه

**بەلکینە** belikîne بەلگینە ف زبان کوچک

**بەلْگ** belig بەڵگەێ گووش ف نرمەی گوش

**بەڵگ** beĺg ١) پەڕەێ گوڵ ٢) وەڵنگ ٣) پەڕەێ قاقەز ف ١) گلبرگ ٢) برگ ٣) برگ کاغذ

**بەڵگە** beĺge ١) پەڕەێ قاقەز ٢) قەیسی ٣) بەلْگ ٤) ماکْ لۆت ف ١) برگ کاغذ، سند کاغذی ٢) قیسی ٣) نرمەی گوش ٤) غضروف بینی

**بەڵگەگرتن** beĺge girtin جەواز گرتن ف مجوز گرفتن

**بەڵگەێ گووش** beĺgeŷ gûş نەرمەێ گووش ف نرمەی گووش

**بەڵگەێ لۆت** beĺgeŷ lüt ماکْ لۆت کْ لۆتەوانە کەنە لێ ف غضروف بینی که «لۆتەوانە» به آن وصل می‌شود

**بەلگینە** beligîne بەلکینە ف زبان کوچک

**بەڵم** beĺm سرۆتْ مەنێ، کەێ ژەڵم، لە سمنانی (beĺm بەڵم) وە گیاێ هەرزە ئۆشن ف ساقه گندم و جو چند سال قبل، در گویش سمنانی (beĺm بلم) به گیاه هرز گویند

**بەڵمانە** beĺmane ١) یەکێ لە تیرەیڵ ئێڵ زەنگنە ٢) دیەکەێگە لە مایەشت ف ١) یکی از تیره‌های ایل زنگنه ٣) روستایی در مادیدشت

**بەڵمْدەو** beĺmi dew پەکڵەو ف شخص درشت اندام و بی غیرت

**بەڵموو** beĺmû پەکڵەو ف شخص درشت اندام و بی غیرت

**بەلۆ** belü بەڕۆ، بەلی ف بلوط

**بەلۆتنەک** belütinek بنووڕە پیکنە ف نگا **پیکنە**

**بەلۆچاڵ** belü çaĺ کۆیەێگە لە هلێران ف کوهی در هلیلان از توابع ایلام

**بەلۆچستان** belüçistan دیەکەێگە لە سۆنقۆر ف روستایی در سنقر

**بەلۆکە** belüke کورگە، لە زاراوەیڵ ترەکْ کوردی «میتکە، قیتکە، چوچەڵە، نێوەر، چیلکە» ئۆشن ف چوچوله، در دیگر گویشهای کردی «میتکە، قیتکە، چوچەڵە، نێوەر، چیلکە» گویند

**بەلە** bele ١) تاو دریاس، دارالۆسە ٢) بێە لە... ف ١) آویزان است ٢) بزن به....

**بەلەبزان** belebizan دیەکەێگە لە پاوە ف نام روستایی در پاوە

**بەلەبەل** bele bel دارالقوس ف آویزان

**بەلەپا** belepa تنرەو، پادریژ ف بادپا

**بەلەتن** beletin پەلەتنگ «ل» ف رسن بافته شده

**بەلەچە** beleçe ١) بەلەچەک ٢) بەلەمرک ٣) کەڵەبچە ٤) بەترێ ف ١) کدوی برش داده شده و خشک کرده ٢) آرنج ٣) دستبند ٤) لرزش در اثر سرما

**بەلەچەق** beleçeq بەلەمرک ف آرنج

**بەلەچەک** beleçek ١) بەلەچە ٢) لاناوە لە نێرینە ف ١) کدوی برش داده شده و خشک کرده ٢) کنایه از آلت تناسلی

**بەلەچەکردن** beleçe kirdin جەوشەنە کردن ف در اثر سرما لرزیدن

**بەڵەد** beĺed شارەزا، زانا ف راهنما، بلد

**بەڵەدی** beĺedî شارەزایی ف بلدی

**بەڵەدە** beĺede شارەزا، زانا ف راهنما

**بەلەریقە** belerîqe بەلەفیرە «ل» ف اسهال

**بەلەزووان** belezuwan ١) زێزْ بەسزووان ٢) بەلگینە ف ١) سلیطـه، پر حرف ٢) زبان کوچک

**بەلەسە** belese بنوورە بەلەفیشکە ف نگا **بەلە فیشکە**

**بەڵەفای** beĺefay ١) دیەکەێگە لە ماێەشت ٢) بەلەپا ف ١) روستای سید نقی در مادیدشت ٢) تیزپا، تندرو

**بەلەفیرە** belefîre بەلەریقە ف اسهال

**بەلەفیشکە** ١)belefîşke بەلەسە ٢) فەقارە ف ١) بیماری تسلسل ادرار ٢) فوران مایعات بویژە ادرار

**بەلەک** belek ١) بەلیەک ٢) سەونزەڕق ٣) لاناوە لە بێ ئەرزشت ف ١) گیاه شیرین بیان ٢) سبزه گون ٣) کنایه از بی ارزش

**بەلەکان** belekan بڵەکان، بڵکان ف نگا **بڵکان**

**بەلەکانْک** belekanik بۆ، باێەقوش ف جغد

**بەلەکەو** belekew دیەکەێگە لە ناودەروەن ف روستایی در ناودَروَن

**بەڵەگ** beĺeg بەڵەێ، بەڵەد ف بلد، بلده

**بەلەگوشە** belegûşe گیاێگە کْ وەڵنگەیلْ پیەنێ دێرێ و گوڵەیلْ چەرمێ ف گیاهی با برگهای پهن و گلهای سفید رنگ

**بەڵەم** beĺem کەڵەک ف قایق

**بەلەماچگ** belemaçig ١) بەلەماچە، بەلەماچێ ٢) بەلە مرک ف ١) ماهیچه ساق پا ٢) آرنج

**بەلەماچە** belemaçe بەلەماچێ ف ماهیچه ساق پا

**بەلەماچێ** belemaçê بەلەماچە ف ماهیچه ساق پا

**بەلەمرک** belemirk بەلەنیسک، بەلەنێر، قنگانیسک، کوڕ نیشک، قۆرانیک، ئارنج، مرک، نیسک ف آرنج

**بەلەنێر** belenêr ١) بەلەنیسک، بەلەمرک ٢) گیسکە نێر ف ١) آرنج ٢) بـُز نر

**بەلەنیسک** belenîsk بەلەمرک، قنگانیسک، نیسک ف آرنج

**بەلەوان** belewan دیەکەێگە لە سەرپیەڵ ف نام روستایی در سرپـُل ذهاب

**بەلەوەرەن** beleweren کەڵ کۆیەێ سێ ساڵە ف قوچ سه ساله

**بەڵەێ** beĺeŷ ١) ئەرێ، ئا ٢) شارەزا ف ١) بله ٢) دانستن، بلد، بلده

**بەڵەیە** beĺeŷe ١) بەڵەدە، شارەزا ٢) ئەۆ بەڵەدە ف ١) راهنما ٢) میداند

**بەلی** belî بەلۆ، بەڕۆ «ل» ف بلوط

**بەڵێ** beĺê بالەێ، ئەرێ ف آری، بله

**بە لێ** be lê دە لێ، بێە لێ ف او را بزن

**بەلیتْگ** belîtig بەلکینە، بەلگینە ف زبان کوچک

**بەلیچە** belîçe پەن، کارْ گەن ف کار ناشایست

**بەلیل** belîl جارچی ف جارچی، آنکه خبری را جار زند

**بەلیەک** belyek بەلەک ف گیاه شیرین بیان

**بەم** bem ١) مْ بەم «بەمەێ ماڵ» ٢) بەرندە بووم «لە لێ بەم» ٣) تەقەمەنی ٤) دەنگْ قەۆ ٥) بێەم «چەنێ بەمە پێد؟» ٦) بێەمە لێ «بەمە ناو گووشد » ف ١) میبرم ٢) برنده می‌شوم ٣) بمب ٤) صدای کلفت ٥) بدهم ٦) بزنم

**بەمبای** bembay هەلەلبشێو ف بامبول

**بەمڵەگووزان** beĺegûzan چنگەشێو، بشێو ف در هم و برهم

**بەموو** bemû کۆیەێگە لە دالاهوو ف کوهی‌در دالاهو

**بەمە پێ** beme pê بێەمە پێ ف به او بدهم

**بەمە لێ** beme lê بێەمە لێ ف او را بزنم

**بەن** ben ١) مەچیرێ کْ لە خوری یا مۆ درْس کریاس ٢) ئەوان بەن ٣) بەند، هەر چشتێ کْ ئەڕاێ بەسان بوو ٤) ئەمن

کردن، ئارام کردن «کەس بەنێ نییە کەیْد» ٥) ڕەزم «بەن بەنْ گیانم ژان کەێ» ٦) پەروار کردن «بگرەێ بەن» ٧) بەن خسن، هەڵگرتنْ مۆ دەم چەو ٨) زەنجیر، بەند، لە ئەوستا (bende بەندە) و (bend بەند) نۆسریاس ف ١) نخ ٢) می‌برند ٣) بند ٤) آرام کردن ٥) عضو بدن ٦) پروار کردن ٧) برداشتن موی زائد صورت ٨) بند، زنجیر، در اوستا (bende بنده) و (bend بند) نوشته شده

**بەنئەناز** ben enaz دەم چەو هەڵگر ف آرایشگر زنان

**بەنا** bena ئوسای مێعماری ف بنا

**بەنام** benam بەێ نام ف بدنام

**بەنامی** benamî بەێ نامی ف بدنامی

**بەنان** benan ١) ئەولْ خوەیانەو بەنەو ٢) لە لێان بەنەو ٣) پاشگرْ بەسان «یەخ بەنان، ڕێ بەنان» ٤) بێەنان ف ١) با خود می‌برند ٢) از آنها می برند ٣) هنگامە، عنفوان ٤) آنها را بدهید

**بەنایی** benayî کارْ بەنا، کارْ ئُساکار ساختمانی ف بنایی

**بەنبڕین** ben bir̂în ١) لاناوە لە بێ حرمەتی کردن ٢) درۆو وەتن ف ١) کنایە از بی حرمتی کردن در جمع ٢) دروغگویی

**بەنبوون** ben bûn بەنبۆن، نیشتەجی بۆن، مەنن ف ماندگار شدن، بند شدن

**بەنْبەقاو** beni beqaw هەێتْ هۆت ف تشریفات و بیا وبرو

**بەنْ جگەر** beni ciger لاناوە لە منالْ ف کنایە از فرزند

**بەنچین** bençîn بنیش «ل» ف بنشین

**بەنخسن** ben xisin مۆ هەڵگرتن ف آرایش کردن دختران

**بەند** bend زنان، زندان ف زندان، بند

**بەندان** bendan بەنان «یەخ بەندان» ف عنفوان

**بەندووش** bendûş جوورێ کووڵەپشتی ف نوعی کوله پشتی

**بەندووڵ** bendûĺ فەنەرْ ساتف پاندول ساعت

**بەندە** bende بەنە، بەشەر ف بندە

**بەندەر** bender ١) ناوێگە کوڕانە ٢) لەنگەرگا ف ١) نامی مردانه ٢) بندر

**بەندیخانە** bendîxane زندان ف زندان

**بەن سیمووکە** bensîmûke بنووڕە سیمووکە ف نگا **سیمووکە**

**بەنْ قەن** beni qen لاناوە لە بێ ئەرزشت ف کنایە از بی ارزش

**بەنکەشی** benkeşî پڕ کردنْ کەلْ کوناێ دیوار ف بندکشی کردن دیوار

**بەنکەڵەمە** ben keĺeme بەنێ کْ کەڵەمە وە پێ بەسنە ملْ گا ف بندی که با آن«کەڵەمە» را به گردن گاو بُنه می‌بندند

**بەنکیشی** benkîşî بنووڕە بەنکەشی ف نگا **به نکەشی**

**بەنگ** benĝ شادانە، لە ئەوستا (bengh بەنگە) نۆسریاس و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «بەنگڵە، بەنگڵەژ یلە» جوورێ گیاس ف گیاه بَنگ، در اوستا (bengh بنگە) نوشته شده که شاید همان بنگ باشد

**بەنگا** benĝa بەنگە، بەنێە، لە ئەوستا (vengh ڤەنگهـ) وە ماناێ جی گرتن، جی کردن نۆسریاس لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی«وەنگە: جیبەنێە» ئۆشنف سد، در اوستا (vengh ڤَنگهـ) به معنی جای گرفتن و جا کردن نوشته شده و در دیگر گویشهای کردی «وەنگە: جای سد» گویند

**بەنگڵ** benĝiĺ شاتیە، بنووڕە بەگڵ ف نگا **بەگڵ**

**بەنگە** benĝe بەنێە، بنووڕە بەنگا ف سد، نگا **بەنگا**

**بەنگەز** bengez بەنْ ئەنازە گرتنْ جووڵێا ف بندی که بافنده با آن بافتنی را اندازه می‌گیرد

**بەنْ گیان** beni giyan ١) لاناوە لە منالْ ٢) هاز و تووان ف ١) کنایە از فرزند ٢) توان، نیرو

**بەنْ گیان بڕیاێ** beni giyan bir̂îaê لاناوە لە ناتووان بۆن ف کنایە از ناتوانی

**بەنە** bene ١) بەندە ٢) بێەنە... «بەنە لێ » ف ١) بندە ٢) بزنید به...

**بەنەبنێ** bene binê مەڵوەن، سەبات ف منطقه

**بەنەری** benerî لانەماێ خەرێگەف نژاد نوعی‌الاغ

**بەنەنی** benenî دیەکەێگە لە ڕێژاو ف روستایی در ریجاب

**بەنی** benî ١) پەرواری ٢) زندانی ف ١) پرواری ٢) بندی، اسیر

**بەنیا** beniêa ١) بنووڕە بەنگا ٢) بەنەوەێ ٣) بێەنەوەێ ٤) ئەولْ خوەیانا بەنەو ف ١) نگا **بەنگا** ٢) از او می‌برند ٣) آنرا پس بدهید ٤) بر می‌گردانند

**بەنێرە** benêre ١) چەوەڕێ «ل» ٢) بنە... «ل» ف ١) چشم براه بودن ٢) بگذار به...

**بەنێرەگا** benêrega شوونْ چەوەڕێ مەنن ف ایستگاه،

محل انتظار

**بەنێە** beniŷe بەنگە، بنوورە بەنگا ف نگا **بەنگا**

**بەنیەقە** benyeqe میەرگێ کْ کەفێدە قەێ دۆ یەقە ف مهره زینتی روی جلیقه زنانه

**بەو** bew تْ بەو ف بیا

**بەۆ** beü وەۆ ف عروس

**بەوا** bewa بەورا ف برگرد

**بەوار** bewar فتوور هاتن «گ» ف نابودی، نیستی

**بەواسیر** bewasîr باوەسیر ف بواسیر

**بەوچێ** bewçê ئرا چە، ئەڕا، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «بۆ چێ» ئۆشن ف برای چه، چرا

**بەور** bewr ۱) بەورگ ۲) بەبر، لە سەکزی «بوۆر» وە سەگْ گەورا ئۆشن ۳) وەفر«گ» ف ۱) خاکستر ۲) ببر، در سکزی «بوۆر» به سگ گنده و بد هیبت گویند ۳) برف

**بەورا** bewra بەوا ف برگرد

**بەورۆل** bewrol دیەکەێگە لە جووانرۆ ف نام روستایی در جوانرود

**بەورەو** bewrew بەورا ف برگرد

**بەرەوا** bewrewa لەێ نوو بەورەو ف دوباره برگرد

**بەوش** bewş شایی، خوەشی ف شادی

**بەۆلکان** beülkan بەۆلە، وەیلکان، ویلکان، عەرووسان «ل» ف عروسک

**بەۆلە** beüle ۱) وەیلکان «ل» ۲) بەۆ ف ۱) عروسک ۲) عروس

**بەولی** bewlî ۱) دیەکەێگە لە سوومار ۲) هووزێگن لە کوردەیل ف ۱) روستایی در سومار ۲) تیره‌ای از کُردان

**بەون** bewn ۱) زڕوان، بائِر ۲) فره، فرەوان ۳) ناو هەێنْ زەۆ کْ گیاێ فرەێگ دێرێ ٤) زەۆ ئایش «ل» ف ۱) زمین بایر، تپه مانند ۲) فراوان ۳) مرز بین دو زمین کشاورزی که گیاه بسیار دارد و برای چرا مناسب است ٤) زمین آیش

**بەونی** bewnî فرەوانی، بڕبەونی، لە لاتین (abound) و (abundance) و (abundant) ئۆشن ف فراوانی، کثرت، در لاتین (abound) و (abundance) و (abundant) گویند

**بەوە** bewe ۱) بێەوە ۲) تْ بەوە ف ۱) پس‌بده ۲) بیا به

**بەهـ** beh ۱) وشەێ پەسەن کردن «بەهـ! چەنێ رەنگینە» ۲) وشەێ دژی و ناڕەزایەتی «بەهـ! یه کار بی کردی؟» ف ۱) حرف تعریف ۲) کلمه بیزاری

**بەهانە** behane وێانگ، دەسپچگ ف بهانه

**بەهبە** behbe بەخبەخ ف بەبە

**بەهرام** behram ۱) ناوێگە کوڕانە ۲) دیەکەێگە لە سۆنقۆر ف ۱) نامی مردانه، بهرام ۲) روستایی در سنقر

**بەهرام ئاباد** behram abad ۱) دیەکەێگە لە ئیلام ۲) دیەکەێگە لە بێڵەوار ۳) دیەکەێگە لە مێهران ف ۱) روستایی در ایلام ۲) روستایی در بیله‌وار ۳) روستایی در مهران

**بەهرامخانی** behram xanî دیەکەێگە لە بەدرەێ ئیلام ف روستایی در بدره‌ای ایلام

**بەهرە** behre ناف، قازاشت ف بهره

**بەهرەمەن** behremen خاوەن فایدە ف بهرمند

**بەهمەن** behmen ۱) ناوێگە کوڕانە، لە ئەوستا (men مەن) وە ماناێ ئەندیشەس و بەهمەن وە ماناێ نیک ئەندیشە ۲) مانگْ وەفرانوار، مانگْ یانزەهەم ئێرانی ف ۱) بهمن، در اوستا به معنی نیک اندیش نوشته شده ۲) ماه بهمن

**بەهمەنئاباد** behmen abad دیەکەێگە لە دەرە شارْ ئیلام ف روستایی در درّه‌شهر ایلام

**بەهەشت** beheşt بەهەیشت، لە ئەوستا (vehîşte ڤە هیشتە) و لە پەهلەوی (vehîşt ڤەهیشت) ئۆسریاس ف بهشت، دراوستا (vehîşte ڤەهیشتە) و در پهلوی (vehîşt ڤەهیشت) نوشته شده

**بەهەیشت** beheyşt بەهەشت ف بهشت

**بەێ** beŷ ۱) میوەێگە ۲) ئەۆ بەێد ۳) بەرندە بوود ٤) بەنامی «ئەی لەێ بەێە» ف ۱) میوه به ۲) می‌برد ۳) برنده می‌شود ٤) بد نامی

**بەی** bey ۱) بەید ۲) بەرندە بۆد ۳) دیەکەێگە لە ئیلام ف ۱) می‌بری ۲) برنده می‌شوی ۳) روستایی در ایلام

**بەیا** beya ۱) بەرەندە بۆدن ۲) بەیدا ف ۱) برنده می‌شوی ۲) پس می‌بری، بر می‌گردانی

**بەێا** beŷa ۱) بەرەندە بوودن ۲) بەێدا ف ۱) برنده می‌شود ۲) می‌برد، بر می‌گرداند

**بەێاخ** beŷax ۱) بەێداخ، ئاڵا، بنوورە بەێداخ ۲) چڵ، چۆزەرە ف ۱) پرچم، نگا **بەێداخ** ۲) جوانه، جوانه زدن

**بەێاخدار** beŷaxdar بەێداخدار، ئاڵاهەڵگر ف پرچم دار

**بەیاخە** beŷaxe بەیاخ، چۆزەرە ف جوانە، جوانه زدن

**بەیاخەکیشان** beŷaxe kîşan پەل وەشانن دار ف جوانه زدن، شاخ و برگ کشیدن

**بەیاز** beŷaz بیاز، هاماری ف دشت‌باز، زمین هموار

**بەیان** beŷan ١) گوڵ سوو ٢) بەیدان ف ١) بامداد ٢) آنها را می‌برد

**بەیانان** beŷanan شەوەکیان ف بامدادان

**بەیانەو** beŷanew ١) بەیدانەو ٢) ئەولْ خوەیا بەیدەو ف ١) از آنها می‌برد ٢) آنها را با خود می برد

**بەیانەو** beyanew ١) بەیدانەو ٢) ئەولْ خوەدەو بەیدەو ف ١) از آنها می‌بری ٢) با خود می‌بری؟

**بەیانی** beŷanî شەوەکی ف سپیده دم

**بەیبوون** beŷbûn گوڵێگە خوەشبوو ف گلی خوشبو و زیبا

**بەیت** beŷt مەتەڵێ کْ وە شێعرەو بۆشریەید ف داستان منظوم

**بەیتاڵ** beŷtaĺ بەیتەڵ، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «وەیتاڵ» ئۆشن ف دامپزشک، بیتار

**بەیتْمەشکە** beŷti meşke جووریْ لوورەس لە هەیْنْ مەشکە ژەنین خوەنن و چۆن وەلْ رمەیْ مەشکەوا قاتی بوو دیار نییە چە خوەنریەیْ، لاناوە لە وراوە وژاوەیْ بێخودی ف بیت مشک، کنایه از حرف بی خودی و بی معنی

**بەیتووئی** beŷtûiî ئێلێگە لە کرماشان ک کووچبەر بۆنەسە «قەزوین» و بەشێگیان لە بێلەوار نیشتە جیین ف ایلی در کرماشان که عمدتا به قزوین کوچانده شده‌اند و بخشی از آنان در روستاهای بیله‌وار ساکنند

**بەیتە** beŷte ١) ئەسپ یا خەرْ پیر کْ وێڵێ کردنە ٢) لاناوە لە بەتاڵ و دەسبێگار ف ١) اسب یا الاغ پیری که او را رها کرده‌اند و صاحب ندارد ٢) کنایه از طفیلی

**بەیتەڵ** beŷteĺ بەیتاڵ ف دامپزشک

**بەیتەڵ عەیو** beŷteĺ éêw تۆلەکی کردن ف به سخره گرفتن، مسخره کردن

**بەیتێ** beŷtê ١) بێە «ل» ٢) یەیْ بەیت ف ١) بده ٢) یک بیت

**بەیتێ بێنم** beŷtê bênim بێە پێم «ل» ف بده به من

**بەیچەڵ** beŷçeĺ ١) نەزووک، مەزووک ٢) ورگین ٣) چارەوایْ هەیْشەراتی ف ١) نازا ٢) بهانه‌گیر ٣) اسب یا قاطر جنونی

**بەید** beyd بنوورە بەی ف نگا **بەی**

**بەێد** beŷd بنوورە بەێ ف نگا **بەێ**

**بەیداخ** beŷdax بەیاخ، ئاڵا، لە رۆنە هەر ئێڵێ ئەرایْ خوەیْ نیشانی داشتێە کْ لە سەر داشتەمەنیەیلێ کوتاسە و چۆن ئاڵا هنْ کەسْ ناسێاریْ نەۆیە و هنْ نەتەوەیْ کورد بۆیە داخْ کەسێ لە سەریْ نەۆیە وەیْ بوونەوە وەپێ ئۆشن «بێداخ، بەیداخ» لە تۆرکەمەنی «بایداق» و«بایراک» و لە کرمانی «بیداغ» ئۆشن ف پرچم، اصل واژه به معنی «بی‌داغ» است در گذشته هر ایلی برای خود نشان ویژه‌ای داشته که بر روی وسایل مربوط به خود می‌زده و از آنجا که پرچم ویژه کس خاصی نبوده داغ ویژه‌ی کسی بر آن نیست از آن جهت آنرا «بی داغ» گویند، در گویش ترکمنی «بایداق» و «بایراک» و در کرمانی «بیداغ» گویند

**بەیداخدار** beŷdax dar ئاڵاهەڵگر، بەیاخدار ف پرچمدار

**بەیر** beŷr ١) بار «ل» ٢) بێز داینْ جۆجگەیل ٣) مانگا یا مییەێگ کْ شیر نیەێد ٤) خرۆ، فدا ٥) خێر، هۆرْم ف ١) بیاور ٢) مرغی که جوجه‌هایش را پرورش داده و از خود می‌راند ٣) گاو یا گوسفندی که به گوساله‌اش شیر نمی‌دهد ٤) نذر، به قربان، فدای ٥) خیر و برکت

**بەیڕ** beŷr̂ دەسوور وە درین ف امر به دریدن

**بەیرانن** beŷranin ١) بێز داینْ جۆجگەیل ٢) مانگاێگ کْ شیر وە گوورەگەیْ نییەێد ف ١) مرغی که جوجه‌های پرورش یافته‌ی خود را از خود می‌راند ٢) گاوی که به گوساله‌ی خود شیر نمی‌دهد

**بەیراوا** beŷrawa دیەکەێگە لە رەوانسەر ف نام روستایی در روانسر

**بەیرْگرد** beŷrigird دیەکەێگە لە هەمەیل ف روستایی در بخش حمیل از توابع اسلام آباد غرب

**بەیرەی** beyrey دیەکەێگە لە نزیکْ ئارۆن ئاوا کْ چیاخشت ها رۆیە رۆیْ ف روستایی در نزدیکی اسلام آباد غرب که « چیا خشت» از آثار باستانی دوران ماد در آنجاست

**بەیزە** beŷze بێزە، بێزْگ ف ویار

**بەیزەکردن** beŷze kirdin بێزە کردن ف ویار، ویار داشتن

**بەیسە** beyse زەوچنە، جەوشنە ف در اثر سرما لرزیدن

**بەیسەکردن** beyse kirdin جەوشنە کردن ف لرزش در

اثر سرما

**بەیشەرات** beŷşerat ١) شەوربەیێن «بەیشەراتیان بۆیەسە یەک...» ٢) هاز وتووان «چمانێ بەیشەراتم بەسایدە» ف ١) قول وقرار ٢) توانایی

**بەیشەرات بەسان** beŷşerat besan قەرار ناین ف انعقاد قرارداد

**بەیگر** beŷgir چەتە، دز ف راهزن، دزد

**بەیلەر** beŷler ١) سووکەناو بەگلەر ٢) یەێ دەورەێ دامداری ، لە سەکزی «بیل» وە مانایْ «جار، دەفە، نەوبە» ئۆشن ف ١) مخفف نام بیگلر ٢) یک دوره پرورش مرغ در مرغداری، در سکزی «بیل» به معنای «بار، دفعه، نوبت» گویند

**بەیلەرسووت** beŷlersût دلنگْ سەرانسەری کارگەرەیل، لە لاتین (biger suit) ئۆشن ف لباس سر تاپای کارگران، در لاتین (biger - suit) گویند

**بەیلەق** beŷleq لقووز، تانەو بەیلەق ف سرزنش

**بەیلەقدان** beŷleq dan لقووز دان ف سرزنش و طعنه زدن

**بەیم** beym ١) بەرەندە بۆمن ٢) بێەیمن ٣) ئەولا بەیمن ف ١) برنده می‌شویم، می‌بریم ٢) بدهیم ٣) با خود می‌بریم

**بەیمن** beymin بەیم ف نگا **بەیم** و ترکیباتش

**بەیێن** beŷn ١) ناوەێن، مابەێن ٢) لاناوە لە دووسی «بەیێنیان شێویاس» ٣) هنا، زەمان «لەێ بەیێنە فلانی هات» ف ١) بین، میان ٢) کنایه از دوستی ٣) زمان، هنگام

**بەین** beyn ١) ئۆیە بەینەو ٢) بەرندە بۆن ف ١) شما می‌برید ٢) برنده می‌شوید

**بەێ نامی** beŷnamy بەدنامی، بێنامی ف بد نامی

**بەیناوی** beŷnawî بەد ناوی، بەدنامی ف بدنامی، رسوایی ، رسوا شدن

**بەینْ بەس** beyni bes بەیشەرات ف پیمان، شرط و قرار

**بەینگرتن** beŷn girtin ١) ئەدلْ دای ٢) مابەینْ دۆ کەس یا دۆ ئێڵ وە یەک خسن ف ١) قضاوت کردن ٣) کسی که بین دو کس یا خانواده را آشتی می‌دهد

**بەێ نۆر** beŷnür بێ نۆر ف بدریخت

**بەینە** beyne بێەنە «بەینەێ فلانی» ف بدهید به...

**بەیێنە** beŷne هەیێنە، لەێ هەیێنە «لەێ بەیێنە سەرێ بێ کڵاو مەن» ف در این هنگامه، در این بین

**بەیێنەت** beŷnet بەفا، شەرتەیل درْس ف وفا

**بەیێنەتدار** beŷnetdar شەرتەیل تەمام ف با وفا

**بەینە پێ** beyne pê بێەنە پێ ف به او بدهید

**بەینە لێ** beyne lê بیەنە ف بزنید به...

**بە یەکا** be yeka ١) بێە یەکا، بشێوێن ٢) بجوور، دەسوور وە جوورسن ف ١) قاتی کن، امر به بر هم زدن ٢) تفتیش کن ، بگَرد

**بەیەڵ** beŷeł ١) بنوورە بەگڵ ٢) ئاڵشت کردن «ئەوەژْ بێەڵ» ف ١) نگا **بەگڵ** ٢) تعویض، معاوضه

**بێ** bê ١) کیشْ دۆیەمْ ئەلفبا ٢) بێجگە «بێ تْ ناخوەش» ٣) پێشگرْ نەداری «بێ ئەنوا» ف ١) حرف دوم الفبا ٢) بی، بدون، فاقد ٣) پسوند نداری

**بی** by بۆ، بوو ف بود

**بێئابرۆ** bêabrû بێشەرم، ئابرۆنەدار ف بی آبرو

**بێئارام** bê aram نائارام ف ناآرام

**بێئارامی** bê aramî بێتاقەتی ف ناآرامی

**بێئازار** bê azar ئارام، لە ئەوستا و پەهڵەوی (enazar ئەن ئازار) ئۆسریاس «ئەن: پێشگرْ نەفییە جوورْ ئەنە خورد» ف بی آزار، در اوستا و پهلوی (enazar ان آزار) نوشته شده و «ان پسوند نفی است و در واژه‌گان کردی مانند: انەزا، انەخورد»

**بێئاگا** bê aga بێخەوەر، نەزان ف ناآگاه

**بێئاورۆ** bê awrû بێشەرم ف بی آبرو

**بێئەخماز** bê exmaz بێچەو رۆ ف بی چشمرو

**بێئەدەو** bê edew بێ ئەخماز ف بی ادب

**بێئەدەوییە** bê edewîye بێدەوییە ف اصطلاح به معنی بی ادبی نباشد....

**بێئەنوا** bê enwa بێنەوا، نەدار ف بینوا

**بێئەوڵەت** bê ewłet بێەوڵەت، بێدەوڵەت، نەدار ف فقیر

**بێابەست** bêabast بەێن وبەست، بەیشەرات ف توافق، بین و بست کردن

**بیاتا** byata بۆیاتا ف نگا **بۆیاتا**

**بێار** bêar زێز عارف، تنەتەیوەت، بێ عار «سەوزە واشەگەێ خوەێ لە رێ لەقن- بێار وعارفْ بن کیسە تەکن» ف تندخو و بد دهن، بی عار و ننگ

**بێاز** bêaz بەێاز ف باز و گسترده

**بێازەیٚمل** bêazeŷ mil بلوورەیٚ مل ف نای گردن

**بێازی** bêazî هاماری، هاواری دەیشتْ واز ف زمین هموار و باز

**بێاشۆش** bêaşoş دیەکەێگە لە جووانرۆ ف نام روستایی در جوانرود

**بێاڵێ** bêaĺê نەباڵێ «بێاڵێ کورە...» ف اینگونه نیست که ...

**بیام** byam بۆیاتام ف می‌بودم

**بیامە** byame ١) بۆیاتامە... ٢) دیەکەێگە لە گاوارە ف ١) می‌شدم به... ٢) روستایی در گهواره

**بێان** bêan بەیان، شەوەکی زۆ ف بامداد

**بیان** byan بۆیان ف می‌بودند

**بێانگ** bêanig ویانگ، دەسپچگ ف بهانه

**بێاوان** bêawan ١) زروان، باێر ٢) پەرکام، تاسەو بردن ف ١) بیابان ٢) غش کردن، به بیماری صرع مبتلا بودن

**بێاوان‌بۆن** bêawan bün تاسەو بردن و کەف کڕانن ف غش کردن، رعشه بر اندام افتادن

**بێاێ** bêaê بایس، بایسەس ف شایسته است که، می‌بایست

**بیای** byaî بۆیای ف می‌بودی

**بیب** byb دید، بووقْ ماشین ف بوق ماشین

**بێباک** bêbak زاتدار، نەترس ف بیباک

**بێباوگ** bêbawg باوگ مردێ، لاناوە لە وەرەلا ف پدر مرده، کنایه از لاابالی

**بێبن** bê bin فرە قۆل، بێپەێ ف بسیار ژرف

**بێبوو** bê bû بێحاڵ وخەوەر ف کنایه از آدمی که کم گو و بیحال و خبر است

**بێبەخت** bê bext بەد رەژەن، سییەبەخت ف بد بخت

**بێبەر** bê ber ١) بێوەر ٢) بێنەتیجە ٣) ماینْ نەزووک ف ١) زحمت بسیار و بی حاصل ٢) بیثمر ٣) مادیان نازا

**بێبەش** bê beş بێبەهرە ف محروم از...

**بێپەێ** bê peŷ بێبن ف بسیار ژرف

**بێپیر** bê pîr لاناوە لە بێ دین ف کنایه از بیدین

**بێتاشا** bê taşa ١) راس و دڕس ٢) بێخووف ف ١) راستگو یانه، بی غل و غش ٢) بی‌ترس و هراس

**بێتام** bê tam ناخوەش ف بیمزه

**بێتاو** bê taw ١) ئاگرْ سەردْ سڕ ٢) بێقەرار ف ١) آتش سرد ٢) بی تاب، بیقرار

**بێتاوان** bê tawan بێخەتا ف بیگناه

**بیت‌بیت** bît bît تۆتۆ، بنوورە تۆتو ف نگا **تۆتو**

**بیت‌بیت کردن** bît bît kirdin تۆتۆ کردن ف نگا **تۆتو**

**بێتر** bêtir خاستر، لە لاتین (better) ئۆشن ف بهتر، در لاتین (better) گویند

**بێ تشک** bê tişk ترسوو، رخوو «ل» ف ترسو

**بێتۆ** bê to وە بێ تْ ف بی‌تو

**بێتوو** bê tû یەێرۆ «بێخوڵکْ توو» ف یکرو، صادق

**بێتووان** bê tuwan بێهاز، ناتووان ف ناتوان

**بێتووک** bê tûk ١) بێ پووس ٢) ناوێگە ژنانە ف ١) بی پوست ٢) نامی زنانه

**بێتەرەف** bê teref بێ لاین، بێداڵتە ف بی‌طرف

**بێتەقوور** bê teqûr بێ ئەنگەمە ف بی‌دغدغه

**بیج** bîc زووڵ، زووڵەزا ف حرامزاده

**بێجا** bêca ناوەجی ف بیجا

**بیجانە** bîcane دیەکەێگە لە کرماشان ف نام روستایی در کرماشان

**بێجگە** bêcge بێجلە، دۆجلە ف بجُز

**بێجگەلە** bêcge le بێجلە ف بجُز

**بێجلە** bêcle بێجگە ف بجز، بغیر از

**بێجنەوەن** bêcnewen دیەکەێگە لە چەرداوڕ ف روستایی در چرداول

**بێجەرگ** bêcerg رخوو، بێزات ف ترسو

**بێجی** bêcî بێجا، ناوەجی ف نابجا

**بێچارە** bêçare بەسزووان ف بیچاره

**بێچاورۆ** bêçaw rû بێ ئەخماز، بێچەورۆ ف بی چشم رو

**بیچک** bîçik بۆچگ «ل» ف کوچک

**بیچکلانە** bîçkiĺane بۆچگلانە «ل» ف کوچولو

**بێچنگْپەل** bêçingî pel بێدەسلات ف بی‌دست و پا

**بێچنگْچەیل** bêçingî çeîl بێچنگْ چیل ف بی دست و پا

**بێچنگْچیل** bêçingî çîl بێچنگْ پەل ف بی دست و پا

**بێچەپەر** bê çeper راساماڵ، بی یەک و دۆ ف بی واسطه

**بێچەکی** bêçekî نووشتێ کْ زۆتر لە واێە زایە ف گاوی که اولین زایمانش زودتر از موعد طبیعی است

**بێچەڵ** bêçeĺ بنوورە بەێچەڵ ف نگا **بەێچەڵ**

**بێحاڵ** bêhaĺ بێ هاز، ناتووان ف بیحال

**بێخ** bêx بن، ناخ ف بیخ

**بێخبڕ** bêx bir̂ لە بن گوردەوە برین ف ریشه کن کردن

**بێخود** bêxwid ١) ناوەجی ٢) لە هووش چین ف ١) بی خودی ٢) بیهوش شدن

**بێخود بۊن** bêxwid bün لە خوەێ چین ف مدهوش شدن

**بێخودی** bêxwidî ناوەجی ف بی‌خودی

**بێخوراک** bêxwirak بێ ژێرچەنە ف بی خوراک

**بێخوڵق** bêxwiĺq پەکەر، نەخوەش ف پکر، ناراحت

**بێخوڵک** bêxwiĺk بێخوڵق ف پکر

**بێخوڵکْ توو** bêxwiĺki tû ١) خوەشرۊ ٢) بێ رۊ دەر بایس ف ١) خوشرو ٢) بی رو در بایستی

**بێخەم** bêxem دڵ ئاسوودە ف آسوده خاطر

**بێخەو** bêxew نەخەفتن ف بیخواب

**بێخەوەر** bêxewer نائاگا ف بیخبر

**بێخەوش** bêxewş خوەڵس، بێ خەڵت وخەوش ف آلائیده ، صاف، بی‌غل وغلش

**بێخەوشە** bêxewşe ناوێگە ژنانە ف نامی دخترانه

**بید** bîd بۊد ف باشی، توباشی

**بێد** bêd دارْ ڤەی «ل» ف درخت بید

**بێداخ** bêdax بنووڕە بەێداخ ف نگا **بەێداخ**

**بیدگوڵ** bîd guĺ دیەکەێگە لە کرماشان ف نام روستایی در کرماشان

**بێدلێوە** bêd lêwe جووریێ دارْ ڤەی «ل» لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «شورەبەی» ئۆشن ف بید مجنون، در دیگر گویشهای کردی «شورەبەی» گویند

**بیدن** bîdin بۊدن ف باشی، توباشی

**بێداد** bêdad ١) هاوار لە زڵم ٢) دەیشتْ هەراق ف ١) بیداد ٢) دشت گسترده

**بێدگان** bê digan بێدنان، بێدێان ف بی‌دندان، کنایه از پیر

**بێدنان** bê dinan بێدێان، پیر ف بی‌دندان، مسن

**بێدەس** bêdes ١) کەم دەس ٢) بێدەسڵات ف ١) نیازمند ٢) ناتوان، بی‌پشتیبان

**بێدەسڵات** bê desiĺat ١) بێپەلام، ناچار ٢) بی پشتیوان ف ١) ناچار، ناگزیر ٢) بی پشتیبان

**بێدەسڵاتی** bêdesiĺatî لە رۊ ناچاری ف ناگزیری، ناچاری

**بێدەم** bêdem کەم رۊڕەگا ف خجالتی

**بێدەم وزووان** bêdem û zuwan ١) بێدەم ٢) لاناوە لە ناتووان «بێدەم و زووان کەفتێە» ف ١) خجالتی ٢) کنایه از ناتوان

**بێدەنگ** bêdenĝ ١) بێفزە ٢) ئارام ف ١) بی‌صدا ٢) آرام

**بێدەنگْ دووم** bêdenĝi dûm کرومات ف بی‌صدا، ساکت، آرام

**بێدەنگە** bêdenĝe جووریێ کەتەس، مەکەش ف نوعی کته از برنج

**بێدەنگی** bêdenĝî کرومات ف سکوت

**بێدەوی** bêdewî بێ ئەدەوی ف بی‌ادبی

**بێدەوییە** bêdewîye بێدەوی ف بی‌ادبی

**بێدێان** bêdiêan بێدگان ف بی‌دندان

**بێدین** bêdîn بێمەسەو، لامەسەو ف بیدین

**بێر** bêr ١) بەو «ل» ٢) بنووڕە بێرانن ف ١) بیا ٢) نگا **بەێرانن**

**بێرانن** bêranin بنووڕە بەێرانن ف نگا **بەێرانن**

**بێرانوەن** bêranwen دیەکەێگە لە کفراوڕ ف نام روستایی در کفراور در گیلانغرب

**بێ رۊ** bêr̂ü کەمڕۊ ف خجالتی

**بێ رۊڕەگا** bêr̂ü r̂ega کەمڕۊ ف خجالتی

**بێرە** bêre ١) بەوە «بێرە ماڵ» «گ» ٢) بارە «گ» ف ١) بیا ٢) بیاور

**بێڕەگ** bêr̂eg بێغیرەت ف بی‌غیرت

**بێڕەێ** bêr̂eŷ ١) بێ رەگ، بێ غیرەت ٢) بدْڕەێ، بدْڕ ف ١) بی غیرت ٢) امر به دریدن

**بێز** bêz ١) بێرانْ جۆجگەیل ٢) وە کلْ چەو داین «دامەێ بێزْ چەو» ٣) گوڕسێوڵ «بێزْ سێوڵ» ٤) وا داری «چْ بێزێ گرتێە» ٥) دەسوور وە دزین ف ١) مرغی که جوجه‌هایش را بزرگ کرده و از خود می‌راند ٢) زیر نظر داشتن ٣) سبیل تاب داده که نشان از سر حالی و سلامتی است ٤) مغرور شدن و دور برداشتن ٥) امر به دزدیدن

**بێزات** bêzat رخوو، بێجەرگ ف ترسو

**بێزار** bêzar ئاسی، ئاس بۊن ف بیزار

**بێزدان** bêzdan لێز دان [ف] مرغی که جوجەهایش را بزرگ کرده و از خود می‌راند

**بێزْ سێوڵ** bêzi sêwiĺ جەڕ سێوڵ دان [ف] تاب سبیل

**بێزْگ** bêzig بێزە، بەێزە [ف] ویار

**بێزگرتن** bêz girtin ١) لیز گرتن ٢) وادار بۆن [ف] ١) نگا **بێزدان** ٢) مغرور شدن و گندەگویی کردن

**بێزووان** bê zuwan ١) بەسزووان ٢) لاڵ ٣) بێ چنگْ پەل ٤) وشەێگ لە رق بەزەیی هاتن «وەێ بێزووانەگە...» [ف] ١) کنایە از حیوان زبان بستە ٢) الکن ٣) بی‌دست وپا ٤) کلمەای در مقام ترحم

**بێزە** bêze بەێزە، بێزْگ [ف] ویار

**بێزەل** bêzel کۆیەێگە لە شاخْ شمیرانْ قەسر [ف] کوهی در نزدیکی شاخ شمیران در قصرشیرین

**بێزێ** bêzê بێزە، بەێزە [ف] ویار

**بێژ** bêj ١) وێژ «ئارد بێژ» ٢) پێش «بێژ دێان، پێش دێان» ٣) بۆش «گ» [ف] ١) بیزندە ٢) پیشین ٣) گویندە

**بێژار** bêjar مارْ بێ‌سام [ف] ماری کە زهر ندارد

**بێژان** bêjan ١) بۆشان «گ» ٢) بێدەرد ٣) بوێژان [ف] ١) آنها را بگو ٢) بدون درد ٣) آنها را الک کن

**بێژدگان** bêjdigan پێش‌دێان [ف] نگا **بێژدێان**

**بێژدێان** bêjdiên دێانێ کْ لە ژێرْ دێانْ ترەک سەونز کەێد [ف] دندانی کە از زیر دندان دیگر رشد می‌کند

**بێژمار** bêjimar بێشمار [ف] بی شمار، بیحد

**بێ ژن** bêjin کوڕِ زبوورد [ف] مرد مجرد

**بێژنگ** bêjinĝ وێژنگ [ف] غربال

**بێژە** bêje بۆشە... «گ» [ف] بگو بە...

**بێژەنگ** bêjenĝ ١) بێ خڵت و خەوش، بێقووڕ ٢) ناوێگە کوڕانە [ف] ١) بدون زنگ زدگی ٢) نامی مردانە

**بیس** bîs ژمارەێ بیستم [ف] عدد بیست

**بێسامان** bêsaman نەدار، لات [ف] کنایە از فقیر

**بێساو** bêsaw وەرەلا [ف] لاابالی، بی صاحب

**بێسایەومایە** bêsaŷe û maŷe بێ ئەرزشت «دنیاێ هوچْ پۆچ بێ سایەومایە ـ ئەوڵە ئەو کەسە وەێ دنیا شایە» [ف] بی ارزش

**بیسْپەنج** bîsi penc ١) ژمارەێ کیشمانەێگە ٢) ژمارەێ بیس و پەنج [ف] ١) واحد وزنی است معادل صد و هفتاد و پنج گرم ٢) عدد بیست و پنج

**بێستون** bêsêtün ١) کۆیەێ بێستون لە کرماشان، لە بنەڕەتەو «بەغستان» و ئێکە بۆیەسە «بەهستان» و ئێرە بێستونە ٢) دیەکەێگە لە چەمچەماڵ سەحنە [ف] ١) کوه افسانەای بیستون در کرماشان، در گذشتە «بغستان» بودە و سپس «بهستان» و اکنون بیستون است ٢) روستایی در چمچمال صحنە

**بێسکە** bê sike بەێ تۆر [ف] بد ریخت، بی‌رازش

**بێسوو** bêsû ١) چەوْ کەم بڕشت ٢) بێ کونا [ف] ١) چشم کم سو ٢) بدون سوراخ

**بێسووائێ** bêsuwaê بێجگە، بێجلە، جگە«بێ سوواێ خوەم پەنج کەسیم» [ف] بدون احتساب

**بێسەر** bêser سەرنەدار [ف] بدون سر

**بێسەرْبن** bê seri bin بەملەگووزی [ف] درهم و بر هم

**بێ سەرْپا** bêseri pa لات، وەرەلا [ف] بی سر و پا، لاابالی

**بێسەرْ زووان** bêseri zuwan بێدەم و زووان [ف] خجالتی ، کم گو

**بێ سەرْ سدا** bê seri sida بێدەنگْ دووم [ف] بی سر و صدا

**بێ سەرْ سەودا** bêseri sewda بێدەنگْ دووم [ف] ساکت، خاموش

**بێ سەرْ شوون** bêseri şûn بێ سەر وشوون، بێ شوونْ نوون [ف] بدون رد و نشانەای

**بێسەوائێ** bêsewaê ١) بێجگە ٢) تاتەنانەت «بێ سەواێ! تنیش بۆد» [ف] ١) بجُز، بدون احتساب ٢) نگا **تاتەنانەت**

**بێشک** bêşk گافارە«دارْ بێشکەگەد، دارْ خڕنووکە- خوازمەنی کەرْد پاشاێ کەرکووکە» [ف] گهوارە، للو

**بێشمار** bêşimar بێژمار [ف] بیشمار

**بێشوون** bêşûn بێ شوونْ نوون [ف] بی رد و اثر

**بێ شوونْ نوون** bêşûni nûn بێ شوون و نیشان [ف] بی رد و نشان

**بێشە** bêşe وێشە [ف] بیشە

**بێشەرم** bêşerm بێ ئاوڕۆ [ف] بی حیا

**بێشەلان** bêşelan وێشەلان [ف] بیشەزار

**بیشی** bîşî دیەکەێگە لە هووزمانەوەن [ف] نام روستایی در هوزمانان

**بێشی** bêşî ۱) بێ وەی، ئازا ۲) سەرسەری [ف] ۱) با سلامتی کامل، بی دغدغه ۲) سطحی، جزئی

**بێشیر** bê şîr ئاژەڵ وشک کردێ [ف] حشم بدون شیر

**بێعار** bê ár بێشەرم [ف] بی حیا، بی شرم

**بێفەڕ** bê fer̂ بێ نوڕ، بەێ نوڕ [ف] بدفر، بدگل

**بێفزه** bê fize بێ کرچه [ف] بدون کمترین صدا

**بیڤ** bîv تڕ، گووز [ف] باد معده

**بیڤْ باڤ** bîvi bav لاناوه له بەرچەک بەرچەک کردن [ف] کنایه از تهدید تو خالی

**بیڤ له لێ بڕیان** bîv le lê bir̂yan وا کردن، پەنەمێان [ف] باد کردن، ورم کردن

**بیق** bîq ۱) دڕْگ ۲) دەنگْ نازک [ف] ۱) خار ۲) صدای نازک

**بیقْ باق** bîqi baq قرمْقاڵ [ف] همهمه

**بێقوشقن** bê qwişqin بێ تەقوور [ف] بی درد سر، بی سر و صدا

**بێقەزا** bêqeza بێمزڕەت «بێقەزا کەێ چیدەو؟ » [ف] به سلامتی

**بێکار** bêkar کار نەکەر [ف] بیکار

**بێکاربەتاڵ** bêkar betaĺ بێکار [ف] بیکار وناامید

**بێکاره** bêkare وڵگه، چەتاڵ [ف] بیکاره

**بێکاری** bêkarî بەتاڵی [ف] بیکاری

**بێکرچه** bê kirçe بێفزه [ف] بی سر و صدا

**بیکنه** bîkne بنووڕە پیکنه [ف] نگا **پیکنه**

**بیکنەوبلوور** bîkine û bilûr پیکنه و بلوور [ف] نی لبک

**بێکەس** bêkes تەنیا، بێ هامێار [ف] تنها و بی کس

**بێکەسی** bêkesî تەنیایی [ف] بی کسی

**بێگار** bêgar ۱) بێکار ۲) کارێگ نیاشتن «بیلا دەسم بێگار بوود ئەوسا تییەم» ۳) خالی بۆن «دێکەگه بێگار که بووەمەوەێ» [ف] ۱) بیکار ۲) از مشغله کاری خلاص شدن ۳) خالی

**بێگار بۆن** bêgar bün ۱) له کارێگ چاکر بۆن ۲) خالی بۆن [ف] ۱) از کاری رهایی یافتن، بیکار شدن ۲) خالی شدن

**بێگارپاپەتی** bêgar pa petî بێکاره، وڵگەێ سەرْ خەرمان [ف] بیکارەی الکی خوش

**بێگاری** bêgarî کارْ بێوەلیفەت [ف] بیگاری

**بێگانه** bêgane خاوارە، له پەهلەوی (bêganek بێگانەک) و (bêganîk بێگانیک) تۆسریاس [ف] بیگانه، در پهلوی ( bêganek بیگانـَک) و (bêganîk بیگانیک) نوشته شده

**بێگورد** bêgwird بێهووش، سەرمەس [ف] بیهووش

**بێگەرد** bêgerd بێ خەوش [ف] بیگرد، صفتی برای طلاجات ، زیورآلات ناب

**بێگەزاف** bêgezaf بێ وەر، بێ بەهرە [ف] بی بهره

**بێگەزاڵ** bêgezaĺ ۱) بنووڕە چەتاڵ ۲) ئایمْ بێمزڕەت [ف] ۱) نگا **چەتاڵ** ۲) آدم مفید

**بێڵ** bêĺ ۱) پێمەره، له پەهلەوی (bêĺ بێڵ) و (vîlek ڤیلەک) تۆسریاس ۲) خوڵەکوو [ف] ۱) بیل، در پهلوی (bêĺ بیل) و (vîlek ڤیلەک) نوشته شده ۲) خاکستر

**بیل** bîl ۱) بیلا، بیلەو ۲) قوڕ، خەڕێ سییەێ دەورْ چەم [ف] ۱) بگذار، بهل ۲) گل سیاه رنگ حاشیەی باتلاق

**بیلْ بژنەو** bîli bijnew ۱) بگوو ئەژنەو ۲) ئایمْ سەخونفام [ف] ۱) حرف شنو، گوشگیر ۲) آدم با درک و فهم، متذوق

**بیلا** bîla بیلەو، بیل [ف] مهلت بده، بگذار

**بێلانه** bêlane بێ ئەنوا، بێ ماڵ [ف] بی آشیانه، کنایه از آواره

**بیلانەراو** bîlane r̂aw مووڵەتیان بێه [ف] به آنها مهلت بده

**بیلاو** bîlaw بیلا، بیلەو [ف] مهلت بده

**بیلْ بانان** bîli banan بیل [ف] گل سیاه رنگ

**بێڵچه** bêĺçe بێڵ بۆچگ [ف] بیلچه

**بێڵکار** bêĺkar مزوْر کارامه [ف] کارگر ماهر

**بێڵکاری** bêĺkarî ژێرْ رو کردنْ زەۆ [ف] بیل کاری کردن

**بێڵکوو** bêĺkû خوڵەکووان «ل» [ف] جایی که خاکستر اجاق را در آن می‌ریزند

**بیلکوڵانن** bîl kwiĺanin ۱) کووسْ ناهمێدی کوتان ۲) کارْ بێ سەمەر [ف] ۱) از نا امیدی دم زدن ۲) کار بیهوده وبی ثمر انجام دادن«بیل کولانن » به معنی گـِل جوشاندن است، همتای آب درهاون کوفتن

**بیله** bîle بنه، بنەرەێ «بیله ماڵ ئیمه» [ف] بگذار به ...

**بیلەڕاو** bîle r̂aw مووڵەت بێه [ف] مهلت بده، فرصتی بده

**بێڵەتاو** bêĺe taw باخ و سراوێگه رەنگین له جووانڕوو [ف] منـطقه‌ای زیبا وخوش آب وهوا در شهر جوانرود

**بێڵەکان** bêĺekan بنووڕە بڵکان [ف] نگا **بڵکان**

**بێڵەکوو** bêĺekû ۱) بڵکان «ل» ۲) بێڵکوو «ل» [ف] ۱)

چوبی که با آن کنگر و پیازهای خوراکی را می‌کنند ۲) نگا **بێڵکوو**

**بێڵەمڕ** bêĺemir̂ ژیلەمڕ ف خاکستر گرم اجاق

**بیلەو** bîlew ۱) گلەو بێە ۲) بووسیەڕاو ف ۱) پیش خود نگهدار، حفظ کن ۲) مهلت بده

**بێڵەوار** bêĺewar بەشێکە گەورا لە کرماشان ف دهستانی شامل چند روستا در حومه کرماشان

**بیلەو ڕاو** bîlew r̂aw بیلەڕاو ف مهلت بده

**بیلەوە** bîlewe بنووڕە بیلەو ف نگا **بیلەو**

**بێڵەهوو** bêĺehû دیەکەێگە لە گاوارە ف نام روستایی در گهواره

**بێڵەهەڕ** bêĺeher̂ کەمە و بێڵەهەڕ ف گیاهی از تیره‌ی کرفسیان که بصورت وحشی در ارتفاعات می‌روید

**بێڵەیی** bêĺeyî دیەکەێگە لە جووانڕو ف نام روستایی در جوانرود

**بێڵێار** bêĺêar بێڵکارْ خاس ف بیل زن خوب، کارگر ماهر

**بیم** bîm ۱) رخ ۲) بۆم ۳) زەۆ نەخت ٤) کاڵ «بیم زەرد»، لە فەرانسەی (bleme) وەێ ماناسە ف ۱) ترس ۲) بودم ۳) زمین پُرنعمت ٤) کم رنگ، در فرانسوی (bleme) به معنی زرد رنگ است

**بیمار** bîmar ۱) نەخوەش، مار وە ماناێ سەڵامەتی و ئەسەکامەتییە ۲) کویەێگە لە هۆکیەنی ف ۱) بیمار ۲) کوهی در روستای «هۆکیەنی» از توابع اسلام آباد غرب

**بیمارسان** bîmarisan نەخوەشخانە ف بیمارستان

**بیماری** bîmarî نەخوەشی ف بیماری

**بێ مدوو** bê midû بێهۆ ف بی دلیل

**بێ مدووم** bê midûm بێمدوو ف بی دلیل

**بیمزەرد** bîmzerd زەردووڵ ف نگا **زەردووڵ**

**بێمزڕەت** bê mizir̂et وە سڵامەت ف به سلامتی بدون مضرت

**بێ مشتێ** bêmiştê ئایمْ ناموتمەئن، نامشتێ ف غیر قابل اعتماد

**بیمە** bîme بۆمە، بوومە ف بوده‌ام

**بێمەسەو** bêmesew لامەسەو ف بی دین

**بیمن** bîmin بۆمن، ئیمە بۆمن ف بوده‌ایم

**بیمنە** bîmine بۆمنە، ئیمە بۆمنە ف بوده‌ایم

**بێمەنەسْب** bêmenesib بێ مدووم «بێ مەنەسْب نیە هەر تێد و چوود» ف بی دلیل

**بێمێارا** bê mêara بێ تاشا، بێ ترس ف بی ترس و لرز، بیخوف

**بین** bîn بۆن، ئەوان بۆن، لە لاتین (being) ئۆشن ف بودن، بوده‌اند، در لاتین (being) به معنای بودن است

**بینا** bîna چەو تێژ ف بینا

**بێناز** bênaz بێ خەمخوەر ف بیناز، بی غمخوار

**بێنامە** bêname لاناوە لە مار «ل» ف کنایه از مار

**بێنامی** bênamî بەنامی، بەێ نامی ف بد نامی

**بێناو** bênaw کەس نەناس ف گمنام، ناشناس

**بێناوک** bênawk بێ دانە ف بی دانه

**بێناوە** bênawe سنان، شێرپەنجە ف سرطان

**بینایچاوان** bînay çawan لاناوە لە ئەزیزْ گیانی، تۆرْ چەوەیل ف بینایی دیده، کنایه از گرامی

**بینایی** bînayî چەو تێژی ف بینایی

**بێنْت** bênit وە تْ، ئەڕاێ تْ «ل» ف به تو، برای تو

**بێنتو** bêntû وە تۆیە، ئەڕاێ تۆیە «ل» ف به‌شما

**بێنز** bê niz ۱) لەڕ، زاێف ۲) بێ گیان، لە سەکزی «بێ نەزگ» ئۆشن ف ۱) نزار، لاغر ۲) بیحال، ضعیف، در گویش سکزی «بی‌نَزگ» گویند

**بێنزە** bê nize بێفزە، بێدەنگ ف بی سر و صدا

**بینگ** bînĝ تڕ، گووز ف صدای باد معده

**بینْگ** bînig گزینْگ، دۆیەتی چەو ف مردمک چشم

**بێنْم** bênim ۱) وەمْ، ئەڕاێ مْ «ل» ۲) سیەتای بێ نم ف ۱) به من، برای من ۲) بیماری تب سیاه

**بێنمازی** bê nimazî عادەتْ مانگانەێ ژنەیل ف خون حیض، قاعدگی

**بێنمو** bênmû وە ئیمە، ئەڕاێ ئیمە «ل» ف به ما، برای ما

**بێمن وتۆ** bê min û to بێ رۆ دەربایس ف بی تعارف و تکلف

**بێ نۆر** bê nür بنووڕە بەێ نۆر ف نگا **بەێ نۆر**

**بێنۆزە** bê nüze بنووڕە بێکرچە ف نگا **بێکرچە**

**بێنون** bênon وە ئەوان، ئەڕاێ ئەوان «ل» ف به آنها، برای آنها

**بێ‌نوُن** bê nûn بێ شوون ونوون ف بدون هیچ نشانه‌ای، مفقود

**بینه** bîne بۆنه، ئه‌وان بۆنه ف بوده‌اند

**بێنه‌ر** bêner ١) بێکه‌مه، بێ کماره ٢) دیه‌که‌یگه له گاواره ف ١) بی لبه ٢) روستایی در گهواره

**بینه‌ک** bînek بینگ «ل» ف مردمک چشم

**بێنێ** bênê وه ئه‌ۆ، ئرا ئه‌ۆ «ل» ف به او، برای او

**بێنیاز** bê niyaz گۆهرد، مسنه‌وه‌ن ف دارا، بی‌نیاز

**بێواز** bê waz بێ وینه، بێ مانه‌ن «گ» ف بی نظیر، بی بدیل

**بێ وچان** bê wiçan یه‌ێ پشت ف پیدرپی، بی وقفه

**بێ وژدان** bê wijdan بێ وێژدان، خودا نه‌ناس ف بی وجدان

**بێوڵه** bêuĺe دیه‌که‌یگه له جووانرۆ ف روستایی در جوانرود

**بیوه** bîwe بێ شۆ، ژنْ شۆ مردێ ف بیوه

**بێوه‌ج** bêwec بێ به‌رجه‌وه‌ن، وه ده‌رد نه‌خوه‌ر «ل» ف بدرد نخور

**بێوه‌خت** bêwext نه‌وه‌خت، نامه‌وق ف نابهنگام

**بێوه‌ر** bêwer زامه‌تْ فره‌وان و بێوه‌لیفه‌ت، له ئه‌وستا (ebeŷvere به‌ێڤه‌ره) و (beîverê به‌ئیڤه‌رێ) واته ده‌هـ هزار و له په‌هلَه‌وی (epêbehr ئه‌پێ‌به‌هر) وه مانای بێ مه‌نفه‌ت نۆسریاس، زامه‌تێگک به‌رجه‌وه‌نێ نییه «بێ + وه‌ر» ف رنج و تلاش فراوان اما بی نتیجه، در اوستا (beivere بیور) و (beîverê بئیور) به معنی ده هزار و در پهلوی (epê behr اپیبهر) یعنی بی بهره و بی نتیجه نوشته‌شده، زحمتی که نتیجه ندارد «بی = پیشوند نفی+ ور = بهره»

**بێوه‌ری** bêwerî خافڵ ف غافل، کسی که در باغ نیست

**بیوه‌ژن** bîwe jin شۆ مردێ ف بیوه‌زن

**بیوه‌ژن‌کوشی** bîwe jin kwişî لاناوه له هه‌ژاری کیشان و ئێوه‌ت کردنْ یه‌تیمه‌یل ف کنایه از بیوه زنی که رنج و فقر را تحمل کرده و یتیمها را بزرگ می‌کند

**بێوه‌لیفه‌ت** bê welîfet بێ پاداشت، بێ ده‌ساوه ف بی نتیجه

**بێوه‌ن** bêwen دیه‌که‌یگه له جووانرۆ ف نام روستایی در جوانرود

**بیوه‌نیج** bîwenîc مه‌ڵوه‌نێگه له ناوچه‌ێ گووران ف منطقه‌ای در گوران

**بێوه‌ێ** bêweŷ بێگه‌زاڵ ف بی آزار

**بێ‌وێژدان** bê wêjdan بێ وژدان، خودا نه‌ناس ف بی وجدان

**بێ‌وێنه** bêwêne بێ وینه، بێ هاوتا ف بی مانند

**بێویانی** bêwyanî دیه‌که‌یگه له سه‌رپیه‌ڵ ف نام روستایی در سرپل ذهاب

**بێ‌هاوتا** bê hawta بێ وێنه ف بی مانند

**بێ هه‌ره‌چ** bê hereç بێ مه‌ربووت ف نامربوط، بی ربط

**بێ‌هه‌ۆلا** bê heüla بێ ئختێار «بێ هه‌ۆلا هاته رام» ف بی اختیار

**بێ‌هه‌وه‌لا** bê hewela بێ تاشتا، بێ ئختێار ف بی اختیار

**بیه** bye بۆیه، ئه‌ۆ بۆیه ف بوده، او بوده است

**بێه** bŷe تْ بێه ف بده، تو بده

**بێه‌ر** bŷer ئه‌وه‌ێ کْ ده‌یێد ف مفعول

**بێه‌را** bŷera بێه‌ره‌و ف پس بده

**بێه‌ران** bŷeran ئه‌وانه بێه‌را ف آنها را بده

**بێه‌رانا** bŷerana به‌رانا ف نگا **به‌رنا** و ترکیباتش

**بێه‌رانه** bŷerane ئه‌وانه بێه...ف آنها را بده به....

**بێه‌رانه‌و** bŷeranew به‌رانه‌و ف آنها را برگردان

**بێه‌رانه‌ێ** bŷeraneŷ ئه‌وانه بێه‌ره... ف آنها را بده به...

**بێه‌ره‌و** bŷerew بێه‌را ف پس بده

**بێه‌ره‌وه‌ێ** bŷereweŷ ئه‌وه بێه‌ره‌و ف آن را بر گردان، پس بده

**بێه‌ره‌ێ** bŷereŷ ئه‌وه بێه ف آنرا بده

**بێه‌م** bŷem مْ به‌مه‌و ف بدهم

**بێه‌ن** bŷen ئۆیه بێه‌ن ف بدهید

**بێه‌وه‌لیسکه** bŷewelîske یه‌والیسکه، زێزْ زه‌ۆ نه‌خت، زه‌ۆ گه‌راڵ و زایف ف زمین غیر حاصل‌خیز و نا مرغوب

**بێ‌هاز** bê haz بێ تاوشت، بێ توان ف ناتوان

**بێ‌هڵم** bê hiĺm ئائێم یاحرامی بێ چه‌و رۆ ف انسان یا سگ بی چشم و رو

**بێهوو** bêhû بێهووده ف بی سبب، بیهوده

**بێهووده** bêhûde بێهوو ف بیهوده

**بێهووش** bêhûş بێگورد ف مدهوش

**بێه‌یم** bŷeym ١) بێه‌یمن ٢) کله‌و بکه‌یمن ف ١) بدهیم ٢)

# پ

**پا** pa ۱) قاچ ۲) بەرابەر «پا وە پام هات» ۳) هەێرنگە «وەیٚ پا هات و وەوەکە چی» ٤) لە ملْ، لە عوودەیٚ «ها پایٚ تْ» ٥) بن، خوار «لە پایٚ دیواران» ٦) پاک کردن «بشوورەیٚ تا پا بوود» ۷) شتویەڵەیٚ چراخ «پایٚ بە خوار» ۸) بنچینە، بنەما «ئی وەرەیلە پایان بیل، شایان بفرووش» ۹) زێزْ سەر کردن «گولەگە پا کرد» ف ۱) پا ۲) برابر ۳) همین الان ٤) برگردن ِ، بر عهدەی ٥) پایین، بُن ٦) پاک کردن ۷) تنظیم شعله چراغ ۸) بُنه، پایه ۹) به پایین هدف خوردن

**پائەوشار** pa ewşar پاچاڵ ژێرْ پایٚ جوولێا ف پای افشار، ویژه جولاهی

**پائێز** paıêz وەرزْ سێەمْ ساڵ ف پاییز

**پائێزان** paıêzan هەنهەنْ پایز، پایزەڕووژ ف موسم پاییز

**پائێزە** paıêze تویەمیٚ کْ لە پائیز بخەنەیٚ ف بذری که در پاییز کاشته شود

**پائێزەبرا** paıêze bira بنووڕە پایزەبرا ف نگا **پایزەبرا**

**پائێزەپڵە** paıêze piĺe وارانْ پەڵە، پەڵە ف باران پاییزی

**پائێمام** pa ıêmam دیەکەێگە لە ناودەروەن ف روستایی در ناودَروَن

**پابڕان** pa biȓan هاتوچوو نەکردن، پابڕین ف آمد و شد نکردن

**پابریک** pabirîk فابریک ف فابریک

**پابڕین** pa biȓîn هاتوچوو نەکردن ف آمد و شد نکردن

**پابڵێن** pa biĺên پایار، پایەر ف پابرجا و بلند قامت بمانی

**پابەس** pabes لاناوە لە گیروودەیی ف اسارت، پایبندی

**پابەن** paben پابەس ف پایبند

**پابەۆ** pabeü پاوەۆ «ل» ف ینگه

**پابێڵ** pabêĺ بڕشتْ یەیٚ پامەرە ف برش یکبار بیل زدن

**پاپاکردن** papa kirdin ۱) پاوپا کردن ۲) پا گرتنْ مناڵ ف ۱) دو دلی وتاخیر کردن ۲) پا گرفتن نوزاد

**پاپرتووک** pa pirtûk پاپریک «ل» ف پروانه

**پاپریک** papirîk پەپۆلە «ل» ف پروانه

**پاپووش** papûş ۱) بخت ۲) شووالْ، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «پانتوڵ» و لە سەکزی «پاتلو» لە لارستانی «پاتلون» لە لاتین (pantaloon) لە فرانسەی (pantalon) ئۆشن ف ۱) تهمت، پاپوش ۲) شلوار، دردیگر گویشهای کردی «پانتوڵ» و در سکزی «پاتلو» و در لارستانی «پاتلون» و در لاتین (pantaloon) و در فرانسه (pantalon) گویند

**پاپەتی** pa petî ۱) پایٚ بیٚ پێڵا ۲) لاناوە لە نەدار ف ۱) پا برهنه ۲) کنایه از ندار

**پاپەل** pa pel ۱) بنگلا ۲) پڕوپا «پا پەلیٚ بشوور» ف ۱) برگ زیرین ۲) پاها

**پاپەیٚ** pa peŷ حەواڵگر، مینەکەر ف خواهان و طالب

**پاپەیٚ بۆن** papeŷ bün وە شوونْ چشتێگەو چین ف پا پی شدن

**پاپی** papî ۱) تیرەێگ لە لوڕەیل، گاهس بنچەکیان وە ئەردەشێرْ پاپکان برەسێد، پاپکانبەشێگ لە ئووردی بۆنە ۲) ناوێگە کوڕانە ف ۱) تیره‌ای از ایلات لرستان، شاید ریشه آنها به اردشیر پاپکان سرسلسله ساسانیان برسد، در ضمن پاپکان قسمتی از پیاده نظام بوده‌اند ۲) نامی مردانه

**پاپێا** pa pêa پیادە، زێزْ سووارە ف پیاده

**پاپیا** pa pya وەتن ریٚ کردن «پاپیا بچیٚ رەسیدە پێەو» ف تند راه رفتن

**پاپێاساوین** pa pêa sawîn پاپێا ساین ف لگد کوب کردن

**پاپێا ساین** pa pêa sayn پا پێا ساوین ف لگد کوب کردن

**پاپێانان** pa pêa nan پا پێا ناین ف پا بر آن نهادن

**پاپێانایِن** pa pêa nayn پا پێا نان ف پا بر آن نهادن

**پاپێچ** pa pêç ۱) پاپووش، دەس‌گرتن ۲) بنووڕە ساقوەن ف ۱) افترا ۲) نگا **ساقوەن**

**پاپێچنەک** pa pêçnek دۆگونە ف نوعی علف هرز

**پاپی‌سلیموونی** papî silîmûnî کەڵەشێر خودایلە«ل» ف شانەبسر

**پاپێڵ** pa pêł پا وپێڵا ف پا و ضمائم آن

**پاپێڵا** pa pêła پا وپێڵا ف پا و ضمائم آن

**پاپێڵ‌چەفت** pa pêł çeft گیر، پاپەێ چەفت ف آنکه پاهایش کج است، نوعی راشیتیسم

**پاتار** patar پاێ پاتار، لە تەنگی وتفتی بۊن ف در تنگنا قرار گرفتن

**پاتاق** pataq ۱) تاقێگە لە بەێنْ رێ کڕن وە سەر پیەڵ ک ئۆشن یە گڵکووی «ئەژدیهاک» باپیرْ داریووشە ۲) دیەکەێگە لە سەرپیەڵ ف ۱) طاقی افسانه‌ای که گویا قبر «آژدیهاک» نیای داریوش است در بین راه کرند به سرپل ذهاب قرار دارد ۲) روستایی در سرپـُل ذهاب

**پاتاڵ** patał پیر و لە کار کەفتێ «پیر و پاتاڵ» ف پیر و فرتوت

**پاتشا** patişa پادشا، لە پەهڵەوی (patişa پاتشا) و ( patexşa پاتەخشا) و (patyxşa پاتیخشا) ئۆسریاس ف پادشاه، در پهلوی (patişa پاتشا) و (patxşa پاتخشا) و (patyxşa پاتیخشا) نوشته شده

**پاتلن** pa tilin پاماڵ کردن ف با پا لگدمال کردن

**پاتەخت** patext ۱) شار قورپیسەیی ۲) چووار گلە چوو دۆ گەزی کْ وە زەنجیر بەسیانەسە گوردەێ مەوج بافی و تان و پوو لە یەک جیاوە کەن ف ۱) پایتخت ۲) شامل چهار چوب به طول تقریبی یک متر که بوسیله زنجیرهایی به «گورده» متصل است و هر کدام یک ردیف بند تار را از دیگری جدا می‌کند

**پاتەرم** paterm لاناوە لە خەڵک «گ» ف مردم، جمعیت

**پاتیل** patîl تێان ف دیگ مسی بزرگ

**پاتیلچە** patîlçe پاتیلْ بۊچگ ف دیگ کوچک مسی

**پاجووش** pacûş چۆزەڕەێ بنْدار ف جوانه پای درخت

**پاجی** pacî چیتەجا، چیتجا ف حجلەی ویژەی عروس و داماد که درداخل سیاه‌چادر در شب زفاف از آن استفاده می‌کنند ، نوعی‌چیت

**پاجینگە** pacînĝe جی پایگ کْ لە ناو چاڵاو ئەڕاێ خوار و بان کردن درْس کەن، پاگیرنگە ف جا پاهایی که در چاه می‌کنند جهت بالا و پایین آمدن

**پاجییە** pacîye بنووڕە پاجی ف نگا **پاجی**

**پاچ** paç ۱) بڕین وە قەیچی ۲) قرتانن ۳) تۆنگْ ئاو خوەری ف ۱) برش با قیچی ۲) قطع کردن ۳) پارچ

**پاچاڵ** paçał ۱) چاڵێ کْ جووڵێا مەکینەێ جۆلایی خوەێ نەێدە تێ ۲) چاڵێ کْ ماین نەنە تێ تا خەر بیەڕێە لێ ف ۱) چاله‌ای که جولا دستگاه جولایی را درآن جا می‌دهد ۲) چاله‌ای که مادیان را در آن می‌نهد تا با خر گُشن کند

**پاچاڵ‌کەن** paçał ken ۱) ئەو کەسەێ کْ پاچاڵ کەنێد ۲) لاناوە لە جاکەش ۲) ئامرازێگ ئەڕاێ کەنینْ چاڵ کْ سۆتنەیلْ سییەماڵ بنەنە تێ ف ۱) کسی که «پاچاڵ» را گود می‌کند ۲) کنایە از جاکش ۳) وسیله‌ای برای کندن چاله جهت قرار دادن ستون های سیاه‌چادر

**پاچان** paçan بەنبەن بڕی ف از هم پاشید

**پاچانن** paçanin بەنبەن بڕین ف از هم پاشیدن

**پاچدان** paçdan بنووڕە پاچکردن ف نگا **پاچکردن**

**پاچ‌قولە** paçqwile پاچەقولی ف لُنگ کردن در کُشتی، فت پا زدن در کُشتی

**پاچکردن** paç kirdin ۱) بڕین ۲) هەڵپاچین ف ۱) برش زدن ۲) قطع کردن

**پاچکە** paçke کەلە پاچْگ ف کله‌پاچه

**پاچْگ** paçig ۱) پاچە ۲) خوری تاو دریاێ و جەڕە کریاێ ف ۱) پاچه ۲) پشم تابیده و دسته بندی شده

**پاچْگ‌زەڕینە** paçig zerîne پاچگەزەڕینە ف دختری که بعد از او نوزاد پسر بدنیا بیاید

**پاچگەزەڕی** paçge zerî بنووڕە پاچْگ‌زەڕینە ف نگا **پاچْگ زەڕینە**

**پاچگەزەڕین** paçge zerîn پاچْگ زەڕینە ف نگا **پاچْگ زەڕینە**

**پاچگەزەڕینە** paçge zerîne بنووڕە پاچْگ زەڕینە ف نگا **پاچْگ‌زەڕینە**

**پاچڵە** paçiłe کوچگێ کْ نەنەێ بانْ هەرەکْ سییە ماڵ ف

**تەتاڵە** tetal̂e ١) چوو پیەنێگە کەفێدە بانْ ستون ٢) تاتەڕێخ ف ١) چوب پهنی که روی سر ستون سیاهچادر قرار میگیرد ٢) سنگ صاف و نازکی که روی آب پرتاب کنند و چند بار روی آن ملق زند

**تەتانن** tetanin وە خوەێ رەسین «فرە وە خوەد تەتیەید» ف بە خود رسیدن

**تەتبا** tetiba تەتەبوو «ل» ف نگا **تەتەبو**

**تەترە** tetre زترە دان ف حالت راه رفتن کبک در هنگام فرار کردن

**تەتْگ** tetig ١) تیەتْگ ٢) تەتگە ف لمه، قسمت باسن ٢) اسباب بازی در زبان کودکان

**تەتگە** tetge تەتْگ ف اسباب بازی درزبان کودکان

**تەتگەوەیلکان** tetge weylkan وەیلکانێ کْ وە خەتۆر یا خەڕێ دْرس کەن، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «تەتە» ئۆشن ف عروسکی که بچهها با خمیر یا گل درست میکنند

**تەتڵە** tetl̂e پەسا کردنْ خەلیە ف پاک کردن غلات

**تەتڵەکردن** tetl̂e kirdin پەسا کردن ف پاک کردن غلات

**تەتۆلْک** tetülik تەتاڵە «گ» ف نگا **تەتاڵە**

**تەتومە** tetûme شەوچەرە ف شب چره

**تەتوەن** tetwen بەردەڵانی کْ لە سەر یەێ رزار بوو «تەتێگە و تەتوەنێگە چووار کاوڕ و وەرەنێگە» ف سنگلاخی، قطعه زمینی که سنگهای بزرگ و رگهای دارد

**تەتە** tete ١) تەتگە، وەیلکان ٢) خاس، دڵخواز «ئیمە تخە، ئەوان تەتە» ٣) ترپڕ، کارْ سەرسەری ف ١) اسباب بازی، عروسک ٢) خوب، مورد پسند ٣) سرسری کار کردن، ماسمالی کردن

**تەتەبو** tetebû ١) ئەندیش، فەن ٢) سترْ کەسێ زانْسن، ئەرەوییە ف ١) تدبیر، حیله ٢) راز کسی را دانستن

**تەتەبو کردن** tetebû kirdin بنوورە تەتەبو ف نگا **تەتەبو**

**تەتەر** teter ١) چاپار، تنڕەو «سووارێ هاتێە لە تەنگْ تەتەر – چل گولە ها پێ هەر چلێ خەتەر» ٢) وڵات، نیشتمان «شا شاریار بۆ، تەتەر ویران بۆ » ف ١) پیک تندرو، قاصد ٢) وطن، سرزمین

**تەتەری** teterî نەترس، چاڵاک ف بیباک

**تەتەکردن** tete kirdin سەرسەری کار کردن ف ماستمالی کردن

**تەتڵەمۆران** tetel̂emüren تۆتگەشوانە، تەتڵەمیران «گ»، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «تەتەڵەمیران» ئۆشن ف نگا **تۆتگەشوانە**

**تەتیان** tetyan ١) تەقیان ٢) سازیان ٣) تەتانن ٤) پەێدا کردن «ل» ف ١) برخورد کردن، ملاقات ٢) سازگاری ٣) نگا **تەتانن** ٤) پیدا کردن

**تەجرەوە** tecrewe ١) کار ئازمووده ٢) دۆجلە، دۆلە «رەنگێ ریشْد بگرێ تەجرەوەێ کەس وە پێا نەو» ف ١) تجربه ٢) دور باد از... نگا **دۆجلە**

**تەجگا** tecga ١) تەجێا، تەژگا «وجاخْ کوور خاسترە لە تەجگاێ سییە گەن» ٢) کوانێ، تەشگا ف ١) چووب تر و نسوز ٢) اجاق، اجاق نان پزی

**تەجەر** tecer ١) کیسەێگ ک تووراخ کەنە تێ ٢) دۆ دیەکە لە شاباد، تەجەرْ ئەکبەر و تەجەرْ کەرەم پەناوای ف ١) خیکی که «تووراخ» در آن نگهداری کنند ٢) دو روستا در اسلام آباد غرب با نامهای «تەجەرْ ئەکبەر و تەجەرْ کەرەم پەناوای»

**تەجێا** tecêa تەجگا، تەژگا ف نگا **تەجگا**

**تەجیر** tecîr تەجیل «ل» ف نگا **تەجیل**

**تەجیل** tecîl ١) تەجیر، پەچەێ باقەیی، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «تامان، چەپەر» و لە سەکزی «تەجیر » ئۆشن ٢) پەرچینْ باخ ٣) نەردەێ دەورْ کەڵکان ف ١) پرچینی از نی برای برّهها، دردیگر گویشهای کردی «تامان، چەپەر» و در سکزی «تَـجیر» گویند ٢) پرچین دور باغ ٣) نردهی محافظ تراس و بالکن

**تەخت** text ١) هامار ٢) رەختاو ٣) جی نیشتنْ پاتشا، لە پەهڵەوی (text تەخت) نۆسریاس ٤) بێ چڵ و چەفتی ٥) زەمینە «گوڵ و تەخت» ٦) کەمووتەرێ کْ پەرەیلێ دراتێە و تێارْ پەرینە «باڵێ تەختە» ف ١) هموار ٢) تختخواب ٣) تخت پادشاه، در پهلوی (text تخت) نوشتهشده ٤) راست و بدون کجی ٥) زمینه و کادر ٦) کبوتری که پرهایش در آمده و آماده پرواز است

**تەختان** textan ١) تەختڵانی ٢) دیەکەێگە لە ئیلام ف ١) زمین هموار ٢) روستایی در زرینآباد ایلام

**تەختانی** textanî تەختڵانی ف زمین هموار

**تەختایی** textanyî تەختڵانی ف زمین هموار

**تەختبۆن** text bün ١) هامار بۆن ٢) بێ ئەنیش بۆن « خێاڵد تەخت بوو» ٣) کەمووتەرێگ ک خێ داسە مەکانْ نوو ف ١) هموار شدن ٢) راحت شدن، بی دغدغه ٣) کبوتر جلد

**تەختْ سینە** texti sîne پیەنای سینە ف پهنای سینه، تختی سینه

**تەختْشیرین** texti şîrîn دیەکەێگە لە چەمچەماڵ ف **نام** روستایی در چمچمال صحنه

**تەختکردن** text kirdin ١) بنوورە تەخت بۆن ٢) کەمووتەرێگ وە جاێ نوو هووکارە کردن ف ١) نگا **تەخت بۆن** ٢) کبوتری را بەجای جدید انس دادن

**تەختلانی** textiĺanî تەختانی ف زمین هموار

**تەختْ ناوشان** texti nawşan ناوشان ف پهنای مابین کتف‌ها

**تەختە** texte ١) وە ناو جی کەفتن لە نەخوەشی ٢) پارچەێ دەوار و قالی و ... ٣) لاتراشەێ پیەن لە چوو ٤) بەسریاێ «دەرْ دکانەگەێ تەختە کریاس » ٥) گەمەێ تەختەنەرد ف ١) بستری شدن‌در اثر بیماری ٢) واحد شمارش سیاه‌چادر و قالی و... ٣) تخته چوب ٤) بسته شده ٥) بازی تخته نرد

**تەختەبۆن** texte bün ١) لە ناو جی کەفتن لە نەخوەشی ٢) بەسیان ف ١) در بستر افتادن در اثر بیماری ٢) بسته شدن

**تەختەبەن** texteben ١) تەختْ خاو ٢) نەردە ف ١) تختخواب چوبی، کت ٢) نرده چوبی

**تەختەشکانن** texte şikanin سەرسووکی کردن ف کنایه از سبک شمردن بزرگان در جمع

**تەختەشمشاڵ** texte şimşaĺ بەشێگە لە سیيە ماڵ ف قسمتی از سیاه چادر

**تەختەقاپوو** texte qapû وە زوور دامەزرانن و جیگیر کردن ف اسکان اجباری، سکنی گزیدن اجباری

**تەختەکردن** texte kirdin ١) پیە کردنْ بیماری و لە ناو جی خسن ٢) بەسریان ف ١) بیماریی که بیمار را بستری کند ٢) بسته‌شدن

**تەختەکلاو** texte kiĺaw بنوورە تەختە بۆن ف نگا **تەختە بۆن**

**تەختەکلاش** texte kiĺaş کۆیەێگە لە کوونانی ف کوهی در کونانی کوهدشت

**تەختەکوڵە** texte kwiĺe کۆیەیگە لە کوونانی ف کوهی در کونانی از توابع کوهدشت

**تەختەکوو** textekû ١) وە تەختە کونایل پوشانن ٢) لاناوە لە بەسریان «دەرێان تەختەکوو کردن» ف ١) با تخته منفذی را گرفتن ٢) کنایه از بستن مکانی

**تەختەنەرد** texte nerd گەمەێگە، نەرد ف بازی تخته نرد

**تەختی** textî تەختانی، هاماری ف هموار ی

**تەخسێر** texsêr تاوان، ئەرەوییە ف تقصیر، عربی است

**تەخسێر بار** texsêr bar تاوانبار ف مقصر

**تەخشە** texşe جووریێ بازە «قووقوو سێادەیل تەخشە نازانە – تەمەناێ مانێشت سەێرْ بازانە» ف هما، باز

**تەخشەباز** texşe baz تەخشە، باز ف نوعی باز

**تەخۆل** texol ١) فرەخوەر ٢) دیلْم ف ١) پُر خور ٢) تنبل و بی نیرو

**تەخول** texwil بنوورە تەرخول ف نگا **تەرخول**

**تەخوْن** texwin تەخۆل، دیلْم ف تنبل

**تەر** ter پەێمانە ف نوعی پیمانه

**تەڕ** ter̂ ١) خۆس، فیسیاێ، لە پەهلەوی(ter تەر) نۆسریاس ٢) زانا، تەوانا «تەڕزووان، تەڕفام» ف ١) خیس، در پهلوی (ter تر) نوشته‌شده ٢) پیشوند دانایی

**تەرا** tera ١) ترا ٢) دۆیاێ «تاکە» وە ماناێ تەفراو تۆناوە «تاکەتەرا» ف ١) نگا **ترا** ٢) پس از«تاکە» به معنی متفرق است

**تەرا بۆن** tera bün تەرافیدە بۆن ف متفرق گشتن

**تەراش** teraş بنوورە تراش ف نگا **تراش** وترکیباتش

**تەڕاف** ter̂af زایر، تاسکە ف قسمت شرمگاهی بدن

**تەرافیدە** terafîde ترافیدە ف نگا **ترافیدە**

**تەڕاڵ** ter̂aĺ ١) تەمەڵی «ئمساڵ وە تەڕاڵ تەڕ پووشی بردە سەر» ٢) هەمۆشە سەونز «تنگز دْروونن وایم تەڕاڵە – تۆلەوەن چەقی ئەوسا وەهارە » ف ١) تنبل ٢) همیشه سبز

**تەڕان** ter̂an گەمەێگە ف بازیی است

**تەڕاو** ter̂aw تەرخێنەێگ کْ لە ناو دوو فیسیاس و خواردەمەنیە ف ترخینه‌ای که در دوغ خوابانیده شده و بجای غذا می‌خورند

**تەڕبۆن** ter̂bün ١) خۆس بۆن ٢) گرژ هەڵاتن ف ١) خیس شدن ٢) خشمگین شدن

**تەڕپووش** ter̂pûş ژیگوڵ ف شیک پوش

**تەرت** tert ١) خەرمانْ کوتیایێ و پیەنا کریایێ کْ هێمان شەن نەوّیە، لە ئەوستا (fresterte فرەس تەرتە) و (siterte ستەرتە) وە مانایلْ «شێویایێ و دەسە نەکریایێ و پیەنەو کریایێ لە رۆ زەوّ» نۆسریاس ٢) وە رزار یەک، سەفتە کریایێ [ف] ١) خرمن کوبیده شده و پهن شده و بوجاری نشده، در اوستا (fresterte فرَستَرته) و (siterte ستَرته) به معانی - گسترده و دسته‌بندی نشده پهن شده روی زمین نوشته شده ٢) به ترتیب، ترتیب قرار گرفتن

**تەڕتا وشک** ter̂ ta wişk جووریێ تیرْ پشکە کْ وە سان ئەنجامیێ دەن [ف] نوعی قرعه کشی با سنگ که یک طرف آنرا تَر کرده و به هوا می‌اندازند

**تەرچْگ** tercig تەرچْگ، تازە [ف] سبزه و شاداب، تر و تازه برای صیفیجات

**تەرجمان** terciman ١) دیلمانج، دیلماج، تەرزەبان، لە پەهڵەوی (tergeman تەرگەمان) نۆسریاس، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «وەرگێڕ، پاچڤەکەر، پاجڤە کەر» ئۆشن ٢) دوواێ کْ ئەڕاێ واز بۆنْ زاوا خوەنن ٣) جووریێ دوواس ک چەن گلە دۆیەت کەنە ژێر بەتیەێگەو ئێکە سەید تێ و دوواێ خوەنێ تا تەڵەسمْ کار واز بکەێ یا ناو نیشانْ بێسەر و شوون بەێدە دەس [ف] ١) مترجم، در پهلوی (tergeman ترگمان) نوشته شده، دردیگر گویشهای کردی «وەرگێڕ، پاچڤەکەر، پاجڤەکەر » گویند ٢) وردی که برای داماد درشب زفاف خوانند تا توانایی زفاف داشته باشد ٣) وردی که توسط حسابگر و با حضور چند نفر که معمولا دختر هستند و در زیر چادر سیاهی قرار می‌گیرند خوانده می‌شود تا نشانی از گمشده یا خواسته شخص ترجمان خواه بدهند

**تەرجەمە** terceme دیلمانج [ف] برگردان، ترجمه

**تەرچْگ** terçig تەرجْگ [ف] نگا **تەرجْگ**

**تەرخ** terx بنوورە تەرک [ف] نگا **تەرک**

**تەرخوْل** terxwil تەرخوْن [ف] نگا **تەرخوْن**

**تەرخوْن** terxwin ١) گیاێ تەخوون کْ خوراکییە ٣) تیکە چووێ ک وە خرەو تاشیاێە کْ منالەیل وە پێ گەمە کەن [ف] ١) گیاه ترخون ٢) تکه چوبی که مدور است ونخی به دور آن می‌پیچند و با کشیدن نخ تکه‌چوب می‌چرخد و بچه‌ها با آن بازی می‌کنند

**تەرخێنە** terxêne گەنم پەتڵە و دوو پڵتووکەێ کەن و ئەڕاێ زمسان کەنەێ ئاش [ف] گندم پرک شده و خورد شده که در دوغ می‌خوابانند و پس از خشک شدن برای زمستان بعنوان سوپ از آن استفاده می‌کنند

**تەردەس** terdes کارامە [ف] کارآمد، توانا

**تەرز** terz ١) دیمەندار «خوەش تەرز» ٢) رەسم و رسوّم «کول کارێ تەرزە، شادی شیوەن فەرزە» ٣) مەقامْ هوورە و موور و مووسقی حەقانی [ف] ١) زیبا و دلپسند ٢) رسم، روش ٣) مقام موسیقی

**تەرزْمەجنوونی** terzi mecnûnî بەزمێگە لە هوورە [ف] یکی از مقامهای هوره

**تەڕزووان** ter̂ zuwan قسیە بکەر، قسەزان [ف] سخنور، سخن دان

**تەڕزووان نۆس** ter̂ zuwan nüs ئەو کەسە ک قسەێ تەنز نۆسێ [ف] طنز نویس

**تەڕزووانی** ter̂ zuwanî قسیە خوەش بکەر، کۆیەنە مەتەڵ [ف] طنز، طنز پرداز

**تەرزە** terze ١) تەگرە ژیلە ٢) خۆسە، ئانگوو «گ» [ف] ١) تگرگ ریز ٢) شبنم

**تەرس** ters لاس، پەین [ف] پهن، مدفوع گاو

**تەرسەقول** terseqwil قەرسەقول [ف] مدفوع الاغ

**تەرف** terf ١) تەرک، قەشەنگ ٢) تەرافیدە ٣) ماێ دەم «بزان تەرفْ دەمێ چۆنە» [ف] ١) زیبا، قشنگ ٢) متفرق، پراکنده ٣) سبک و سنگین کردن، سنجش گفتار، نحوه‌ی بیان

**تەڕفام** ter̂ fam ئەوزەڵ [ف] خوش درک، فهمیده

**تەرفْ تۆن** terfi tün تەرافیدە، لە یەک پاچیاێ [ف] متفرق ، پراکنده

**تەرفْ دەم** terfi dem ١) ماێ دەم ٢) دیدمەن، دیمەن [ف] ١) سنجش گفتار کردن ٢) زیبایی، قشنگی

**تەرقووت** terqût جووریێ نوورە [ف] نوعی نفرین

**تەرک** terk ١) پێشتگەێ هەر چشتێ ٢) رەنگین «گ» ٣) لە کارێگ دەس کیشان [ف] ١) قسمت عقبی زین ٢) زیبا، رعنا ٣) انجام ندادن کاری

**تەڕکاڵ** ter̂ kal̂ تەڕەکاڵ، کشت وکاڵ ئاوی [ف] محصول آبی

**تەرکان** terkan بنوورە کۆیەت [ف] نگا **کۆیەت**

**تەرکانی** terkanî جووریێ چیغْ نازکە [ف] نوعی چیت نازک

**تەڕکردن** ter̂ kirdin خۆس کردن [ف] خیس کردن

**تەرکە** terke ۱) لەتە باقە ۲) پێشتگە ۳) لاناوە لە باریک ف ۱) ترکە ۲) قسمت عقبی زین ۳) کنایە از باریک

**تەرکەبان** terkeban بنوورِە تەرکەبانان ف نگا **تەرکەبانان**

**تەرکەبانان** terkebanan هاماری، تەرکەبان «ترنگەیَ تەور مەیوو لە تەرکە بانان- یا جەنگْ شێرە یا سپایَ خانان» ف بلندی قلە کوە کە هموار است

**تەرکەسووار** terkesuwar کارامە لە سوواری ف چابک سوار

**تەرکەش** terkeş لە تیررِەس، لە دۆدەس «وەهار هاتەوە وەو شەرت خوەشم بوو- سەونزەیَ قەد باریک وە تەرکەشم بوو» ف دم دست، در دسترس

**تەرکەوەیس** terkeweys دیەکەێگەلە قلاشاین ف روستایی در قلعەشاهین از توابع سرپل ذهاب

**تەرکی** terkî ناوێگە ژنانە، لە تەرک وە مانایَ رەنگین گریاس ف نامی زنانە کە از واژە «تەرک» بە معنی زیبا و رعنا گرفتە شدە

**تەرکیوەن** terkîwen پاشکوە ف نگا **پاشکوە**

**تەرگ** terĝ چیلگ ف شاخەهای درخت بلوط کە برای سوخت زمستانی بکار بردە می‌شود

**تەرلان** terlan ۱) واشەیَ تێژبال، بنچینەیَ ئی وشە تۆرکیە ۲) لاناوە لە رەنگین و دلْپەسەن ف ۱) تیز پرواز، ریشە این واژە ترکی است ۲) کنایە از زیبای دلفریب

**تەرم** term ۱) تەروالە ۲) جنازە ۳) لاناوە لە دیلْم ف ۱) تابوت ۲) جنازە ۳) کنایە از آدم تن لش، تن پرور

**تەرماس** termas سییە «ل»، «ژێرْد نەیَ بوو، بانْد نەیَ بوو- بەرگْد تەرماس بوو، ژ مالْ و ژ دنیا هەر ژنْد خاس بوو» ف سیاە

**تەرمکخۆرما** termik xorma خۆرمایَ پۆشی ف خرمایی کە در لیف خورما بستە بندی شدە

**تەرن** tern پەن، کەلەمە «تەرنیَ بەمە پێدئەو سەریَ ناپەێدا » ف تنبیە عبرت آمیز

**تەرنە** terne چەوەنووری «ل» ف چشم براهی، انتظار

**تەرنەقن** ter neün لێخن نەقن، گرژ نەلاتن ف خشمگین نشدن

**تەروالە** terwaľe چوارچووەیَ تەرم ف چهارچوبی کە بە عنوان تابوت بکار می‌رود

**تەروتازە** ter û taze نرک و نوو ف تر و تازە

**تەروتلیک** ter û tilîk فیسیایَ، فرە تەرِ ف کاملا خیس

**تەروشک** terî wişk تەرِ تا وشک ف نگا **تەرِتا وشک**

**تەروْگی** terwigî گیاێگە چۆ جارِوو ف گیاهی شبیە جارو

**تەرە** tere تەر ف نوعی پیمانە

**تەرِە** terê ۱) کەوەر ۲) خۆسە ۳) میوەیَ بووسان ٤) شوونێگە لە دیوەخان ک شوونْ خزمەتکارەیلە ف۱) گیاە تَرە ۲) خیس است ۳) میوە جالیزی ٤) قسمتی از مهمانسرای خان کە محل خدمتکاران است

**تەرِەبار** terêbar بارْ میوەیَ بووسان ف ترەبار

**تەرِەپیاز** terê pyaz پیازچە ف پیازچە

**تەرِەتووشی** terê tûşî ۱) وە تفاق خوەش سەر کردن ۲) هەوایَ تەرِەزەن، تەرِەتۆشی ف ۱) با آسودگی روزگار بسر بردن ۲) هوای نمناک و بارانی

**تەرِەتۆشی** terêtüşî هەوایَ تەرِەزەن ف هوای نمناک و بارانی

**تەرِەتیزە** terêtîze کۆزلە ف ترتیزک آبی

**تەرەخشە** terexşe تەرەشقە، سەرما ف سرما

**تەرەخون** terexwin پرتیانْ چەو وچرکْ پرِ بۆن ف تراخما ، عفونت چشم

**تەرِەزا** terêza نووزگە، ئاژەلیَ ک یەکْم زا و زیَ بکەیَ، لە سەکزیَ «تەرِزا» ئۆشن ف حیوانی کە اولین زایمانش باشد، در سکزی «تَرزا» گویند

**تەرِەزەن** terêzen ۱) تەرِەزا ۲) هەوایَ وارانی کْ زەوَ بفیسنیَ ف ۱) نگا **تەرِەزا** ۲) هوای بارانی کە در آن زمین کاملا خیس شدە

**تەرەزیان** tereziyan تروزیان، ترنجگیان ف نگا **تروزیان**

**تەرەس** teres ۱) گەن، چەپەلْ، ئەرِایَ سەیَ ۲) دژمینێگە «تەرەس باوگ» ف ۱) پست و رذل، صفتی برای سگ ۲) دشنامی است

**تەرِەسالْ** terê saľ سالْ پرِ واران ف سال پر باران

**تەرِەسلێمانە** terê siľêmane گیاێگە ف گیاهی است خوراکی

**تەرەشقە** tereşqe سایەقە ف الماسە هوا، پژ

**تەرهشک** terî hişk تەرِ وشک ف نگا **تەرِتا وشک**

**تەرەقە** tereqe تەقەمەنی ف ترقە

**تەرەقی** tereqî ١) ترەختی ٢) تەرکیا ف ١) ترقی ٢) ترکید

**تەرەقیا** tereqya تەرەکیا ف ترکید

**تەرقیاس** tereqyas تەرەکیاس ف ترکیده است

**تەرەقیاگ** tereqyag تەرەکیا ف ترکیده

**تەرەقیان**tereqyan ١) تەرەکیان ٢) ترسیان «گ» ف ١) ترکیدن ٢) ترسیدن

**تەرەقیاێ** tereqyaê تەرەکیاێ ف ترکیدەشده

**تەرەقین** tereqîn تەرەکین ف ترکیدن

**تەرەک** terek دەرز، کوناێ بۆچگْ ف ترک، درز

**تەڕەکاڵ** terê kaڵ تەڕکاڵ ف نگا **تەڕکاڵ**

**تەرەکان** terekan ١) تەرەقان ٢) شڵپان ٣) بێ گورتینه کرد ٤) ئەو ترسان ف ١) منفجر کرد ٢) ترکاند ٣) بکارت را برداشت ٤) ترساند

**تەرەکانن** terekanin ١) تەرەقانن ٢) شڵپانن ٣) بێگورتینه کردن ٤) ترسانن ٥) دریژە دان وە قسیه «دەمەتەقه» ف ١) منفجر کردن ٢) ترکاندن ٣) بکارت برداشتن ٤) ترساندن ٥) به صحبت ادامەدادن

**تەرەکمان** terekman تەرەکیان، لاناوێگە ئرای فره خوەر ف ترکیدن، کنایه است برای پـُرخور

**تەرەکه** tereke تۆخمه «تۆخمه تەرەکه» ف نژاد، تخمه ترکه

**تەڕەکی** terêkî میبه و کاوڕێگ کْ له وەهار گیاێ سەونز فره خواردێه و ژێرْ پاچێ زەرده ف گوسفند ی که در بهار به علت خوردن گیاه سبز زیر دنبه‌اش زرد شده

**تەرەکیا** terekya ١) تەرەقیا ٢) تووقیا ٣) ترسیا ف ١) منفجر شد ٢) ترکید ٣) ترسید

**تەرەکیاس** terekyas ١) تەرەقیاس ٢) تووقیاس ٣) پشکیاس ف ١) منفجر شده است ٢) ترکیده است ٣) بی بکارت است

**تەرەکیاگ** terekyag ١) تەرەقیاگ ٢) تووقیاگ ف ١) منفجر شده است ٢) ترکیده

**تەرەکیان** terekyan ١) ترسیان ٢) تووقیان ٣) تەرەقیان ف ١) ترسیدن ٢) منفجر شدن ٣) ترکیدن

**تەرەکیاێ** terekiyaê ١) تووقیاێ ٢) تەرەقیاێ ف ١) منفجر شده ٢) ترکیده

**تەڕەڵوا** terêڵwa حەڵوا «ل» ف حلوا

**تەڕی** terî زیزْ وشکی ف تَری، خیسی

**تەریخ** terîx تەریق «ل» ف شرمندگی، حیا، خجالتی

**تەریق** terîq خجاڵەتی، شەرمەندەگی، تەریقی ف شرمندگی ، خجالتی

**تەریقی‌بردن** terîqî birdin خجاڵەتی کیشان، شەرمەندەگی ف شرمندەشدن، خجالتی کشیدن

**تەریقی‌کیشان** terîqî kîşan شەرمەندەگی ف شرمندگی کشیدن، خجالتی کشیدن

**تەریک** terîk تیەریک «ل» ف تاریک

**تەریه** terye دْز، چەتە، ئەرەوییه ف دزد، عربی است

**تەز** tez ١) سڕ بۆنْ ئەنام «دەسم تەزییه» ٢) شەکەتی خسن «تەزْد دەر کە» ف ١) کرختی اندام ٢) خستگی

**تەزانن** tezanin ١) سڕبۆنْ ئەنام ٢) رەحەت بۆن له گان ف ١) کرخیدن اندام ٢) جماع

**تەزبی** tezbî تەسبی، ئەرەوییه ف تسبیح، عربی است

**تەزمێر** tezmêr تەزبی «ل» ف تسبیح

**تەزەک** tezek تەوزەک، لقووز ف متلک

**تەزی** tezî ١) رەحەت بۆن له هەێنْ گان ٢) سڕبۆنْ ئەنام ف ١) راحت شدن در هنگام جماع ٢) بی حسی اندام

**تەزیان** tezyan ١) ئاو هاتنەوه ٢) تەزین ف ١) راحت شدن هنگام جماع ٢) بی حسی اندام

**تەزین** tezîn تەزیان ف نگا **تەزیان**

**تەژگا** tejga تەجگا، تەجێا ف نگا **تەجگا**

**تەژەک** tejek رازاێ تەمەڵی ف صفتی برای تنبل

**تەژەنگە** tejengê وجاخ کوور ف اجاق کور و بی چاره، بد بخت

**تەساق** tesaq تەسەق، تەسیەق ف تو رابه، واگذار می‌کنم به . . .

**تەسقوڵ** tesqwil جەبەێ لەیمکاری ف جعبه‌لحیم کاری قلع

**تەسک** tesk باریک «نه تەسک ونەپیەن»ف باریک

**تەسکەتێوڵ** teske têwiڵ بەد رەژەن ف بد شانس

**تەسمیل** tesmîl لاناوه له گیان دەرچوون ف کنایه از جان سپردن

**تەسوق** tesuq تاسق، تەمسق «ل» ف نوبرانه، نگا **تەمسق**

**تەسەحْق** tesehiq تەسەق ف نگا **تەسەق**

**تەسەق** teseq واگوزار، تەسیەق «تەسەقْد کەمە خودا» [ف] تو را به... واگذار می‌کنم

**تەسەڵ** teseĺ خونچ، تێر، سێر، ئارام «بشکاوان یەخەیَ بچوو لە جامەیَ- تەسەڵ بوو لە بوو ئەتر و شەمامەیَ» (مەلا نەجەف) لە کرمانجی«تێر وتەسەڵ» ئۆشن، لە ئەرەوی « تسلی» [ف] کاملا سیر، بی نیاز از گرسنگی، ئارام، در عربی «تسلی» گویند

**تەسەوْق** tesewiq تەسەق [ف] نگا **تەسەق**

**تەسیار** tesyar تیەسیار، چاوەدێر «ل»[ف] نگهبان

**تەسیارگە** tesyarge جی تەسیار «ل» [ف] ایست بازرسی، محل دیده‌بانی

**تەسیاری** tesyarî چاوەدێری «ل» [ف] نگهبانی

**تەسیەق** tesyeq تەسەق [ف] نگا **تەسەق**

**تەسیق** tesîq گەواهینامە، ئەرەوییە [ف] گواهینامە، تصدیق ، عربی است

**تەش** teş ١) ئاگر، ئاێر «ل» ٢) تەشی «تەشْ خوەیَ وە پیَ سایَد» [ف] ١) آتش ٢) دوک

**تەشام** teşam پەنام، پەشام [ف] ورم

**تەشاوی** teşawî شیشەێگ کْ بنەنەیَ ناوکونایَ دیوار و دەوریَ وە خەڕیَ بپووشنن [ف] پنجره بدون چهار چوب که دور آنرا با گل بپوشانند

**تەشْبەرق** teşiberq ١) ئاگر و بەرق، تەرەشقە ٢) نووڕێگە «تەشْبەرق بەێدە ملْدا» [ف] ١) آتش و برق، رعد وبرق ٢) نفرینی است

**تەشت** teşt تەیشت، لە ئەوستا (teşte تەشتە) و لە پەهلەوی (teşt تەشت) نۆسریاس [ف] تشت لباس شویی، در اوستا (teşte تشته) و در پهلوی (teşt تشت) نوشته شده

**تەشْ تاو** teşi taw رووشن کردنْ کوانیَ و تێار بۆن ئەڕایَ خواردەمەنی [ف] روشن کردن اجاق و تدارک دیدن برای پخت وپز

**تەشتەشاوی** teş teşawî تەشاوی، دەلاقە [ف] پنجره

**تەشخەڵە** teşxeĺe لەیلاجی، فیتْ فەن [ف] نیرنگ

**تەشقەڵە** teşqeĺe تەشخەڵە[ف] نیرنگ

**تەشقەڵەبازی** teşqeĺe bazî لەیلاجی [ف] مکار، نیرنگ باز

**تەشْقەێز** teşiqeŷz بڕسکیان و تووریان [ف] قهر کردن و بر افروختن

**تەشگا** teşga ئاتەشگا «ل» [ف] آتشگاه

**تەشمەلۆچ** teşmelüç بنوور ئاگرمەلۆچ [ف] نگا **ئاگرمەلۆچ**

**تەشنەداری** teşnedarî گیاێگە چۆ ئەسپەن ک چووار وەرز سەوزنە، ئەڕایَ دیان ژان خاسە و لە کوڵیایَ ئەوە دەرمان دْرس کەن (تەش = کفن+ داری = داروو) [ف] گیاهی شبیه سپند که چهار فصل سبز است و برای دندان درد خوب است و از پخته آن پماد سازند (تش = التهاب+ داری = دارو) داروی ضد التهاب

**تەشە** teşe ١) ئاتەشەک ٢) ئافەتْ کشت وکاڵ [ف] ١) آتشک ٢) آفت کشاورزی

**تەشەر** teşer ١) هەڕەشە ٢) کشماتْ خەو، کەشەریان [ف] ١) تشر ٢) خواب عمیق

**تەشەریان** teşeryan کشمات، کەشەریان [ف] خواب عمیق

**تەشەگیر** teşegîr تەشە لیَ دایَ [ف] آفت زده

**تەشە لیَ دایَ** teşe lê daê تەشەگیر [ف] آفت زده

**تەشەودان** teşew dan پەێەڵپەیَ [ف] بیوقفه

**تەشی** teşî ئامرازْ بەن رسین، لە ئازەری «تشرەکو، تەشی» ئۆشن [ف] دوک پشم بافی، در آذری «تشرَکو، تَشی» گویند

**تەشی رس** teşî r̂is ژنێگ کْ وە تەشی خوری ڕسیَ [ف] دوک ریس

**تەشی رسین** teşî r̂isîn خوری رسین [ف] دوک ریسی

**تەشیشی** teşîşî چەوەڕیَ بۆن و نگرانی «ل» [ف] چشم براهی و تشویش

**تەشیلە** teşîle ١) تەشینْک ٢) تیلە، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «هەڵمات، کەللا، مەڕمەڕ» ئۆشن [ف] دوک کوچکی که دو رشته نخ را به هم می‌تاباند ٢) تیله، گولو، در دیگر گویشهای کردی «هەڵمات، کەللا، مەڕمەڕ» گویند

**تەشینْک** teşînik تەشیلە [ف] نوعی دوک کوچک که دو رشته نخ را به هم می‌تاباند

**تەفت** teft تفت [ف] نگا **تفت**

**تەفراوتۆناو** tefraw tünaw تەراف، ترافیان [ف] پراکندە و متفرق شدن

**تەفرە** tefre خاپوورە بازی [ف] فریباندن و خود را به نفهمی زدن

**تەفرەخواردن** tefre xwardin گووڵ خواردن [ف] فریب خوردن

**تەفرەدان** tefre dan گووڵ خواردن ف فریفتن، فریب خوردن

**تەفەقوو** tefeqû چەوتەفەقوو ف توقع، عربی است

**تەڤە** teve هەڵەپڵە «ل» ف شتاب، عجله

**تەڤەر** tever تەوەر «ل» ف تبر

**تەڤەرداس** teverdas تەورداس «ل» ف تبرداس

**تەق** teq ١) دەنگْ تەقەمەنی ٢) دەنگْ دەرگا ف ١) صدای انفجار ٢) تق، تقه به در

**تەقان** teqan بنوورِە تەرەکان ف نگا **تەرەکان**

**تەقانن** teqanin ١) بنوورِە تەرەکانن ٢) سەرن کردن ف ١) نگا **تەرەکانن** ٢) غربال کردن و بیختن آرد

**تەقْپووق** teqi pûq دەنگْ تەقە ف صدای تقەی هر چیزی

**تەقْ تووق** teqi tûq ١) دەنگْ تەقەیْ گولە ٢) کۆیەیْگە لە گیەڵان ف ١) صدای شلیک گلوله ٢) کوهی در گیلانغرب

**تەقتەق** teq teq تەقەیْ پەیەڵپەیْ ف «تقه»ی پیاپی

**تەقْچوو** teqi çû ١) لاناوە لە پەیْپاکی کردن ٢) گووش وە زەنگ بۆن ف ١) کنایه از جستجو ٢) گوش بزنگ بودن

**تەقْچوودان** teqi çû dan پتەکەنە کردن ف جستجو کردن

**تەقدان** teq dan ١) بێگورتینە کردن ٢) فتوور هاوردن، لە بەیْن دان «تەقیْان دان» ٣) دەر کوتان، تەقە لە دەر دان ف ١) برداشتن بکارت ٢) به کلی از بین بردن ٢) کوبیدن در و...

**تەقْدەو** teqi dew زەنْبەلەق ئەرایْ کار ف تلاش برای کار کردن

**تەقْلەق** teqileq ١) وەرەلا ٢) بیْ بنیات ٣) ئەڵتەک وەڵتەک ماشین ف ١) بیبند و بار ٢) بی بنیاد، نا استوار ٣) تکانهای ناشی از ماشین

**تەقن** teqin پاشگرە وە مانایْ تەرەقن ف پسوند به معنای منفجر کننده

**تەقوٗر** teqûr ئەنگەمە، گیر وگرفت ف درد سر، گیر و گرفت

**تەقوپووق** teq û pûq تەقْ پووق ف نگا **تەقْپووق**

**تەقوتووق** teq û tûq تەقْ تووق ف نگا **تەقْتووق**

**تەقول** teqwil تەرخول، تیکە چووێگە وە خرِەو تاشیایْ و چوٚ کەلە قەن مەخرووتییە ک بەن پێچننە دەورێ و وە تاو چەرخننەیْ ف تکەچوبی گرد و مخروطی شکل که دور آنرا با نخ می‌پیچند و هنگام کشیدن نخ تکەچوب به چرخش در می‌آید

**تەقە** teqe ١) تەرەقە ٢) کارْ ناشاس «تەقەیْ کرد» ٣) دەنگْ تەقیان ٤) لاناوە لە تیرئەنازی ف ١) ترقه ٢) کار ناشایست ٣) صدای انفجار ٤) کنایه از تیر اندازی

**تەقەبان** teqeban دەیشتْ رۆت و هامار ف زمین یا دشت بی گیاه و هموار

**تەقەتووِرە** teqetûr̂e بەلەفیرِە ف اسهال

**تەقەتەق** teqe teq تەقەیْ پەیەڵپەیْ ف تقه پی در پی

**تەقەفیرِە** teqefîr̂e بەلەفیرِە، لە سەکزی «تەغەدە» ئۆشن ف اسهال در سکزی «تـَغـَده» گویند

**تەقەکردن** teqe kirdin لاناوە لە کارْ ناشاس کردن ف کنایه از کار ناشایست انجام دادن

**تەقەکوتان** teqe kwitan لاناوەلە خوسپ کردن ف کنایه از غیبت کردن

**تەقەڵ** teqel̂ بەقیە، ئاژ ف دوخت، بخیه

**تەقەلا** teqela هەوڵ، زەنْبەلەق، بنچینەیْ ئی وشە ئەرەوییە ف تلاش، کوشش، ریشه این واژه عربی است «تغلا»

**تەقەلا کردن** teqela kirdin هەوڵ و زەنْبەلەق دان ف کوشش کردن

**تەقەڵتوو** teqel̂tû تەکەدۆ، تەکەڵتوو ف قسمتی از نمد و چرم که قلتاق زین روی آن وصل می‌شود

**تەقەڵمیش** teqel̂mîş خوەیْ مردیْ مڵاس گرتن ف موش مردگی

**تەقەمەنی** teqemenî هەر چشتێگ کْ بتووقێد ف مواد منفجره

**تەقیا** teqya ١) تەرەکیا ٢) تەرەقیا ٣) ترسیا ٤) تەتیا « تەقیا پێا» بنچینەیْ ئی وشە ئەرەوییە «التقی» ٥) توویپیا پێا «تەقیا پێا» ف ١) ترکید ٢) منفجر شد ٣) ترسید ٤) برخورد کرد، ریشه‌اش عربی است «التقی» ٥) سرزنش کرد

**تەقیاس** teqyas تەرەکیاس ف نگا **تەرەکیاس**

**تەقیاگ** teqyag تەرەکیاگ ف نگا **تەرەکیاگ**

**تەقیان** teqyan ١) تەرەکیان ٢) تەتیان ف ١) نگا **تەرەکیان** ٢) برخورد کردن، ریشه این واژه عربی است « التقی»

**تەقیایْ** teqyaê تەرەکیایْ ف نگا **تەرەکیایْ**

**تەقیلە** teqîle قۆمامیلە، قارچگ تەقیلە ف قارچی که در چمنزار می‌روید

**تەقین** teqîn ١) تەرەکین ٢) تەرەقین ٣) تەتیان ف ١)

ترکیدن ۲) منفجر شدن ۳) برخورد کردن

**تەک** tek ۱) تاق، تەنیا ۲) سەوەتە، لە زاراوەیڵ ترەکْ کوردی «سەلە، قەرتاڵە، نانەشان» ئۆشن ۲) لادان «تەک بێە ئەولا» ف ۱) تک، تنها ۲) آبکش، دردیگر گویشهای کردی «سەلە، قەرتاڵە، نانەشان» گویند ۳) کنار رفتن

**تەکادان** teka dan تەکەو دان ف تکیه زدن بر...

**تەکاری** tekarî تاکاری ف نگا **تاکاری**

**تەکان** tekan ۱) ئاگرەوارە بۆن «ئی تەکانە گْ ئەڕای خواردم...» ۲) بووق نان ۳) جمْ جۆل ٤) ئەۆ تەکانەێ « گڵیمەگە تەکان» ف ۱) ناراحت شدن در اثر خبر بد ۲) هول ۳) تکان خوردن ٤) تکاندن و تمیز کردن قالی و ...

**تەکانخواردن** tekan xwardin ۱) ئاگرەوارە بۆن ۲) جمْ جۆل ف ۱) هول کردن و ناراحت شدن برای کسی ۲) تکان خوردن

**تەکاندان** tekan dan جۆلانن ف تکان دادن

**تەکانن** tekanin پاک کردنْ قالی و... ف پاک کردن و تمیز کردن قالی و ...

**تەکْ تڵ** teki tiľ رکْ رێز، هارخ پارخ ف اسباب و اثاثیەی نا چیز

**تەکْ توو** teki tû پەێپاکی کردن «تەکْ توو یە ئەرام بدرار» ف جستجو پژوهش درباره

**تەکْ تووک** teki tûk تاکْ تووک ف کم، نایاب

**تەکخسن** tek xisin فتوور دراوردن ف نابود کردن

**تەکْد** tekid دەسوور وە لادان «تەکْد بە لا» ف دستور به کنار زدن

**تەک دا دۆیا** tek da düya چییە دۆیا ف کنار رفت، عقب رفت

**تەک دا نووا** tek da nuwa هاتە نووا ف به جلو آمد

**تەککەفتن** tek keftin تەنیا مەنن ف تنها شد، تک افتادن

**تەکڵووک** tekľûk تەکڵە ف سبد کوچک آبکشی

**تەکڵە** tekľe سەوەتەێ بۆچگْ ف سبد کوچک آبکشی

**تەکْن** tekin پاشگرە وە مانای تەکاننده ف پسوند به معنی تکاندن

**تەکە** teke تەکخاڵ ف برگ آس در پاسور، تکخال

**تەکەڵتوو** tekeľtû تەقەڵدۆ «ل» ف نگا **تەقەڵتوو**

**تەکەڵدۆ** tekeľdü تەکەڵتوو، تەقەڵتوو ف نگا **تەقەڵتوو**

**تەکەلوو** tekelû ناوەێن، ناوبەێن ف میان، در میان، وسط

**تەکەو دان** tekew dan تەکادان ف تکیه زدن بر

**تەکیە** tekye ۱) خانەقا ۲) لەمەو دان ف ۱) خانقاه، تکیه ۲) تکیه زدن بر ...

**تەکیەدان** tekye dan مرکەو دان ف تکیه دادن

**تەکیەگا** tekye ga پێشتیوان، داڵتە ف پشتیبان، تکیەگاه

**تەگ** teg ساورێن ف بُز بر گله

**تەگْر** tegir تەرزە، تەێر، لە پەهڵەوی (tigirg تگرگ) نۆسریاس، لە عبری «تەرزەکی» و لە زاراوەیڵ ترەکْ کوردی «تورەگی» ئۆشن ف تگرگ، در پهلوی (tigirg تگرگ) نوشته شده و در عبری «تَـرزَکی» و در دیگر گویشهای کردی «تورەگی» گویند

**تەگرزە** tegirze تامازروو ف آرزومند

**تەگرەجیلە** tegre cîle تەگرەژیلە ف تگرگ ریز

**تەگرەژیلە** tegre jîle تەگرەجیلە ف تگرگ ریز

**تەگری** tegirî فرە سەرد ف بسیار سرد، تگرگی

**تەگریچەو** tegirî çew چەو کەو ف چشم روشن، چشم آبی

**تەگە** tege ۱) تەگ، ساورێن ۲) تەێە ف ۱) بُز نر گله ۲) هنگامەی جفتخواهی بُز

**تەگەگرتن** tege girtin تەێە گرتن ف پایان فصل جفت خواهی بُز

**تەل** tel ۱) سیم ۲) تیرقڵاف ف ۱) سیم ۲) تلگراف

**تەڵ** teľ ۱) پەلێ چیلێ «تەڵێ چیلێ بار» ۲) داڵتە «ئەر خودا وە تەڵد بوو...» ۳) تەڵەسان ف ۱) شاخه چوب ۲) پشتیبان، حامی ۳) سنگ بزرگ و صاف

**تەڵا** teľa بنوورە تڵا ف نگا **تڵا**

**تەلار** telar ۱) ئەو کەسەێ کْ دەوار و قالی و... بافی ۲) باڵابەرز ۳) دارْ چیخ بافی ٤) تەلالییە، تەلارێە ف ۱) بافندە قالی و... ۲) بلند بالا و رعنا ۳) دار چیخ بافی و... ٤) نگا **تەلالییە**

**تەلارگە** telarge ئەو بەشە لە لقْ دار ک مییە یا بزن وە پێ کەنە دارەو تا پووسێ بکەنن «ئەو شاخْ وەنە ک خەنجەر کەنە – ئەوە تەلارگەێ شکارْ مەنە» ف قسمتی از شاخەی درخت کە گوسفند یا کل شکار شدە را بە آن آویزان می‌کنند

**تەلارەێ** tela řêy ڕەگ، مەچیرەێ ئەنام ف زرد پی

**تەڵاش** teĺaş تەقەلا ف تلاش

**تەلالییە** tela lîye تەلارەیٚ، مەچیرەیٚ ئەنام ف زرد پی

**تەلان** telan ١) ئاسووێ کۆیە ٢) تەرلان ف ١) ستیغ کوه ٢) نگا **تەرلان**

**تەلانە** telane ناوێگە ژنانە، لە وشەیٚ «تەلان» وەرگێڕ بۆیە ف نامی زنانە بر گرفتە از «تەلان»

**تەڵ باڵا** teĺî baĺa قەد وباڵا ف قد وقامت

**تەلخون** telxwin بنوورە تەرخوْڵ ف نگا **تەرخوْڵ**

**تەلگیوبەلگی** teligî û beligî ١) بێ بایەخ ٢) لاناوە لە چەرمە سەری وهۆچ نەمەنن «تەلگی وبەلگی ئڕایٚ نەمەن» چشتێ ئەڕایٚ نەمەن ف ١) هرچیز بی ارزش ٢) کنایە از بدبخت شدن، اصل واژە بە معنای چیز بی‌ارزش است

**تەڵمیت** teĺmît ١) ماینێ کْ لە هەێنْ ستور رازننەیٚ و وەو نەنە کووڵێ ٢) ئەسپْ ئازیەتی جل و پیتووێ ساوێ خەنە کووڵێ و لە ناو پرسە گەردننەیٚ ٣) ئەسپْ ئاڕازیایٚ ئەڕایٚ گەورە پیایل ف ١) مادیان آرایش شده که عروس را بر آن می‌نهند ٢) اسبی که در مرگ صاحبش با وسایل جنگی صاحبش آرایش شده و در مدت مراسم سوگواری بر در خانه و در میان سوگواران نگه می‌دارند ٣) اسب آرایش شده و زین و براق کرده برای بزرگان ایل

**تەڵمیتسووار** teĺmît suwar گەورە پیا یا شەڵتەکوڕ کْ لە نووایٚ ئێڵ تیەن ف بزرگ ایل یا پسر کارآمد ایل که پیشتاز قافله کوچ است

**تەڵوار** teĺwar ١) چیخێ کْ کەشک لە بانێ پیەنەو کەن ٢) تەڕواڵە «فلانی ها بانْ تەڵوارەو» ف ١) حصیری که کشک را روی آن پهن می‌کنند ٢) نگا **تەڕواڵە**

**تەڵوارە** teĺware تەڵوار ف نگا **تەڵوار**

**تەڵواسە** teĺwase ١) هەوڵەلا، لە کرمانی «تەلواسە» ئۆشن ٢) تاسە ف ١) اضطراب، هول کردن، در کرمانی «تـَلواسە» گویند ٢) نگا **تاسە**

**تەڵواڵ** teĺwaĺ تەرم، تەڕواڵە ف نگا **تەڕواڵە**

**تەڵوەلا** teĺweĺa تەڵوەنە ف غرقه، کاملا در هم آمیختە

**تەڵوەنە** teĺwene تەڵوەلا «هەیٚ دڵ وە رێزەیٚ کەواو پەزان بای- چۆ وەن تەڵوەنەیٚ رۆ کەڵوەزان بای» ف غرقه، در هم آمیختن

**تەڵە** teĺe ١) داو، لە پەهلەوی (teĺek تەڵەک) تۆسریاس ٢) تەڵ ٣) ئەڵحەیٚ ٤) خوادەمەنیگە کْ ئەڕایٚ زاوران خاس نییە و چۆن ماس و دوو کەنە تێ و ماس سەردیە زاوران زێ ئەسپان کەێد و مرێد وەیٚ بوونەوە ئۆشن «تەڵەودوو خواردێە» ، تەڵە و دوو ف ١) دام، تله، درپهلوی (teĺek تـَلک) نوشته شده ٢) سنگ بزرگ و صاف ٣) سنگ لحد ٤) غذایی که برای زائو مناسب نیست چون ماست و دوغ در آن بکار می‌برند و ماست سردی است زائو به اصطلاح «زێ ئەسپان» کرده و می‌میرد و ضرب المثلی کردی است که می‌گوید «تەڵەودوو خواردێە»

**تەڵەبان** teleban جووریٚ کۆترە ف نوعی کـُت

**تەڵەبەرد** teĺe berd تەڵەسان ف تختەسنگ

**تەڵەپا** teĺe pa تەمْق، تبووق ف سکندری خوردن

**تەڵەپاکوتان** teĺe pa kwitan تمق خواردن ف سکندری خوردن

**تەڵەرم** teĺerîm بنوورە تەڵەمڕ ف نگا **تەڵەمڕ**

**تەڵەسکە** teĺeske دار یەێ ساڵە ف درخت یکساله

**تەڵەسم** teĺesm ١) جادوو، لە لاتین (telismen) هەر وەیٚ ماناسە ٢) دیەکەێگە لە ئارۆنئاوا کْ ئاڵ حەقن ف ١) طـلسم، در لاتین (telismen) به معنای جادوگر است ٢) روستایی در نزدیکی اسلام‌آباد غرب و بر آیین اهل‌حق

**تەڵەسْم** teĺesim کەلەسْم، پێڵەسمن ف آفت نخود، حشره‌ای که باعث نابودی نخود سبز می‌شود

**تەڵەکە** teĺeke ١) سەرکیسە کردن، لە سەکزی «تەڵەکە» ئۆشن ٢) تەڵەکین «ل» ٣) تیزْم تەڵەکە ف ١) سرکیسه کردن، درسکزی «تـَلـَکه» گویند ٢) چهارچوبی که به عنوان زیر رختخوابی از آن استفاده می‌کنند ٣) نیرنگ

**تەڵەکەباز** teĺeke baz مەردْ رن، لەیلاج ف رند، نیرنگ باز

**تەڵەکە کردن** teĺeke kirdin سەرکیسە کردن ف سر کیسه کردن

**تەڵەکین** teĺekîn تەڵەکە ف زیر رختخوابی

**تەڵەمڕ** teĺemiȓ مخڵدانْ رییەن، فارس کردێەسەیٚ تەڵەمبار ف جمع شدن گوسفندان و نامرتب روی همدیگر خوابیدن، ریشه این واژه کردی است و فارس آنرا به تلمبار دگرگون کرده است

**تەڵەمڕدان** teĺemiȓ dan مخڵدان ف جمع بستن نا منظم و خوابیدن گوسفندان روی یکدیگر

**تەڵەو** tel̂ew وە شوونْ کەسێ یا چشتێ کل کردن، بنچینەێ ئی وشە ئەرەوییە «طلب» ف طلب، ریشه این واژه عربی است

**تەڵەوا** tel̂ewa خواردەمەنیگە لە ئارد و کونجی ئەڕاێ زاوران ف خوراکی از آرد و کنجد که برای زائو خوب است

**تەڵەودوو** tel̂e û dû تیەڵەو دوو، خواردەمەنیگە ک ئەڕاێ زاوران درْس کەن و چۆن ماس و دوو کەنە تێ و ماس سەردیە زاوران زێ ئەسپان کەێد ومرێد وەێ بوونەوە ئۆشن «تەڵەودوو خواردێە» ف غذایی که برای زائو درست کنند وچون ماست و دوغ هر دو از غذاهای سرد هستند، زائو در اثر سردی به اصطلاح «زێ ئەسپان» کرده و می‌میرد

**تەڵەو کردن** tel̂ew kirdin تواسن ف طلبیدن، خواستن

**تەڵەوکەر** tel̂ew ker کەسێ کْ لە شوونْ گۆم کەردە چوو ف کسی که به دنبال گمشده‌ای می‌گردد

**تەلێ** telê بزنێ ک گووشْ دریژ و لۆل بێاشتوو ف بزی که گوشهای بلند و لول شده دارد

**تەلیس** telîs پلاسێگە چۆ هوورِ چنیەێد و جاێ قاشخ و کیەرد و هۆردْ ریزە ف بافتنیی که مانند جوال است و جای قاشق و کارد و خُرد ریز آشپزی است

**تەلیسە** telîse پەرواری، بەنی «گ» ف گاو یا گوسفندی که جهت پرواری نگه‌داری می‌شود

**تەم** tem ١) هەواێ ئەوری، لە ئەوستا (tem تەم) و (tema تەما) و لە پەهڵەوی (tem تەم) و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «مژ، دومان» و لە عبری «تەمی» ئۆسریاس ٢) تووز ٣) تارمایی ٤) لاناوە لە خوسەخواردن ٥) تیەو، تام «ل» ف ١) مه، در اوستا (tem تم) و (tema تما) و در پهلوی (tem تم) نوشته شده و در دیگر گویشهای کردی «مژ، دومان» و در عبری «تـَمی» گویند ٢) گرد وغبار ٣) تار شدن چشم ٤) کنایه از غصـه خوردن ٥) رگبار باران

**تەما** tema ١) حرس ٢) ئەزرەتمەن، بنچینەێ هەر دْگیان ئەرەوییە ٣) چەوەڕێ بۆن «ل» ف ١) آز ٢) طمع، ریشه هر دو عربی است ٣) چشم براهی

**تەماتاو** temataw خواردەمەنییگە لە تەماتە ف خوارکی از گوجه فرنگی

**تەماتە** temate بەرْ بتەێگە خواردەمەنی، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «باژاناسۆر، تۆماتێز، باینجانی‌سور، یا جاناسۆر» ئۆشن و لە لاتین (tomato) ئۆشن ف گوجه‌فرنگی، در دیگر گویشهای کردی «باژانا سۆر، تۆماتێز، باینجانی‌سۆر، باجاناسۆر» که همگی معنی بادمجان قرمز دارد گویند، درلاتین (tomato) گویند

**تەمادار** tema dar ئەزرەتمەن، بنچینەێ ئی وشە ئەرەوییە ف امیدوار، ریشه این واژه عربی است

**تەمارزوو** temarzû تامازروو ف نگا **تامازروو**

**تەماشا** temaşa تماشا، نووڕسن ف نگاه کردن، تماشا

**تەماشاخانە** temaşaxane تماشاخانە ف نمایشگاه

**تەماشاکەر** temaşa ker تماشاکەر ف بیننده

**تەماکار** tema kar ئاێمْ وە تەما، ئەرەوییە ف طمعکار، ریشه‌اش عربی است

**تەما کردن** tema kirdin هەوەس کردن ف علاقه کردن

**تەماکوو** temakû تماکوو ف تنباکو

**تەمام** temam ١) وە کولی «تەمامێ برد» ٢) ئەنجام « کارەگە تەمام بۆ» ٣) نەمەنن «تەمام بۆ» ف ١) همگی، بەکلی ٢) سرانجام، پایان ٣) تمام

**تەمام بۆن** temam bûn نەمەنن ف تمام شدن

**تەمام کردن** temam kirdin ئەنجام داین ف تمام کردن

**تەمامی** temamî وە کولی ف همگی، بەکلی

**تەمامێان** temamiêan گشتێان ف همگیشان

**تەمتەراق** temteraq تەنتەنە، شان و شەوکەت، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «سەنسەنە» ئۆشن ف دبدبه، شکوه، فرّ

**تەمتەم** temtem دیەکەێگە لە ڕەوانسەر ف نام روستایی در روانسر

**تەمتەمەلۆلان** temtemelülan کرکرەمزێ، کەڕە مزێ ف هوای مه‌آلود

**تەمسْق** temsiq تاسق، تەسوق ف نوبرانه، باب میل

**تەمسْقی** temsiqî تاسقی، تاسوقی ف نوبرانه

**تەمنێا** temniêa تەماێ نگا، تەماێ نێا ف با حسرت نگریستن

**تەمورە** temüre سازێگە زوورْم یارسان وە کارێ تیەرێ، لە پەهڵەوی (tembor تەمبۆر) ئۆسریاس ف تنبور که بیشتر مردم یارسان از آن استفاده آیینی می‌کنند و در پهلوی (tembor تنبور) نوشته شده

**تەمورەچی** temüreçî تەمورەژەن ف نوازنده تنبور

**تەمۆرەژەن** temürejen تەمۆرەچی ف نوازنده تنبور

**تەمۆشە** temüşe ١) جوو سەر پووشیاێ باریک کْ ئاو لە پێا ئەڕاێ ئاویاری باخ یا ماڵ بەن «گ» ٢) ڕێ ئاو «گ» ف ١) جوب سر پوشیده باریکی که بوسیله آن باغ را آبیاری کنند و یا آب را به خانه‌ای هدایت می‌کنند ٢) فاضلاب

**تەمەز** temez تمەرز، تمەز، تمەس ف تو نگو، نگا **تمەز** و ترکیباتش

**تەمەکوو** temekû تەماکوو، تماکوو ف تنباکو

**تەمەڵ** temeʔ ١) دیلْم ٢) جووریێ تفەنگە ف ١) تنبل ٢) نوعی اسلحه دست ساز

**تەمەڵ ئەوپاکەر** temeʔ ew pa ker کەپوو، لاناوەلە تەقەلا کردن ئەڕاێ زمسان ف گل قاص‌دک، معنای واژه تنبل به پا کن است که همین گل در اواخر پاییز پدیدار می‌شود و حکایت از تلاش برای زمستان دارد

**تەمەڵخێزان** temeʔxêzan دۆیا رووژەیلْ پایز و ئەوەڵ ماڵە ژێر ف اصل واژه به معنی تنبل خیزان است و به اواخر پاییز گویند، ماه آبان

**تەمەڵە** temeʔe دیەکەێگە لە بێڵەوار ف روستایی در بیله‌وار

**تەمەڵی** temeʔî دیلْمی، پاوْسی ف تنبلی

**تەمەنا** temena تەمەنێا، تەمنێا، تەماێ نگا ف تمنا، خواهش، درخواست

**تەمەنگا** temenga ١) تەمەنێا ٢) تەمەنگە ف ١) تمنا ٢) نگا **تەمەنگە**

**تەمەنگە** temenge بەشێگە لە سییەماڵ کْ زوورْم ها لە تیەریکی و بوود وە پێەو بنووڕیدە دەیشت «تەمەنگەێ سەر چیخْ دووژْ دەواران –خودا روو لە دەسْ مینگەنوواران» لە ئەوستا (timenĝh تمە نگهـ) وە ماناێ تیەریکی وتارماییە ف قسمت عقبی سیاه چادر که معمولا تاریک است و می‌شود از آنجا بیرون را نگریست، در اوستا (timenĝh تمنگهـ) به معنی تاریکی وتاری است

**تەمێار** temiêar دەزۆران، بنچینەێ بوودە تەماێ یار ف نامزد، ریشه‌اش همان طمع یار است

**تەمیس** temîs پاک، بنچینەێ ئی وشە ئەرەوییە «تمیز، ممیز» ف تمیز، ریشه‌اش عربی است

**تەمیس بۆن** temîs bün پاک بۆن ف تمیز بودن

**تەمیس کردن** temîs kirdin پاکەو کردن ف تمیز کردن

**تەمیسی** temîsî پیەکەو کردن، پاکەو کردن ف تمیزی کردن

**تەمیسی کردن** temîsî kirdin پاکەو کردن، دۆدە گرتن ف پاک کردن، تمیزی کردن

**تەمیسیکەر** temîsî ker ئەو کەسە ک تەمیسی کەێد ف کسی که نظافت می‌کند

**تەن** ten ١) لەش، ئازای، لە ئەوستا (tino تنۆ) و لە پەهلەوی (tin تن) نۆسریاس٢) درغنە، گجْگ، مێینەێ ئاژەڵ، لە پەهلەوی (tenver تەنڤەر) و (tenber تەنبەر) نۆسریاس و لە سەکزی «تەنە» ئۆشن ٣) تەوان «تەنْد نەو ئی کارە بکەید» ف ١) تن، بدن، در اوستا (tino تنو) و در پهلوی (tin تن) نوشته شده ٢) فُرج حیوان ماده، در پهلوی (tenver تَنوَر) و (tenber تَنبَر) نوشته شده و در سکزی «تَنه» گویند ٣) توان، نیرو

**تەنانە** tenane ١) تاتەنانەت، تەنانەت، زوورْم، واورێز، واوەورێز ٢) ئەگەر، حەتا ف ١) بویژه، نگا **تاتەنانەت** ٢) اگر، حتی

**تەنانەت** tenanet تاتەنانەت، تەنانە ف نشان به این نشان

**تەنپەروەر** ten perwer تەمەڵ ف تن پرور

**تەنتەرە** tentere ئەڵترازیان، هەڵترازیان ف نگا **هەڵترازیان**

**تەنتەنە** tentene تەمتەراق ف نگا **تەمتەراق**

**تەنخوا** tenxwa ١) دارای «عاڵەم مەپووشوو لە تەنخواێ بەرگێ- ئەو بەرگە تەنپووش ها لە توو جەرگێ» ف سرمایە، دارایی

**تەندْرس** ten diris ئازا، بێمزرەت ف تندرست

**تەنْد نەو** tenid new لاناوە لە نەتۆیەنمی «تەنْد نەو ئی کارە بکەی»ف کنایه از نتوانستن، اصل واژه به معنی «تن تو نباشد» یعنی تو با این تن توانایی انجام این کار را نداری

**تەنْ سقانْد نەو** teni siqanid new تەنْد نەو ف کنایه از ناتوانی در انجام دادن کاری، نگا **تەنْد نەو**

**تەنزیل** tenzîl پارچەێ چەرمێ و تەنْک ئڕاێ بەسانْ زام ف پارچه سفید و تُنک برای بستن زخم

**تەنْک** tenik ١) کەم پشت «مۆسەرێ تەنْک بیە» ٢) وێاری، لە پەهلەوی (tinok تنۆک) نۆسریاس و لە سەکزی «تنوک» ئۆشن ٣) لاناوە لە رەنگین «وە بەرزی باڵاد بخرەمەهەوا–

تەنکە بیوەگەیٚ وە ئازەو رەوا» ف ١) کشت یا موی کم پشت ، تُنک ٢) کم عمق، درپهلوی (tinok تنوک) نوشته شده ٣) جوان، زیبا روی

**تەنکار** tenkar چوویٚ کێ لە کونایٚ نەوەرد رەیٚ بوود و ئەو سەریٚ چفت بووده پایەیٚ تەختەیٚ مەوج بافی ف چوبی که از یک طرف در سوراخ نورد جاجیم چفت می‌شود و از سوی دیگر به پایه دستگاه محکم می‌شود وجاجیم بافته شده به دور آن می‌پیچد

**تەنکاو** tenikaw ڤێاری، وێاری ف آب کم عمق

**تەنکە** tenke ١) پلّەیت کۆیەنە ٢) شرت ٣) رەنگین، تەرک «وە بەرزی بالاّد بخرەمە هەوا - تەنکە بیوەگەیٚ وە ئازەو رەوا» ف ١) حلبی ٢) تنکه، شورت ٣) زیبا، خوشگل

**تەنکەبڕ** tenke bir̂ کەم پشت کردنْ کشت و کالٚ پڕ، زوورم ئراێ چۆنەر ف تُنک کردن محصول، بویژه برای چغندر

**تەنکەبڕ کردن** tenke bir̂ kirdin تەنکە کردن ف تُنک کردن محصول

**تەنکەساز** tenkesaz ئۆسایٚ تەنکە ف حلبی ساز

**تەنکەکردن** tenke kirdin تەنکەبڕ کردن ف تُنک کردن محصول

**تەنکەکوت** tenke kwit تەنکە کۆیەنە ف حلبی کهنه

**تەنکی** tenikî ڤێاری، وێاری ف گدار، کم عمق، محل عبور از رودخانه

**تەنگ** tenĝ ١) تەسک، زێزْ وشا، لە پەهلەوی (teng تەنگ) تۆسریاس ٢) تووە، لووفْ کۆیە ٣) سفت بەسانْ بار «تەنگیٚ بێە»، لە لاتین (thong) وە تەسمە ئۆشن ٤) تەنگی، گیروگرفت «هەرەسـْم تەنگە » ف ١) تنگ، مقابل گشاد، در پهلوی (teng تنگ) نوشته شده ٢) تنگه کوه ٣) تەنگ زین یا پالان چهار پا، در لاتین (thong) به تسمه گویند ٤) به دشواری

**تەنگْ ئسمایلخان** tengi ısmayl xan دیەکەێگە لە قلاّ شاین ف روستایی در قلعه شاهین

**تەنگابۆن** tenĝa bün تەنگەو بۆن ف تنگ شدن

**تەنگاکردن** tenĝa kirdin تەنگەو کردن ف تنگ کردن

**تەنگاو** tenĝaw دیەکەێگە لە قەسر ف روستایی در قصر شیرین

**تەنگْ ترش** tenĝi tirş تەنگ، زێزْ وشا ف تنگ و ناریک

**تەنگْ تیر** tenĝi tîr تەنگێگە لە هلێران کێ شوونە وارْ گەورییە ف تنگه‌ای در هلیلان که آثار باستانی بسیار دارد

**تەنگدان** tenĝ dan سفت بەسانْ بار ف تنگ بار بستن

**تەنگدەس** tenĝdes نەدار، بیٚ مالٚ ف تنگدست

**تەنگدەسی** tenĝdesî نەداری، فەقیری ف تنگدستی، فقر

**تەنگْز** tenĝiz تنگْس، تنگْز ف نگا **تنگْز**

**تەنگزەرد** teng zerd دیەکەێگە لە ئارۆنئاوا ف روستایی در نزدیک اسلام آباد غرب

**تەنگْ سمایلوەیٚ** tenĝi simaîl weŷ تەنگەێگە لە ئارۆن ئاوا ف تنگه‌ای در اسلام آباد غرب

**تەنگْشوان** tenĝi şuwan دیەکەێگە لە شیان ف نام روستایی در شیان از توابع اسلام آباد غرب

**تەنگقلاّ** tenĝ qiĺa کۆیەێگە لە پیازئاوایٚ هلێران ف کوهی در پیازآباد هلیلان

**تەنگگەرمە** tenĝ germe کۆیەێگە لە هۆماملان ف کوهی در هُماملان هلیلان

**تەنگە** tenĝe ١) تەنگ، لووفْ کۆیە ٢) تەسکە، زێزْ وشا ف ١) تنگه کوه ٢) تنگ است

**تەنگەبڕ** tenĝe bir̂ میەێگ کێ خوری دۆ و ران و زگیٚ چیەرە بکەن و باقیی بیلْن ف گوسفندی که پشم قسمتهای دم، ران، و شکمش را بچینند و باقی را بگذارند، برای زیبایی

**تەنگەبەر** tenĝe ber تەنگ، هەر چشتیٚ کێ وەریٚ تەنگ بوو ف تنگ، مقابل گشاد، کم عرض

**تەنگەتاو** tenĝe taw ١) بێقەراری لە هەێنْ گۆ هاتن ٢) ئاگرەواڕە بۆن ف ١) فشاراجابت مزاج ٢) بیقراری و اضطراب

**تەنگەقەق** tenĝe qeü چاخ ونەپوور ف چاقولندهور

**تەنگەو بۆن** tenĝew bün زێزْ وشا بۆن ف تنگ شدن

**تەنگەو کردن** tenĝew kirdin کولّەو کردنْ دلّنگ و... ف تنگ کردن لباس و...

**تەنگی** tenĝî ١) زێزْ وشای ٢) ناچاری، نەداری «لە رۆ تەنگی ئی کارە کەێد» ف ١) تنگی، برابر گشادی ٢) ناچاری ، تنگنا

**تەنگیتفتی** tenĝî tiftî سەرد و گەرم چەشتنْ رووژێار ف کنایه از سردی و گرمی روزگار، اصل واژه به معنی تنگی و تند مزگی است

**تەنور** tenür چالٚ پڕ لە ئاگر ئەراێ نان، لەئەوستا (tenûre

تەنووره) و tenûr (تەنوور) و لە پەهلەوی tenûr (تەنوور) نۆسریاس و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «تەندور» لە سەکزی «تەندور» لە فارسی «تەنور» ئۆشن [ف] تنور، در اوستا tenûre (تَنووره) و tenûr (تَنوور) و در پهلوی tenûr (تَنوور) نوشته شده و در دیگر گویشهای کردی «تَندور» و در سکزی «تَندور» گویند

**تەنۆر داخسن** tenür daxisin ئاگر لە تەنۆر رووشن کردن، لاناوە لە فتنە وە پا کردن [ف] کنایه از فتنه به پا کردن

**تەنۆرە** tenüre ۱) کمارەیٚ ناوەیٚ ئاسیاو ۲) دەنگْ گرمە و گوڕەیٚ هەر چشتیٚ ۳) گرژ هەڵاتن و وە تن چین «تەنۆرە بەسا و هات» ٤) دیەکەیٚگە لە بیوەنیج ٥) شوونْ ریٚ داگرتن و هەوج دانْ ئاوڕیٚژنگە ٦) شوونْ ریٚ داگرتنْ نۆرە [ف] ۱) لبەی نای آسیاب ۲) صدای غرش و تندی هر چیزی ۳) خشمگین شدن و به تندی به سویی رفتن ٤) روستایی در بیونیج ٥) مسیر ریزش و موج خوردن آبشار ٦) مسیر روان شدن گدازەی آتشفشان

**تەنۆرە بەسان** tenüre besan ۱) خڕەو بۆنْ گەردە گۆچان ۲) گرژەو بۆن و وە تن وەرەو لایگ چین [ف] ۱) حالت گرد شدن و پیچیدن گردباد ۲) خشمگین شدن مانند گردباد به سویی رفتن

**تەنە** tene یەیٚ تەن، تەن «یەیٚ تەنە دامە ناوێانا» [ف] تنە، تنها

**تەنی** tenî ۱) چنی، بافی ۲) برا یا خوەیشکْ باوگی و داڵگی [ف] ۱) بافید، تنید ۲) برادر یاخواهر تنی

**تەنیا** tenya ۱) تاک، تەک، لە پەهلەوی tenîha (تەنیها) نۆسریاس و لە سمنانی tonîa (تۆنیا) ئۆشن ۲) بافیا، چنیا ۳) ناز ناو «کەرەمرزا کەرەمی » بەیٚت ئەڵوەسْ کەڵرِە [ف] ۱) تنها، درپهلوی tenîha (تنیها) نوشته شده و در سمنانی tonîa (تُنیا) گویند ۲) بافته شد ۳) تخلص شاعر کُرد کرم رضا کرمی است

**تەنیاباڵ** tenya baʃ یەکڵە، بی برا و هامێار [ف] تک فرزند و بی برادر و پشتیبان

**تەنیاس** tenyas ۱) یەکڵەس ۲) بافیاس [ف] ۱) او تنهاست ۲) بافته شده است

**تەنیاگ** tenyag بافیاگ، چنیاگ [ف] بافته شده

**تەنیان** tenyan ۱) ئەوان تەنیان ۲) بافیانە [ف] ۱) آنها تنهایند ۲) بافته شدەاند

**تەنیایی** tenyayî بیٚکەسی [ف] تنهایی

**تەنین** tenîn بافین، لە پەهلەوی tenyeten (تەنیە تەن) نۆسریاس [ف] تنیدن، چیدن، در پهلوی tenyeten (تنیەتن ) نوشته شده

**تەنینەوە** tenînewe لە نوو بافین [ف] دوباره بافتن، دوباره تنیدن

**تەو** tew تاو، تا [ف] تب

**تەوار** tewar تیٚار، ئامادە [ف] زرنگ، آماده

**تەواری** tewarî تیٚاری [ف] آماده

**تەواسا** tewasa ۱) تاسەیٚ تۆ داشت، تواسیا ۲) گیژ [ف] ۱) آرزوی تو را داشت ۲) گیج، منگ

**تەواسام** tewasam ۱) تاسەیٚ تۆ داشتم ۲) گیژ بۆم [ف] ۱) آرزوی تو را داشتم ۲) گیج ومنگ بودم

**تەواسان** tewasan ۱) تاسەیٚ تۆ داشتن ۲) گیژ بۆن [ف] ۱) آرزوی تو را داشتند ۲) گیج بودند

**تەواشا** tewaşa تماشا، تەماشا [ف] نگاه، تماشا

**تەواشاخانە** tewaşaxane تماشاخانە [ف] نمایشگاه

**تەواف** tewaf خول خواردن وە دەورْ چشتیٚ، بنچینەیٚ ئی وشە ئەرەوییە [ف] طواف، ریشه این واژه عربی است

**تەوان** tewan تووان، ئاز، لە ئەوستا teveıan (تەڤە ئان) و لە پەهلەوی twuvanîk (توئوڤانیک) و teveıan (تڤە ئان) نۆسریاس [ف] توان، توانایی، در اوستا teveıan (توە آن) در پهلوی twuvanîk (توئووانیک) و teveıan (توە آن) نوشته شده

**تەوانچە** tewançe دەوانچە [ف] طپانچە

**تەوبە** tewbe تەرک کردنْ گونا، بنچینەیٚ ئی وشە ئەرەوییە [ف] توبە، ریشه این واژه عربی است

**تەوبەدان** tewbe dan پەن دان «تەوبەیٚ بەمە پیٚد ...» [ف] ترک کردن کاری بر کسی با تهدید

**تەوبەکار** tewbe kar تەوبە لە کاریٚ کردن [ف] توبه کردن از انجام کاری

**تەوبەکردن** tewbe kirdin تەرک کردنْ کاریٚ [ف] توبه کردن از انجام کاری

**تەوبەکەر** tewbe ker کەسیٚ کْ تەوبە کەیٚد [ف] تواب

**تەور** tewr ۱) تەوْر، لە سەکزی «تڤەر» ئۆشن ۲) چۆ، جوورْ «تەور ئەرەستوو» [ف] ۱) تبر، در سکزی «تَوَر» گویند ۲)

طور، مانند

**تەوْر** tewir تەور، تەوەر، لە پەهلەوی (teper تەپەر) ئۆسریاس و لە سمنانی (تۆوْر) ئۆشن [ف] تبر، در پهلوی (teper تپر) نوشته شده و در سمنانی (توور) گویند

**تەورات** tewrat کتاو جۆلەکە [ف] تورات

**تەورداس** tewrdas تەوْرداس، تەوەرداس [ف] تبر داس

**تەوْرداس** tewirdas تەورداس، تەوەرداس [ف] تبر داس

**تەورزیلکە** tewrzîlke تەرزە، تەگْر «ل» [ف] تگرگ

**تەوْرزین** tewirzîn تەوەرزین، تەورنەجاخ [ف] تبر زین

**تەوْرزە** tewirze کوچْگ خوایْ برش دریایْ کْ نەنەیْ ناو ئاخور، لە پەهلەوی (teperzet تەپەر زەت) وە مانایْ تەوەر زەدە ئۆسریاس [ف] تکه سنگ نمک تبرزده که در آخور گذارند ، در پهلوی (teperzet تپرزت) نوشته شده

**تەورمغدەر** tewr mix́der بەد مختەر [ف] بدمرام

**تەورنەجاخ** tewrnecax تەوەرداس [ف] تبر داس

**تەورەڕۆ** tewrerû̂ ١) تێوْڵ زت ٢) هەڵکەفتیْ ٣) کەسیْ کْ رۆیْ لە یەکیْ تر سەنگین بوو [ف] ١) پیشانی تیز ٢) جادار، محترم ٣) آنکه احترامش بر دیگران واجب است

**تەورەڕۆ بردن** tewrerû̂ birdin تەوەڕۆ [ف] احترام کسی را نگه داشتن

**تەوز** tewz ١) تلاوتەنگە ٢) ئاڵ ٣) تەو کردن لە هەێنْ زایین «تەو+ زاین» [ف] ١) زیورآلات ٢) زائو ترسان ٣) تب زایمان

**تەوزە** tewze تەوزەک، تەزەک [ف] لودگی

**تەوزەک** tewzek تەزەک [ف] لودگی کردن

**تەوس** tews ١) چۆزەدان ٢) بنوورە تەوز [ف] ١) جوانه زدن ٢) نگا **تەوز**

**تەۆس** teüs تخس، رۆدار [ف] تُـخس

**تەۆسا** teüsa خوەزێو، تەیسا [ف] ایکاش، کاشکی

**تەوسان** tewsan بنوورە تاوسان [ف] نگا **تاوسان**

**تەوفیر** tewfîr جیاوازی، فەرخ [ف] تفاوت

**تەوق** tewq ١) گەوەیْ دەورْ مل ٢) حەڵقەیْ ئاسنین ٣) فەرقْ سەر [ف] ١) طوق ٢) حلقه‌آهنی ٣) فرق سر

**تەوقْ سەر** tewqi ser فەرقْ سەر [ف] فرق سر

**تەوقە** tewqe ١) قەوە، جووریْ پڵپڵە ٢) دەسە «تەوقەیْ گوڵ» [ف] ١) از زیورآلات که بر زلف بندند ٢) دسته، حلقه

**تەوڵ** tewl̂ ١) دێوْڵ ٢) زەنگوولەیْ ملْ ساورین [ف] ١) طبل ٢) زنگوله گردن نخراز

**تەوڵ تەنگ** tewl̂î tenĝ لاناوە لە وەختْ کەم [ف] کنایه از وقت اندک، اصل واژه به معنی طبل تنگ و کوچک است که دنیا را به آن تشبیه کرده‌اند

**تەوڵ تەنگْ دڵمازان** tewl̂î tenĝi dil̂mazan ١) تەوڵ تەنگْ دْنمازان، هەنهەنْ خوراوا ٢) جووریْ قەسەمە «وەیْ تەوڵ تەنگْ دڵمازانە» ٣) جووریْ نوورە «واگوزارْد وەیْ تەوڵ تەنگْ دڵمازانە» [ف] ١) هنگامه‌ی غروب آفتاب، بین دو نماز مغرب و عشاء ٢) سوگندی است ٣) نفرینی است

**تەوڵ تەنگْ دْنمازان** tewl̂î tenĝi dinimazan تەوڵ تەنگْ دڵمازان [ف] نگا **تەوڵ‌تەنگْ دڵمازان**

**تەوڵ تەنگْ مرتزاعەلی** tewl̂î tenĝi mirtiza élî تەوڵ تەنگْ دڵمازان [ف] نگا **تەوڵ تەنگْ دڵمازان**

**تەوڵگ** tewl̂ig تەۆڵگ، گیاداخ کْ نەنەیْ بانْ بالۆک [ف] گیاهی سوزاننده که بر روی زگیل گذارند

**تەۆڵگ** teülig تەوڵگ [ف] نگا **تەوڵگ**

**تەۆڵگاو** teüligaw دیەکەێگە لە تێلان‌دەیشت [ف] روستایی در تیلان ده‌یشت

**تەۆڵگی** teüligî تەۆڵگ، تەوڵگ [ف] نگا **تەوڵگ**

**تەۆلە** teüle جی ئاژەڵ، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «تەوڵە، گەوڕ، پشتێر، گەوەڕ، تیوڵە» ئۆشن [ف] طویله، در دیگر گویشهای کردی «تەوڵە، پشتێر، گەوەڕ، گەوڕ، تیوڵە» گویند

**تەوڵەق** tewl̂eq ١) پینە کردنْ تایْ مەشکە و کونە و کەرێان و ... ٢) تایْ مەشکە [ف] ١) پینه کردن قسمت ته مشک و... ٢) قسمت انتهای مشک

**تەۆلەکردن** teüle kirdin ١) وە ناو تەۆلە بردن ٢) بەسانْ ئەسپ یا قاتر لەجایْگ کْ گیا داشتوو تا بلەوەڕیْ [ف] ١) در طویله کردن ٢) بستن چهارپایان در جای پر گیاه برای چریدن

**تەۆلەگا** teülega دیەکەێگە لە کەنگەور، ئیسە موحەمەد ئاباده [ف] روستایی در کنگاور، اکنون محمد آباد است

**تەون** tewn ١) تۆن، تەوەن ٢) بافەمەنیگە لە ئەسپەن ٣) تەوەن [ف] ١) دار گلیم وقالی و... ٢) بافته‌ای لوزی شکل که به آن سپند آویزند ٣) یکه خوردن

**تەون‌بردن** tewn birdin تەکان خواردن [ف] یکه خوردن، هول برداشتن

**تەوەر** tewer تەوْر، تەور [ف] تبر، نگا **تەور** و ترکیباتش

**تەوەڕۆ** tewerû̂ تەورەڕۆ ف نگا **تەورەڕۆ**

**تەوەرە** tewere ١) تەوْرزە ٢) رەوەق ف ١) نگا **تەوْرزە** ٢) مرحلە

**تەوەرەتەوەرە** tewere tewere رەوەق رەوەق ف مرحلە مرحلە، فاز بە فاز

**تەوەس** tewes تەوس، رەوز ف جوانە زدن درخت از روی ریشە

**تەوەسێرۆو** tewesêrû̂ تەو کردن و ورینە کردن، ئەڕاێ دەرمانْ ئی نەخوەشیە لەو شوونە ک نەخوەش مێز کردێە تیەێ لە خاکەگەێ هێز دەن ونەنەێ بانْ تێولێ یا دەنەێ خوەردێ ف تب وهذیان ناشی از مالاریا، برای درمان این بیماری لایەی زیرین خاکی را کە بیمار در آن محل ادرار کردە را بر می‌دارند و درون پارچەای گذاشتە و روی پیشانیش می‌گذارند

**تەوەسێوەرۆو** tewesêwerû̂ تەوەسێرۆو «گ» ف تب و هذیان ناشی از مالاریا، نگا **تەوەسێرۆو**

**تەوەق** teweq مەژمە، سینی ف سینی

**تەوەن** tewen تەون، هوولّ بردن ف یکە خوردن

**تەوەنْس** tewenis ١) سەێران، گەردین ٢) تۆیەنسن ف ١) گردش، تفریح ٢) توانستن

**تەویز** tewîz تەوز، تلّا «تەختەچوو کاکان سییە چۆ دالّپەڕ- تەویز پاتشا زینەتْ سەرگەڕ» ف طلا وجواهرات، زیورآلات

**تەێ** teŷ ١) مەرجْ گرەو «لێوا تەێ کردن» ٢) بڕ کردن ف ١) پیمان بستن ٢) طی مسافت کردن

**تەی** tey تەیتەی کردن ف قایم موشک بازی بچەها

**تەێپتووپ** teŷpitûp تووپْ تاپ ف نگا **تووپْ تاپ**

**تەیتەی** teytey تەی ف قایم موشک بچەها

**تەیجە** teyce سەوەتە، تەک ف آبکش

**تەیچە** teyçe تەیجە ف آبکش

**تەێر** teŷr ١) شمشێربالّ، ئەرەوییە ٢) تەگْر ٣) تەرکەبان، زەۆ ساف و تەختْ بانْ کۆیە ف ١) پرستوی شمشیربال، ریشە این واژە عربی است ٢) تگرگ ٣) زمین مسطح در قلە یا بلندی کوە

**تەیسا** teysa تەۆسا، خوەزێو ف کاشکی

**تەیشت** teyşt تەشت ف نگا **تەشت**

**تەیشتلّووک** teyştiĺûk ١) دوولّ ٢) هاماری، هاواری ف ١) دلو، تشت کوچک ٢) دشت باز

**تەیشتوولّک** teyştûĺik تەیشتْ بۆچگْ ف تشت کوچک

**تەێمان** teŷman تەجیر، بنوورە تەجیل ف نگا **تەجیل**

**تەێمان تەن** teŷman ten پەرچنْ دەورْ باخ ف پرچین کردن باغ

**تەێنْفەێن** teŷni feŷn تەێن و فەێن ف شرط و شروط

**تەێنوفەێن** teŷn û feŷn تەێنْ فەێن ف شرط و شروط

**تەێوەت** teŷwet خاکەڕا، ئەرەوییە ف سرشت، طبیعت

**تەیەلەرە** teyelere دیەکەێگە لە کووزران ف نام روستایی در کوزران

**تەێەو بوون** teŷew bûn تەێەو گرتن ف رام شدن و آرام شدن

**تەێەو گرتن** teŷew girtin تەێەو بوون ف رام و آرام شدن

**تێ** tê ١) ئەۆ تێ ٢) ناوْ ٣) چووارمین کیشْ ئەلفبا ٤) پێ هاتن «وە پێد تێ» ف ١) می‌آید ٢) در درون ٣) چهارمین حرف الفبا ٤) زیبایی و اندازە بودن لباسی برکسی

**تێا** têa ١) لە ناوێا «بێە تێا» ٢) تیەێدەو ف ١) اندرون ٢) بر می‌گردد

**تێ ئاخانن** tê axanin ١) تەپانن ٢) خەفانن ف ١) چپاندن ٢) در مایعی برای مدتی خواباندن

**تێابردن** têa birdin لە ناوێا بردن ف در چیزی فرو بردن

**تێات** têat ١) تۆلەکی کردن ٢) دەێر گرتن، لە لاتین (theater) ئۆشن ف ١) مسخرە کردن ٢) تئاتر، در لاتین (theater) گویند

**تێاتباز** têat baz تیتالّ ف بذلەگو، لودە

**تێاچین** têa çîn تێابردن ف فرو بردن

**تێار** têar تەوار ف آمادە، زرنگ

**تێارت** têart تێات ف نگا **تێات** و ترکیباتش

**تیارک** tyark تێار «ل» ف نگا **تێار** و ترکیباتش

**تێارە** têare فرووکە، بالّۆن، ئەرەوییە «طیارە» ف هواپیما ، عربی است «طیارە»

**تێارەشکن** têareşikin جوورێ تفەنگە ف نوعی تفنگ، اصل واژە بە معنای هواپیماشکن است

**تیان** tyan ١) دیان، تیەن ٢) دێکْ گەورا ف ١) م یایند ٢) دیگ بزرگ مسی

**تێان** têan لە ناوێان ف در میانشان

**تیانچە** tyançe تیانْ بۆچگْ، لە عبری «تیانچە» ئۆشن ف

# ش

**ش** ş واتا «منیش، ئەویش» ف حرف عطف

**شا** şa ۱) بنوورِ ۲) پاتشا ۳) شایی، له ئەوستا (şa شا) و (şaıtî شائیتی) نۆسریاس ۳) ئەرزشتدار، سەرتر «شاسووار» ٥) قەۆتر، گەوراتر ٦) مووروەیٚ شەترەنج ف ۱) نگاه کن ۲) پادشاه، نگا **پاتشا** ۳) شادی، دراوستا (şa شا) و (şaıtî شائیتی) نوشته شده ٤) برتر، ارزش دارتر ٥) بزرگتر ٦) مهره شاه در شطرنج

**شائبرایمی** şa ıbraymî یەکیٚ له خاندانەیلْ یارسانه له نەوادەیلْ شائبرایم کورِ مامەد گەورەسوواره و چەرخەنشینْ ئی خاندانه سەی قاسم ئەفزەلی، سەی خودایار وسەی ئەمرلا شا ئبراهیمیه ف از خاندانهای اهل حق منسوب به شاەابراهیم فرزند محمد گوراسوار و مسند نشینان این خاندان «زندەیاد سید قاسم افضلی، سید خدایار، سید امرالله شاەابراهیمی» هستند

**شاباد** şabad ناو زۆنەیٚ ئسلّام ئابادْ رووژئاوا ف نگا **ئارۆن ئاوا**

**شاباز** şabaz ۱) باز سفیٚد ۲) شاواز، ناوێگه کورِانه ف ۱) باز سفید ۲) نامی مردانه

**شابالّ** şabaĺ شاپەڕ ف شهپر پرنده

**شابانوو** şabanû ۱) سەرەژن، له پەهلّەوی (banûk بانووک) نۆسریاس ۲) ناوێگه ژنانه ۳) ژنْ شا ف ۱) کدبانو، در پهلوی (banûk بانووک) نوشته شده ۲) نامی زنانه ۳) همسر شاه، همسر شهریار

**شابرا** şa bira ناوێگه کورِانه ف نامی مردانه

**شابۆ** şabü سەرکەنەک ف نوعیجغد بزرگ که در هوا سر شکار خود را میکند

**شابۆن** şa bün شاد بۆن ف شاد شدن

**شابەختی** şa bextî ناوێگه کورِانه ف نامی مردانه

**شابەڕۆ** şa berû̂ شابەلۆ ف شاه بلوط

**شابەلۆ** şabelü شابەڕۆ ف شاه بلوط

**شابەندەر** şa bender ناوێگه کورِانه، له زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «بەندەر» وه ماناێ وەکیله ف نامی مردانه، در دیگر گویشهای کردی بندر به معنای وکیل است و شابندر به معنای وکیل بزرگ است

**شابیٚاخ** şabiêax مەلّوەنێگه لەهەرەسەم بیٚاخ وه ماناێ چۆزەره دانه ف منطقەای در هَرَسَم، بیٚاخ به معنی جوانه زدن است

**شابیم** şabîm بنوورِه شابۆ «ل» ف نگا **شابۆ**

**شاپوورِ** şapûr̂ ناوێگه کورِانه، وه ماناێ کورِْ گەورا ف نامی مردانه به معنای فرزند بزرگ

**شاپوورِئاباد** şapûr̂ abad دیەکەێگەله کەنۆله ف روستایی در کندوله

**شاپەڕ** şaper̂ شابالّ ف شهپر

**شاپەری** şaperî ناوێگه ژنانه ف نامی زنانه

**شاپەریک** şaperîk پەروانه «ل» ف پروانه

**شاپەسەن** şapesen ۱) دلّخوازْ شا ۲) ناوێگه ژنانه ۳) کیەنییێگه له دەیشتْ مایەشت هنایٚ کەریمخانْ زەند دۆیەتێگ وه ناو شاپەسەن لەوره ئەقد کرد ناوئەو کیەنیه نانه شاپەسەن ٤) گولّێگه ٥) جووریٚ گەنمه ف ۱) پسند شاه ۲) نامی زنانه ۳) چشمەای در نزدیکی مادیدشت هنگامی که کریمخان زند دختری را از این دیار به عقد خود درآورد در پای همین چشمه بود به این مناسبت این چشمه را «شاپەسەن» نامیدند ٤) گل شاەپسند ٥) بذر نوعی گندم

**شات** şat ۱) گاهس ۲) شیرینی ۳) شاتْ شۆت ٤) گەواه،

ئەرەوییە ٥) شاد [ف] ١) شاید ٢) شیرینی، شهد ٣) کولیگری ٤) گواه، شاهد، عربی است ٥) شاد

**شاتاڵ** şataĺ شەتاڵ، شڵنگْ خوەیْدان [ف] بر خود نهیب زدن، کوشیدن

**شات بۆن** şat bün شاد بۆن [ف] گواه بودن

**شاتر** şatir ١) نانکەر ٢) چالاک، تیار [ف] ١) شاطر ٢) چالاک

**شاترئاباد** şatir abad گەرەکێگە لە کرماشان [ف] محلەای در کرماشان

**شاتْمان** şatiman وەتنْ شەهادەتەین «ئەو رێ شاتْمان نەوسا» [ف] گفتن شهادتین، شهادتین

**شاتۆ** şatü جوورێ تۆیە [ف] شاتوت

**شات وبەڵگە** şat û beĺge ١) رۆیەرۆ وسان و شاتی دان ٢) شاتیدان و سەنەت رۆ کردن [ف] ١) رو در رو قرار گرفتن و شهادت دادن، رو در رو گواهی دادن ٢) شاهد و سند ارائه دادن

**شات وشۆت** şat û şüt شیتْشات، لە سەکزی «شەت و شوت» ئۆشن و لە لاتین (shout) وە مانای هاوارە [ف] کولیگری، در سکزی «شَت وشوت» و در لاتین (shout) به معنی فریاد است

**شاتە** şate ١) نانْ لەواش «ل» ٢) شادە ٣) کلْکْ دووشاو مژە [ف] ١) نان لواش ٢) گواه است ٣) انگشت نشانە

**شاتەشات** şate şat شیتْشات [ف] کولیگری

**شاتەوبەڵگە** şate û beĺge بنوورە شاتوبەڵگە [ف] نگا **شات وبەڵگە**

**شاتی** şatî گەواهی [ف] به گواهی

**شاتیتک** şatîtik فیسقە، مەلەوەرێگە لە مەلۆچگ بۆچگترە «ل» [ف] پرندەای کمی از گنجشک کوچکتر، فنچ

**شاتیل** şatîl ساتوور «ل» [ف] ساطور

**شاتیە** şatye بنوورە بەگڵ [ف] نگا **بەگڵ**

**شاجگ** şacig شیەچگ [ف] دست و دل باز

**شاحۆسەێن** şa ĥoseyn دیەکەێگە لە بێڵەوار [ف] روستایی در بیلەوار

**شاحۆسەێنی** şa ĥoseynî یەکێ لە بەزمەیلْ هوورە [ف] یکی از مقامات هوره

**شاخ** şax ١) مرکْ کۆیە ٢) شاخْ ئاژەڵ [ف] ١) کوه ٢) شاخ حیوان

**شاخان** şaxan کۆیەیل، کاوان [ف] کوهها

**شاخاو** şaxaw شاخان [ف] کوهستانی

**شاخاوی** şaxawî شاخین [ف] کوهستانی

**شاخدار** şaxdar ئاژەڵ شاخن [ف] حیوان شاخدار

**شاخ دراوردن** şax dirawrdin لە تاجب شاخ کردن [ف] از فرط تعجب شاخ درآوردن

**شاخ شکانن** şax şikanin ١) دەمکوت کردن، هەرۆکە دان ٢) لاناوە لە کارْ گەورا کردن [ف] ١) تنبیه کردن ٢) کنایە از کار خارق‌العادە کردن

**شاخشماری** şax şimarî ژمارتنْ رییەنْ بزن ئەراێ مالکانە [ف] آمارگیری گلە بُز برای پرداخت مالکانە

**شاخشمیران** şax şimîran کۆیەێ ناودارێگە لە قەسر [ف] کوهی معروف در قصرشیرین

**شاخْ شەو** şaxi şew دکوتْ شەوار [ف] شبانگاه

**شاخکردن** şax kirdin شاخ دراوردن [ف] شاخ در آوردن

**شاخن** şaxin شاخدار [ف] حیوان شاخدار

**شاخوەشینی** şaxweşînî یەکێلە بەزمەیلْ مووسقی حەقانی [ف] یکی از مقامات موسیقی کردی منسوب به «شاەخوشین» لرستانی یکی از بزرگان یارسان

**شاخە** şaxe ١) شاقە ٢) لق [ف] ١) صدای کبک و مرغ و … ٢) شاخە

**شاخەوان** şaxewan تاشەوان [ف] کوهنورد

**شاخەوانی** şaxewanî تاشەوانی [ف] کوه پیمایی

**شاد** şad بنوورە شات [ف] نگا **شات**

**شادانە** şadane گیاێ بەنگ [ف] شاهدانە

**شاد بۆن** şad bün ١) شات بۆن ٢) شا بۆن [ف] ١) گواه بودن ٢) شاد بودن

**شادمان** şadiman ١) شاد ٢) ناوێگەکورانە [ف] ١) شادمان ٢) نامی مردانە

**شادە** şade ١) دڵخوەشە ٢) شاتە [ف] ١) شاد است ٢) گواه است

**شادی** şadî ١) جەژن ٢) خوەشی کردن ٣) ناوێگە ژنانە [ف] ١) سرور، شادی ٢) شادی کردن ٣) نامی زنانە

**شادی شیوەن** şadî şîwen لاناوەلە داب و نەریت [ف] مراسمات، رسم و رسوم

**شار** şar ١) بنچینەێ کردارْ شاردن ٢) ئاوەدانی گەورا تر لە

دیەکە، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «باژێر، شارۆکە» ئۆشن، شار زێڒْ «گۆندە» واتە ئەو شوونە گ شارستانیەت دێرێد و خەڵکێ تا رادەێگ زانان و گۆند لە وشەیٚ «گەو، گەواج، گەوج » واتە نەزان و سادە وەرگێڕ بۆیە و لە پێشوو وە ساعەقڵ و سڵق وساف وەتنە گۆندی یا لادیٚ یا گەوج و هەر ئیسەیش وە ساعەقڵ ئۆشن دەیشتەکی ٣) کولانەیٚ مووریژ وخەرەنگێز ٤) گوشار دان ٥) زانا، شارەزا «شار بوو، شاران نەگەرد» لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «شیار» ئۆشن ف ١) ریشه فعل پنهان کردن «شاردن»٢) شهر، در دیگر گویشها ی کردی «باژێر، شارۆکە» گویند. واژه شهر مقابل «گۆند» یا دهات است و « گۆند» اقتباسی از «گەو، گەواج، گەوج» یعنی محلی که مردمانش به نسبت از دانایی و تمدن برخوردارند و در گذشته به ساده دل «گۆندی» یا دهاتی می گفته‌اند وهنوز هم به افراد ساده دل دهاتی می‌گویند ٣) لانه مورچه و زنبور ٤) پسوند فشار دادن ٥) دانا، آگا، در دیگر گویشهای کردی «شیار» گویند

**شاران** şaran شارەیل ف شهرها

**شارانگەرد** şaran gerd گەردیان لە ناو شاران ف جهانگرد

**شارانگەیشتە** şaran geyşte دنیادیدە ف باتجربه، دنیا دیده

**شاراو** şaraw شاریاێ ف پنهان شده

**شارْبەرە** şaribere شارەبەرگە، چەتاڵی ف ولگردی

**شارْخ** şarîx ١) ناوێگە کورانە ٢) لاناوە لە شاخْ سێوْڵ « شارْخْ سێوڵێ نیشتەسە کانگْ بژانگێ» ف ١) نامی مردانه ٢) کنایه از شاخ سبیل

**شارد** şard قایم کرد ف پنهان کرد

**شاردار** şardar سەرئەمڵەیٚ شار ف شهردار

**شاردان** şardan ئەوانە شاردەو ف آنها را پنهان کرد

**شاردن** şardin قایم کردن ف پنهان کردن

**شاردین** şardîn قایم کردین ف پنهان کردید

**شارْسان** şarisan شار ف شهرستان

**شارْسانی** şarisanî نیشتەجی لە شار ف شهروند

**شارْستانیەت** şaristanyet پێشکەفتن ف تمدن، مدنیت

**شارْگە** şarîge نازناو بەێتەڵوەسێگە ف لقب شاعری گیلانغربی است

**شارْگە** şarige ١) سووکە ناو شالیار ٢) جی هەشار بۆن ف ١) مخفف شهریار ٢) کمینگاه، مخفیگاه

**شارمرۆژ** şar mirüj کولانەیٚ مرۆژ ف لانه مورچه

**شارْن** şarin ئەوان قایم کەن ف پنهان می‌کنند

**شارْنا** şarina قایم کەن ف پنهان می‌کنند

**شارْنەو** şarinew قایم کەن ف پنهان می‌کنند

**شاروانە** şarwane ١) دیەکەێگە لە دینەوەر ٢) ناوێگە ژنانە، شارە بانوو ف ١) روستایی در دینور ٢) نامی زنانه، شهربانو

**شاروو** şarû شاڵاڕوو، کوو کردن وگردەو کردنْ سەر گوڵ بووسان، وە کار بردنْ ئی وشە ئڕایٚ دۆیامەنەیٚ بووسان وەیٚ ماناسە ک «شایٚ» بووسانەگە گردەو بۆیە ف جمع‌آوری باقیمانده صیفیجات در پاییز، اصل واژه به معنی سرگل چیدن یا چیدن بهترینهاست و به کارگیری این واژه برای باقیمانده صیفیجات بدین معناست که بهترینها گردآوری شده و پساچین شده

**شار وەدەر** şar we der دْهڕی کردن ف راندن، دک کردن، از شهر بدر کردن، تبعید کردن

**شار وەشار** şar we şar ئاوەدانی وە ئاوەدانی ف شهر به شهر

**شارە** şare رەشْگ «ل» ف تور کاه‌کشی

**شارەبانوو** şarebanû شەهرەبانوو ف شهربانو

**شارەبانی** şarebanî شارەوانی ف شهربانی

**شارەبەرگە** şare berige چەتاڵی ف ولگردی

**شارەزا** şareza زانا، کۆیەنەمەتەڵ ف آگاه، دانا

**شارەزایی** şarezayî پسپووڕی، پتەکەنی ف خبرگی، تخصص

**شارەزوور** şarezûr شارێگەلە کوردسان کْ بنەماڵەیٚ یارسان لەورە هاتنە ف شهری در کُردستان که بنیان گزاران یارسان از آنجا آمده‌اند

**شارەگ** şarêg شارەیٚ، شادەمار ف شاهرگ

**شارەوانی** şarewanî شارەبانی ف شهربانی

**شارەیٚ** şarêŷ شارەگ ف شاهرگ

**شاری** şarî ١) شارسانی ٢) سووکەناو شاریار ف ١) شهری، اهل شهر ٢) مخفف شهریار

**شاریٚ** şarê رێ گەورا ف شاهراه

**شاریٚ** şarê ١) شارێد، قایم کەێد ٢) شارێگ ف ١) پنهان می‌کند، می پوشاند ٢) شهری، یک شهر

**شاریا** şarya قایم کریا ف پنهان شد

**شاریار** şariyar شالیار ف شهریار

**شاریاس** şaryas قایم کریاس ف پنهان شده است

**شاریاگ** şaryag شاریا ف پنهان شد

**شاریاگە** şaryage شاریایە ف پنهان شده است

**شاریان** şaryan قایم بۆن ف پنهان شدن

**شاریاوا** şaryawa شاریاگەو ف پنهان شد

**شارێگ** şarêg ١) شارێد، قایم کەێد ٢) یەێ شار ف ١) پنهان می‌کند ٢) شهری، یک شهری

**شاریگ** şarîg شارید ف پنهان می‌کنی

**شارێگان** şarêgan ١) شارێدان ٢) ئەوانە پووشنێدن ف ١) آنها را پنهان می‌کند ٢) آنها را می‌پوشاند

**شارێگەو** şarêgew شارێدەو ف پنهان می‌کند

**شازادە** şazade شازاێە ف شاهزاده

**شازاێە** şazaŷe ١) شازادە ٢) ناوێگە ژنانە ف ١) شاهزاده ٢) نامی زنانه

**شازاێەجەهان** şazaŷe cehan رەوادگاێگە لە مەسۆری ف روادگاهی در منصوری

**شازدە** şazde ١) شانزە ٢) شازاێە ف ١) عدد شانزده ٢) شاهزاده، شازده

**شازدەمین** şazdemîn شانزەهەم ف شانزدهمین

**شازنان** şazinan ناوێگە ژنانە ف نامی زنانه

**شازی** şazî سووکەناو شازنان ف مخفف شاهزنان

**شاژن** şajin سەرەژن ف کدبانو

**شاسووار** şasuwar ١) سووارخاس ٢) ناوێگە کوڕانە ف ١) شهسوار، سوارکار ماهر ٢) نامی مردانه

**شاش** şaş مێز، چۆرگە ف شاش، ادرار

**شاشا** şaşa بنووڕ ف نگاه کن

**شاشبەن** şaşben مێز گران ف شاشبند

**شاشین** şaşîn شاش کردن ف شاشیدن

**شافە** şafe چکراو، ئەفاوەن، واتوورە ف شایعه

**شاق** şaq ١) شەقڵ ٢) شاقانن ف ١) مهر خرمنکوبی ٢) خواندن کبک و مرغ و ...

**شاقانن** şaqanin ١) دەنگْ کەو ٢) دەنگْ مامر ف ١) خواندن کبک ٢) صدای مرغ تخمگذار

**شاقز** şaqiz رازاێگە ئڕاێ دۆیەتْ زرنگ «قز، قیز، قیزا» وە ماناێ دۆیەتە ف صفتی برای دختر زپ و زرنگ «قز، قیز، قیزا» به معنی دختر است

**شاقزی** şaqizî شانازی، سەربەرزی ف افتخار، بالیدن

**شاقنزی** şaqinzî شاقزی ف بالیدن و افتخار کردن

**شاقوڵ** şaqûl̂ ئامرازْ بەنای ف شاقول

**شاقە** şaqe ١) گارە ٢) دەنگْ باڵ دۆیاێ فڕین ف ١) خواندن کبک یا مرغ تخمگذار پس از تخمگذاری ٢) صدای بال پرنده هنگام پریدن

**شاقەشاق** şaqe şaq گارەگار ف خواندن کبک یا مرغ تخم گذار پس از تخمگذاری

**شاک** şak ١) شەک ٢) سیک، لە لاتین (shke) وە ماناێ تەکانە ف ١) قوچ دوساله ٢) کله‌زدن در جماع، در لاتین (shke) به معنی تکان است

**شاکامی** şakamî خوەشی کردن لە خەم و خەفەتْ دیگەران ف احساس شادی از غم دیگران

**شاکدان** şak dan سیک دان ف کله زدن در جماع

**شاکم** şakim بەڵکم، بەشکم ف گویا، شاید

**شاکوڕ** şa kwir̂ ناوێگە کوڕانە ف نامی مردانه

**شاکوش** şakwiş جووری تفەنگْ بۆچگە ف نوعی تفنگ

**شاکە** şake ١) نازناو شاعێرێگە ٢) بنووڕ ف ١) لقب شاعر و یار گرمابه و گلستان خان منصور است ٢) نگاه کن

**شاکەشاک** şake şak وڵەکەت ڕێ کردن ف خسته خسته راه رفتن

**شاکەڵی** şakel̂î شەکەڵی ف زن ذلیلی

**شاگرد** şagird وەردەس ف شاگرد

**شاگردانە** şagirdane خەڵات بەخشین وە شاگرد ف انعام شاگرد

**شاگودار** şagudar دیەکەێگە لە سۆنقۆر ف روستایی در سنقر

**شاگوڵ** şagwil̂ ١) سەرگوڵ ٢) گوڵ گەوراێ قالی ف ١) سرگل، دستچین ٢) نقش بزرگ قالی

**شاڵ** şal̂ ١) عەمامەێ سەید ٢) پەشمینەێ دەورْ مل، لە لاتین (shawl) وە ئەو پارچە کْ خەنە سەرەو یا مناڵ وە پێ کولێپێچگ کەن ئۆشن ف ١) پارچه سبز ویژه سادات ٢) شال، در لاتین (shawl) به پارچه‌ای که برسر اندازند یا بچه را با آن قنداق کنند

**شالاڕوو** şal̂arû بنووڕه شاڕوو [ف] نگا **شاڕوو**

**شالاو** şal̂aw چالاو [ف] چاه آب

**شالدۆڕەکی** şal̂dorêkî ئەڤەڵقاڕە، نەریتێگ لە کوردەواری ک لە ئەوەڵ رووژەیلْ وەهارە و جووانەیل چنە بانْ کەڵکانْ ماڵەیل و شالێگ لە کوناوەنجە یا ئاگرواجْ ماڵ کل کەنە ناو و بەێتەیلێگ لە بارەێ وەهار خوەنن و ساوماڵیش کولیچە و پۆل و... نەێدە توو شالەگە و وەێجووره لە شادی وەهار گشت بەشدار بوون [ف] مراسم شال آویختن، یکی از مراسمات روز اول نوروز که نوجوانان از روی پشت‌بام و از سوراخ دودکش شالی را به درون خانه می‌فرستند و باخواندن ابیاتی در وصف بهار صاحب خانه را متوجه می‌کنند و او نیز میوه و شیرینی و عیدانه در شال می‌گذارد شبیه همین مراسم در لرستان است که شب یلدا انجام می‌گیرد و «ئەڤەڵ قاڕە»نام دارد، بدبختانه این رسم و رسوم اکنون فراموش شده

**شاڵ سزیان** şal̂ siziyan رسوا بۆن [ف] کنایه از رسوا شدن

**شالنگ** şal̂ingê ١) شیتاڵ برین ٢) لاتراشه [ف] ١) دریدن ٢) تراشه

**شاڵ ماشته** şal̂ maşte شاڵ مشته [ف] نوعی روبند زنانه

**شاڵ مشته** şal̂ mişte شاڵ ماشته [ف] روبند زنانه

**شاڵ و کلاو کردن** şal̂ û kil̂aw kirdin لاناوەلە تێار بۆن ئڕاێ کارێگ [ف] کنایه از آماده شدن برای انجام کاری

**شالەگووش** şal̂egûş بزن یا مییەێگ ک گووشْ درێژ و دارالووس بێاشتوو [ف] بز یاگوسفندی که گوش دراز و آویزان داشته باشد

**شالی** şalî دیەکەێگە لە دێره [ف] روستایی در دیره

**شالیار** şalyar شاریار، لە پەهلەوی (şatryar شەتریار) تۆسریاس [ف] شهریار، شاهنشاه، در پهلوی (şatryar شَتر یار) نوشته شده

**شام** şam ١) پاێەتەختْ سووریە ٢) خواردەمەنی شەو، لە ئەوستا (şame شامە) تۆسریاس ٣) مْ پاتشام ٤) دۆیاێ خوەراوا ٥) لە خوەراوا تا هەن هەنْ شەو شەواژوو دانْ رییەن [ف] ١) دمشق ٢) وعده شام، در اوستا (şame شامه) نوشته شده ٣) شاه هستم ٤) پس از غروب آفتاب ٤) از غروب آفتاب تا اوایل شب گله را چرانیدن

**شامار** şamar ١) ئەژدەها ٢) ناوێگە کوڕانە ٣) دیەکەێگە لە دێره ٤) لاناوەلە شەمشێڕْ عەلی لە مەسەو یارسان [ف] ١) اژدها ٢) نامی مردانه ٣) نام روستایی در دیره ٤) کنایه از ذولفقار علی در مذهب یارسان

**شام خواردن** şam xwardin شام کردن [ف] شام خوردن

**شام کردن** şam kirdin شام خواردن [ف] خوردن غذای شام

**شامۆ** şamü شامی، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «شووتی، جەبەز، ژەبەس، شفتی، هەنی، جەبەش، شتی، شمتی، ژەبەژ، شمتن» ئۆشن [ف] هندوانه، در دیگر گویشهای کردی « شووتی، جەبەز، ژەبەس، شفتی، هەنی، جەبەش، شتی، شمتی ، ژەبەژ، شمتن » گویند

**شامۆ کەواو** şamü kawaw کفته [ف] شامی کباب

**شامۆلە** şamüle شامی مارانە [ف] هندوانه ابوجهل

**شامەپەچیە** şame peçye هناێ رییەن لە لەوەڕ تییەێدەو لە ئاخڵ مڵووشە کەێد [ف] وقتی است که گله از چرا برگشته و در آغل ضمن استراحت از آخور تغذیه می‌کند

**شامی** şamî ١) بنووڕه شامۆ ٢) نازناو شامراد ناسێار وە شامی کرماشانی [ف] ١) نگا **شامۆ** ٢) ناز نام شاعر کورد شاهمراد معروف به شامی کرماشانی

**شامی فرتە** şamî firte شامی گەنیاێ [ف] هندوانه لندیده

**شامی کەواو** şamî kewaw کفته [ف] شامی کباب

**شان** şan ١) کەت ٢) سەرشان ٣) گەورایی، شایانی ٤) پلە و پاێە ٥) کوتۆلەێ هەسەڵ ٦) شان وە شان [ف] ١) کتف ٢) باری به اندازه‌ای که بتوان آنرا روی دوش حمل کرد ٣) شان وشکوه ٤) پایه و درجه ٥) شانه عسل ٦) نزد، پیش

**شان ئەوشان** şan ew şan شان وەشان [ف] پهلو به پهلو

**شانا** şana پەخش کرد «سفێدپەڕ وە رۆ سیاهی شانا » [ف] افشاند

**شاناز** şanaz ناوێگە ژنانە [ف] نامی زنانه

**شانازی** şanazî شاقزی [ف] افتخار، بالیدن

**شانْتان** şanitan تانە ولانە [ف] در مقام کسی به طعنه و سرزنش سخن گفتن

**شان خەفانن** şan xefanin ١) خوەێ چەمەو داین ٢) لاناوەلە خوەێ تێار کردن ئڕا کارێگ [ف] ١) خود را خم کردن ٢) کنایه از آماده شدن برای کاری

**شاندان** şandan ١) شان وەشان دان ٢) وە رزار وسان لە هەێنْ چەمەر ٣) کووڵدان، تەسلیم بۆن [ف] ١) شانه به شانه

دان ۲) به ستون یک ایستادن در مراسمات سوگواری ۳) کنایه از تسلیم شدن

**شاندن** şandin پشانن ف افشاندن

**شانڕەش** şanr̂êş دیەکەیگەلە ڕەوانسەر ف روستایی در روانسر

**شانزە** şanze شازدە ف شانزده

**شانزەمین** şanzemîn شازدەمین ف شانزدهم

**شانس** şans بەخت، ڕەژەن ف شانس

**شانسی** şansî ئەلابەختەکی ف شانسی، اتفاقی

**شانشین** şanişîn بەشێگە لە سیپەماڵ کْ جی گەورا پیایلە ف قسمتی از سیاه چادر که ویژه نشستن بزرگان است

**شانْ کوولْ** şani kûł کەت وکوولْ ف سر وسینه

**شانووکە** şanûke ۱) سەرشانْ گا ۲) خوری سەر شانْ کاوڕ کْ نەتراشنەیۆ ف ۱) برجستگی روی کتف گاو ۲) پشم سرشانه گوسفند که آنرا نچیده باشند

**شان وەشان** şan we şan شان ئەوشان ف شانه به شانه، پهلو به پهلو

**شانە** şane ۱) چل دێانە، شانێ ۲) جووریٚ شەنە ۳) کوتۆلە ٤) ئەمزارْ جوولای ٥) شانەیٚ خا ف ۱) شانه سر ۲) شن کش ۳) شانه عسل ٤) شانه جولایی ٥) شانه تخم مرغ

**شانەشەکی** şaneşekî شان تەکان دان ف تکان دادن شانه به هنگام راه رفتن یا سمای کردی

**شانەکردن** şane kirdin شانێ کردن ف شانه کردن سر

**شانەوشان** şanewşan شانئەوشان ف شانه به شانه

**شانێ** şanê شانە ف شانه سر

**شانێ دان** şanê dan شانێ کردن ف شانه زدن

**شانێ کردن** şanê kirdin شانە کردن ف شانه کردن

**شاواز** şawaz ۱) شاباز ۲) وە سڵامەتیٚ کەسیٚ بانگ کردن لە سۆر، لە سەکزی «شەبوش» ئۆشن ۳) ناو زڕانن ف ۱) نامی مردانە، شهباز ۲) شاباش، در سکزی «شەبوش» گویند ۳) بر کوس رسوایی کسی زدن

**شاوازکیشان** şawaz kîşan شاواز ف شاباش گفتن

**شاوازانە** şawazane پۆلێگ کْ لە هەیْنْ شاواز کیشان دەنە دێوڵکوت ف پولی که به عنوان شاباش به دهول زن می‌دهند

**شاوانی** şawanî زەقەڵ، شاوەتی ف شهوتی

**شاوە** şawe ۱) ڤینگەیٚ کوچْگ لە ناو دەروەن ۲) ساوڕ ف ۱) صدای پرتاب سنگ در دره ۲) شبح

**شاوەرس** şawer̂îs ماریەتدار، خاوەن کەسایەتی، ئەو کەسە گ وە نفتەیٚ شاهان ڕەژیاس ف کسی که از نژاد شاهان است، متشخص

**شاوەزیری** şa wezîrî گەمەیگە ف بازیی است

**شاوەیٚ دەس** şaweŷ des پووقەیٚ دەس ف کنایه از صدای کار کردنی که با دست انجام می‌شود

**شاوی** şawî سووکەناو شاواز ف مخفف شهباز

**شاوێار** şawêar دیەکەیگە لە پشت دەروەن ف روستایی در پشت دَروَن

**شاه** şah پاتشا ف پادشاه

**شاهان** şahan ۱) شایان ۲) ناوێگەکوڕانە ف ۱) شایان، شایسته ۲) نامی مردانه

**شاهانە** şahane ۱) وەک پاتشا ۲) شاێسەیٚ شا ف ۱) شاهانه ۲) درخور شاه

**شاهوو** şahû ۱) ناوێگە ژنانە ۲) کۆیەیگە لە هەورامان «شا = بن، بنچینە+ هوو = هوەر» خوەر نشین ف ۱) نامی زنانه ۲) کوهی در اورامان «شا = نشینگاه، محل استقرار+ هوو = هوەر یا خوەر» یعنی محل استقرار آفتاب

**شاهەنشا** şahenşa پاتشا ف شاهنشاه

**شاهەیاسی** şaheŷasî یەکێ لە خاندانەیلْ یارسانە لە بنەماڵەیٚ شائەیاز یا شاهەیاس و چەرخەنشینْ ئی بنەماڵە خاتۆن «مەلەک جانی خوەیشکْ نوورعەلی ئلاهی، دۆکتر بارام ئلاهی کوڕ نوورعەلی» ف یکی از خاندانهای یارسان منسوب به شاه ایاز، مسندنشینان این خاندان «ملک جانی خواهر نور علی الهی، دکتر بهرام الهی فرزند نورعلی الهی» است

**شاهی** şahî پاتشای ف شاهنشاهی

**شاهێل** şahêł هێڵ گەورا ف شخم عمیق

**شاهین** şahîn ۱) باڵدارێگە، لە ئەوستا (seıîne سە ئینە) نۆسریاس ۲) سەوزی خۆراکی ۳) نیشانەیٚ ترازۆ ٤) ناوێگە کوڕانە ف ۱) پرنده شاهین، در اوستا (seıîne سئینه) نوشته شده ۲) سبزی خوراکی ۳) شاهین ترازو ٤) نامی مردانه

**شایار** şayar شالیار ف شهریار

**شایان** şayan ۱) شاێسە ۲) شاهانە ۳) ناوێگەکوڕانە ف ۱) لایق، شایسته ۲) شاهانه ۳) نامی مردانه

**شایجه** şayce ناوێگه ژنانه ف نامی دختزانه

**شائر** şaêr بەیتەڵوەس ف شاعر

**شائرئۆش** şaêr üş شائر ف شاعر

**شائر وێش** şaêr wêş شائر ف شاعر

**شائری** şaêrî شێعر وەتن ف مجادله شعری

**شائسه** şaêse شایان ف شایسته

**شائ قووقوو** şaê qûqû رەوادیاێگه له کۆیەێ کوورکوور ف روادگاهی در کوه کورکور

**شائ ماران** şaê maran پاشائ ماران، له وێەردە باوەڕ مەردم ئەوە بۆیه کْ ماران پاتشایان هەس و ئەگەر مارێگ کوشتنه لاتاۆسێگ گەنم کولاننه و نەزرْ شائ ماران کردنه تا مارەیلْ ترەک خۆنیەریان نەوەن ف شاه‌ماران، در گذشته مردم بر این اعتقاد بودند که مارها نیز برای خود پادشاه دارند و چنانچه ماری را می‌کشتند کمی گندم آبپز برای شاه‌ماران نذر می‌کردند تا از انتقام او در امان باشند

**شائ مەشکەدڕان** şaê meşke dir̂an پشیله ف کنایه از گربه

**شاینگان** şayingan دیەکەێگه له ڕەوانسەر ف روستایی در روانسر

**شاینی** şayinî دیەکەێگه له شیان ف روستایی در شیان

**شای وای** şay way واتوور ف شایعه، سخن بیمورد

**شاێەت** şaŷet ۱) شات، گەواە ۲) گاهس ف ۱) شاهد ۲) شاید

**شاێەتی** şaŷetî شاتی ف بەگواهی، شهادت

**شاێەد** şaŷed بنووڕە شایەت ف نگا **شایەت**

**شاێەدی** şaŷedî شاتی ف به گواهی

**شاێەدی دان** şaŷedî dan شاتیدان ف گواهی دادن

**شایی** şayî ۱) خوەشی ۲) پاتشای ف ۱) شادی ۲) شاهی

**شایین** şayîn ۱) گیاێگه خواردەمەنی ۲) جووریێ بازە ۳) نیشانەێ ترازۆ ف ۱) گیاه شاهین ۲) پرنده شاهین ۳) شاهین ترازو

**شپرزه** şipirze ۱) نەپێچیایێ، شفته ۲) ئاڵووز و پەکەر ف ۱) قنداق نپیچده شده ۲) پریشان و درهم

**شپرزی** şipirzî دیلْمی ف تنبلی

**شپرزیاگ** şipirziyag بنووڕە شپرزه ف نگا **شپرزه**

**شپیلْک** şipîlik منال، شەپل ف کودک گوشتالوو و زیبا

**شتاو** şitaw وه تن، وه تاو ف شتاب

**شتر** şitir شوتر ف شُتر

**شترخار** şitirxar ئاغووڵ ف شترخار، خاری است

**شترخوان** şitirxwan ئاغووڵ ف خار شترخار

**شترمل** şitirmil ملشوور ف گردن دراز

**شتْ شڕ** şiti şir̂ کتْ کۆیەنه ف فرسوده وکهنه، ژنده

**شتوور** şitûr ۱) تووفان کردن ۲) وه پتەکەنەێگەو نووڕسن « سەێڕْ چەوێ که چْ شتووریێ دەێد- مەر حاکم له نوو ئدائ زووریێ کەێد» ف ۱) کولاک کردن هوا ۲) جستجویانه نگریستن

**شت وشوور** şit û şûr شفت وشوور ف شستشو

**شخار** şixar زنوو «ل» ف شلوغی، همهمه

**شخارته** şixarte شەخارته ف کبریت

**شخڵ** şixl̂ سەر وشخڵ، ملوانکێگه ک وه سکه درسێ کەن «چەترەگەد قنج که تا خوەشنەما بوو- تەرتێفێ له بانْ شخڵ و گوونا بوو» ف نوعی گردنبند که با سکه درست می‌کنند

**شڕ** şir̂ کۆیەنه، له لاتین (shred) و (shre) ئۆشن ف کهنه، در لاتین (shred) و (shre) گویند

**شرا** şira ۱) شەرائ گەرما ۲) تا سەرحەدْ، تا کەوشەنْ ف ۱) گرمای زیاد، شراره ۲) تا سر حد…

**شرپ** şirp ۱) جرپ ۲) دەنگْ چەپاڵه ف ۱) شیشکی ۲) صدای سیلی زدن

**شرپْتووپ** şirpi tûp شرپْ کوت، له سەکزی «شرپا شره» ئۆشن ف صدای کتککاری، در سکزی «شرپا شره» گویند

**شرپْکوت** şirpi kwit زرمْکوت ف صدای کتککاری

**شرپه** şirpe شرپەێ دەس ف صدای زدن با دست

**شرت** şirt ۱) تەنکه ۲) ئاوڕۆ، حەیا ف ۱) مایو، شورت ۲) آبرو

**شڕتاڵ** şir̂tal̂ کۆیەنه ف کهنه

**شرتْپرت** şirti pirt تێرخراو یەکتران کردن ف ناسزا گفتن

**شڕشڕ** şir̂ şir̂ چووڕەێ ئاو ف شُرشُر آب

**شڕشڕه** şir̂ şir̂e دیەکەێگەله لوڕستان ف روستایی با گویش لکی در لُرستان

**شڕشێت** şir̂i şêt سەرشێت ف دیوانه‌سر

**شڕوڕْ** şir̂i wir̂ ۱) دەری وەری وەتن ۲) کتْ کۆیەنه ف ۱) بیهوده‌گویی ۲) کهنه

**شڕوشیتاڵ** şir̂ û şîtal̂ شڕتاڵ ف کهنه

**شرەخاڵ** şirêxaĺ خڕخاڵ ئەسپْ هەوڵ و کووچ «لەیٚ نوو هاتەوە هەوڵ کوردە ماڵ- زرەیٚ زەنگیانە، شرەیٚ شرەخاڵ- خوداڵەم شکر وەهار هاتەوە- سییەماڵان پەخش بۆ وە وڵاتەوە» ف زنگولە و آویزی پشمین کە بر گردن اسب کوچ می اندازند

**شریت** şirît ۱) رەتْ مل «دامە لە شریتەیٚ ملیٚ» ۲) جووریٚ رەسنْ قەێتانیە ف ۱) مفاصل گردن از پشت ۲) نوعی رسن کە با الیاف درست می‌شود

**شریتە** şirîte زەنجیرە ف زنجیرە

**شریتەیٚ مل** şirîteŷ mil پووقْ مل ف پشت گردن، مفاصل گردن

**شریخانن** şirîxanin شریقانن ف صدای رعدآسا

**شریخە** şirîxe شریقە ف غرش

**شریخەشریخ** şirîxe şirîx شریقە ف غرش پیاپی

**شریف** şirîf شلیفە ف گونی بزرگ حمل کاە

**شریفە** şirîfe شلیفە ف نگا **شریف**

**شریق** şirîq شریخ ف صدای رعدآسا

**شریقانن** şirîqanin شریخانن، لە لاتین (shriek) ئۆشن ف صدای رعدآسا، در لاتین (sheiek) گویند

**شریقْ شاق** şirîqi şaq ۱) شریخە ۲) قاڵبخوڕ ف ۱) غرش پیاپی ۲) جنجال، همهمە

**شریقە** şirîqe شریخە ف غرش رعد آسا

**شرین** şirîn ۱) تامْ شیرین، لە سمنانی (şirîn شرین) ئۆشن ۲) ناوێگە ژنانە ۳) نازدار، نازار ٤) ناز کردن لە ماملّە «شرینیٚ مەکە» ف ۱) مزە شیرین، در سمنانی (şirîn شرین) گویند ۲) نامی زنانە ۳) ناز دار، ناز روا ٤) اغوا کردن معاملە، شیرین کردن معاملە

**شرینبرا** şirîn bira ناوێگە کوڕانە ف نامی مردانە

**شرینجق** şirîn ciq خواردەمەنیێگ کْ تامْ شیرینی دەێد ف غذایی کە مزەاش بە شیرینی می‌گراید

**شرینخەو** şirîn xew شیرین خەو ف رویا، رویاگونە

**شرینزووان** şirîn zuwan خوەش قسیە ف شیرین سخن

**شرینسووار** şirîn suwar سووارخاس ف چابکسوار، سوار آراستە شدە

**شرینشاتەرە** şirîn şaterê گیاێگە چۆ شنگ ف گیاهی خوراکی شبیە شنگ

**شرینشاوە** şirîn şawe جووریٚ حاجی لەقلەقە ف نوعی مرغ ماهیخوار

**شرینشێوە** şirîn şêwe نازار ف خوش سیما و طناز

**شرینکردن** şirîn kirdin ۱) شیرین کردن خۆراک ۲) لفت وگفت لە ماملّە ف ۱) شیرین کردن خوراکی ۲) بالا وپایین کردن قیمت در معاملە

**شرینە** şirîne ۱) شرین ۲) جووریٚ ئافەتە ف ۱) نامی زنانە ۲) نوعی آفت شتە

**شرینی** şirînî ۱) جووریٚ خواردەمەنیە، شیرینی ۲) مزیانی ، دەسخوەشی ۳) نازاری کردن ف ۱) شیرینی ۲) شیرینی، مژدگانی ۳) نازداری، طنازی

**شش** şiş سپیٚ ف شپش

**ششن** şişin ششو ف شپشو

**ششو** şişû ششن ف شپشو

**شفا** şifa دەرمان پێا کردن ف شفا

**شفادان** şifa dan شفا لە لایٚ خودا و... ف شفا یافتن

**شفا ولاڵە** şifa û laĺe شەفا ولاڵە ف درخواست از کسی بویژە خدا با حالت لابە و زاری

**شفتْشوو** şifti şû ۱) شوورتن ۲) بێنمازی ف ۱) شستن ۲) قاعدگی

**شفتْشوور** şifti şûr ۱) شوورتن ۲) بێنمازی ف ۱) شستن ۲) قاعدگی

**شفتە** şifte ۱) شفڵە، فەلە ۲) مۆیٚ ئاڵووز ۳) مناڵیٚ کْ دی کوڵپێچگیٚ نەکەن ف ۱) بستەبندی نشدە، فلە ۲) موی آشفتە ۳) نوزادی کە دیگر قنداق پیچ نشود

**شفگە** şifge شفتە ف دستەبندی نشدە

**شفگەمەڕازە** şifgemer̂aze گووتەرەیٚ قسیە کردن ف نسنجیدە حرف زدن

**شفگەمەڕازە کردن** şifgemer̂aze kirdin گووتەرە قسە کردن ف نسنجیدە سخن گفتن

**شفڵە** şifĺe بنوورە شفتە ف نگا **شفتە**

**شفوور** şifûr̂ شووفر، لە لاتین (chuffer) ئۆشن ف رانندە، در لاتین (chuffer) گویند

**شڤوون** şivûn شووان «ل» ف چوپان

**شک** şik ۱) دڵەدڵی، گۆمان ۲) ئاگای «شکم وەیٚ کارە نیەڕەسێد» ف ۱) شک، دو دلی ۲) کمترین آگاهی از موضوعی

، آگاهی

**شکار** şikar ۱) راو ۲) کەڵ کۆیەی ف ۱) شکار ۲) کل کوهی

**شکاربڕ** şikarbiȓ بانْ مازێ پەس ف قسمت رویی پشت گوسفند و بُز و ...

**شکاک** şikak هووزێگێ له کوردەیل ف عشیرەای از کُردان در شمال کُردستان

**شکان** şikan ۱) هۆرد کرد ۲) تسان ۳) رووژە بەتاڵ کردن ۴) شکیان ف ۱) شکست، خُرد کرد ۲) جفت گیری ماکیان ۳) شکستن روزه ۴) از قدر و منزلت افتادن

**شکانن** şikanin ۱) هۆردکردن ۲) بەتاڵ کردنْ رووژە ۳) تسانن ۴) شکەس دان له جەنگ ۵) ئەڵشکیان له ناو خەڵکان ۶) خامێش کردن ف ۱) خُرد کردن ۲) شکستن روزه ۳) جفتگیری ماکیان ۴) شکست دادن ۵) از قدر و منزلت افتادن ۶) شکستن

**شکر** şikir سپاس ف شُکر

**شکْس** şikis شکەست ف شکست

**شکسته** şikiste ۱) شکەس خواردێ ۲) لاناوەله پیر ۳) شکیاێ ف ۱) شکست خورده ۲) کنایه از پیر و فرتوت ۳) شکسته

**شکسته بۆن** şikiste bün پیر بۆن ف کنایه از پیر شدن

**شکه** şike باشکانێ ف گویا، احتمالا

**شکەس** şikes شکەست ف شکست

**شکەس خواردن** şikes xwardin ئەڵشکیان ف شکست خوردن

**شکیا** şikya هۆرد بۆ ف شکسته شده

**شکیاس** şikyas هۆرد بۆیە ف شکسته شدەاست

**شکیاگ** şikyag شکیاێ ف شکسته شده

**شکیان** şikyan ئەڵشکیان ف شکسته شدن

**شکیاێ** şikyaê شکیاێ ف شکسته شده

**شل** şil ۱) سس ۲) ئاوەکی ف ۱) سست، شل ۲) آبکی

**شڵ** şiĺ ۱) سەونز وخاڵ خاڵ «شڵ و گوڵه مۆ نەیێرێ چووار پا دێرێ دۆ نەیێرێ» ۲) چەقوو دانْ پووس ف ۱) سبز مات و خالخال ۲) زمانی که پوست جوشهای چرکین میزند آنرا با چاقو زخم میکنند تا چرک از آن خارج شود این عمل را «شڵ کردن» گویند

**شلا بۆن** şila bün ۱) شلەو بۆن ۲) پشت سەردی ف ۱) سست شدن ۲) دست کشیدن از کاری، ناامیدی

**شلا کردن** şila kirdin ۱) شلەو کردن ۲) پشت سەرد بۆن ف ۱) شل کردن ۲) ناامید کردن، سرد کردن از کاری

**شلاڵ** şiĺaĺ ساف ف صاف، صاف ونرم

**شل بۆن** şil bün شلا بۆن ف نگا **شلابۆن**

**شڵپ** şiĺp ۱) شڵپە ۲) دەنگْ زیله یا گورمێچه ف ۱) صدای برخورد یا افتادن چیزی در آب ۲) صدای ضربه زدن با سیلی یا مشت

**شڵپاو** şiĺpaw چڵپاو ف گل ولای آبکی

**شڵپاوخەڕێ** şiĺpaw xeȓê چڵپاو خەڕێ ف گل ولای آبکی

**شڵپْ شاپ** şiĺpi şap شڵپە شڵپ ف صدای شلاپ شلوپ پیاپی

**شڵپ وکوت** şiĺp û kwit دەنگْ فەڵەک کردن ف صدای کتککاری

**شڵپە** şiĺpe بنوورە شڵپ ف نگا **شڵپ**

**شڵپەشڵپ** şiĺpe şiĺp شڵپْشاپ ف نگا **شڵپْشاپ**

**شڵتاخ** şiĺtax ئەربە ف شلاق

**شڵچڕ** şiĺçiȓ وه باوەڕ مەردم هنائ کەسێگ له خەوا رێ کەێد ئۆشن شڵچڕ چڕێدنەێ، جوورێ گیانەوەرْ خێاڵیه ف به باور مردم وقتی کسی درخواب راه میرود گویند «شڵچڕ» او را صدا میکند، احتمالا جانوری خیالی و خرافاتی است

**شلْخ** şilix زێژْ خەڵوەت ف شلوغ

**شلْخام** şilixam شل وخام ف وارفته وشل

**شلْخانن** şilixanin وه یەک دان ف بر هم زدن

**شلْخا وپلْخ** şilixaw pilix شلْخیان ف شلوغ و پلوغ

**شلْخای** şilixay شلْخی ف شلوغی

**شلْخاێ پلْخ** şilixaê pilix شلْخپلْخ ف همهمه

**شلْخ بۆن** şilix bün زێژْ خەڵوەت بۆن ف شلوغ شدن

**شلْخپلْخ** şilix pilix شلْخ ف شلوغ پلوغ

**شلْخ کردن** şilix kirdin چەتۆنی ف شلوغ کردن

**شلْخی** şilixî شلْخ ف شلوغی

**شلْخیان** şilixiyan وەیەک خواردن ف برهم خوردن

**شلْخیانه یەک** şilixiyane yek رشیانه یەک ف ریختند به هم، به جان هم افتادن

**شلشل** şilşil شلەشله ف آهسته آهسته

**شلّغ** şiĺx́ شلّغه ف صدای بهم زدن مشک

**شلّغْپلّغ** şiĺx́i piĺx́ شلّغْشاق ف صدای پیاپی بهم زدن مشک

**شلّغْشاق** şiĺx́i şaq شلّغْپلّغ ف صدای پیاپی بهم زدن مشک

**شلّغه** şiĺx́e شلّغ ف صدای بهم زدن مشک

**شلق** şiliq بنووڕە شلْغ ف نگا **شلْغ**

**شلّق** şiĺiq پلّقه، پلّق ف صدای شلوپ مایعات

**شلّقانن** şiĺiqanin پلّقانن ف صدای ترکیدن

**شلّقْشاق** şiĺiqi şaq شلّقەیْ هەیتاهەیت ف صدای «شلّقه » پیاپی

**شل کردن** şil kirdin شلا کردن ف نگا **شلا کردن**

**شڵ کردن** şiĺ kirdin وه چەقوو لاشلاش کردنْ پووس ئڕایْ کیشانْ چرک و زۆخ ف با چاقو زخم کردن پوست برای دفع چرک از زیر پوست

**شلکینه** şilkîne شلْگینه، خواردەمەنییگه له خەتر و رۆنْ دان ف خوراکی از خمیر و روغن حیوانی که بصورت کلوچه سرخ کنند

**شلْگ** şilig لاناوەله شل و تەمەڵ ف آدم شل و وارفته

**شلْگاوی** şiligawî ئاوەکی ف آبکی

**شلگه** şilge شلگینه ف قسمت فوقانی سر نوزاد که هنوز نرم است و استخوان نگرفته

**شلگینه** şilgîne بنووڕە شلگه ف نگا **شلگه**

**شلّنگ** şiĺing ١) شلّنگْ خوەیْ دان ٢) لۆلەیْ لاسیکی ف ١) خود را آماده کار کردن، بر خود نهیب زدن ٢) شلنگ

**شلّنگْ خوەیْ دان** şiĺingi xweŷ dan خوەیْ تیّار کردن ف خود را آماده کاری کردن، برخود نهیب زدن، خود را سرزنش کردن

**شلّ واقه** şiĺwaqe بێحاڵ وسس ف سست و بیحال

**شلّووپ** şiĺûp بنووڕە شلّپ ف نگا **شلّپ** و ترکیباتش

**شل وشێویایْ** şil û şêwyaê شپرزه ف سست و نا مرتب

**شل ومل** şil û mil ١) جووانی دار ٢) سس، بیْ هاز ٣) سەر و شڵ، بەتیه «خوەیشکەیل مراخان دەس وه ئاردەوه – پۆشی شل ومل خاڵان شاردەوه» ف ١) زیبای خوش اندام، بویژه برای دختران ٢) سست و بیحال ٣) نوعی روسری مزین به سکه ومنجق

**شل و وڵ** şil û wil شلْخام ف شل و وارفته

**شله** şile ١) خواردەمەنی ئاوەکی ٢) سسه ف ١) آش آبکی ٢) سست است

**شلەجا** şileca زێزْ سل وەجا ف خوب جویدن

**شلەژان** şilejan ژانْ ئەنام ف درد اندام

**شلەشل** şile şil نەرمه نەرم ف نرم نرمک

**شلەکوت** şilekwit نیمەکوت و تەرت کردنْ خەرمان وه چان ف نیمه‌کوب کردن خرمن درو شده با «چان»

**شلەکینه** şilekîne شەلەکینه ف نگا **شەلەکینه**

**شلەگۆ** şile gü شلەهڕ ف فضولات آبکی احشام

**شلەو بۆن** şilew bün شلا بۆن ف نگا **شلابۆن**

**شلەو کردن** şilew kirdin شلا کردن ف نگا **شلا کردن**

**شلەهڕ** şilehir̂ شلەگۆ ف نگا **شلەگۆ**

**شلی** şilî سسی ف سستی، شُلی

**شلیت** şilît بنووڕە شریت ف نگا **شریت**

**شلیفه** şilîfe شریفه ف گونی بزرگتر از گونی معمولی برای حمل کاه

**شلێ ملێ** şilê milê شاڵدۆڕەکی ف نگا**شاڵدۆڕەکی**

**شمار** şimar ژمار ف شمار

**شمارتن** şimartin ژمارتن ف شمردن

**شماردن** şimardin شمارتن ف شمردن

**شماره** şimare ژماره ف شماره

**شماره کردن** şimare kirdin ژمارتن ف شمردن

**شماڵ** şimaĺ شەماڵ، له ئەدەبیاتْ کوردی نیشانەیْ ئومێد، ئەوین و ئارەزووه ف بادی که از غرب به شرق میوزد، در ادبیات کردی نشانەی امید، عشق، شمیم و آرزو بکار برده می‌شود

**شمامه** şimame شەمامه ف دستنبو

**شمڕ** şimr̂ شمڵ، وەرگێڕ له ناو «شمر ابن ذوڵجوشن » ف بی سر و پا «شمر ابن ذولجوشن»

**شمڕْ** şimir̂ ئەربه ف شلاق

**شمڕدۆ** şimir̂ dü کەسیْ کْ هووکاره بۆیه گوچانیْ بگرێده پشتْ قنگەو ف کسی که همیشه چوبدستی به حالت آماده در دست دارد

**شمس** şims شمش «شمسْ یەخ» ف شمش

**شمشاڵ** şimşaĺ جووریْ بلووره ف نیلبک فلزی

**شمشه** şimşe تەختە ترازْ بەنا ف شمشه بنایی

**شمشێر** şimşêr ١) شەمشێر ٢) دیەکەێگە لە پاوە ف ١) شمشیر ٢) روستایی در پاوه

**شمشێربالْ** şimşêr baʃ جووریْ سیبەپرۆسنەکە ف نوعی پرستو

**شمشێرْ زاخ دریایْ** şimşêri zax diryaê لاناوە لە زاتدار ف کنایه از شجاع

**شمشێره** şimşêre ١) پشتەکْ دەرانە ٢) بەشێگە لە گاواسن کْ کوریە دەێدە قەیْ تیردار، گاوەنار ف ١) کلون در ٢) قسمتی از گاوآهن که «کوریه» را به تیر دار وصل می‌کند

**شمشیله** şimşîle بنوورە شمشێرە ف نگا **شمشێره**

**شمقارِ** şimqar̂ شەنقارِ، مەلیگە ف پرنده‌ای است، شنقار

**شملْ** şimʃ بنوورە شمرِ ف نگا **شمرِ**

**شملیه** şimilye گیاێگە خوەشبوو، لە سەکزی «شملی» ئۆشن ف گیاه شنبلیله، در سکزی «شملی» گویند

**شن** şin چەکْرێز، لە لاتینی (sand) ئۆسریاس ف شن، ماسه درشت، در لاتین (sand) نوشته شده

**شناس** şinas ١) پاشگرْ زانایی وناسین ٢) ئاشنا ف ١) پسوند شناختن و دانایی ٢) آشنا

**شناسانن** şinasanin ناسانن ف شناساندن

**شناسنامه** şinasname سجیل ف شناسنامه

**شناسه** şinase بەڵەیە ف بلده، آشنا

**شناسین** şinasîn ناسین ف شناختن

**شنگ** şinĝ گیاێگە خواردەمەنی، لە سۆرانی «ئەسپنگ، ئەسپینگ» ئۆشن و لە سمنانی (şinge شنگه) ئۆشن ف گیاه شنگ که خوراکی است، در سۆرانی «ئەسپنگ، ئەسپینگ » در سمنانی (şinge شنگه) گویند

**شنگزراته** şinĝ zir̂ate جووریْ شنگْ وڵنگ پیپەنە ف نوعی شنگ برگ پهن

**شنه** şine ١) سروە، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «شنۆ» ئۆشن ٢) کشت وکاڵ درەو بۆ و نەکوتیایْ ٣) دەنگْ هنەهن ف ١) نسیم، در دیگر گویشهای کردی «شنۆ» گویند ٢) مزرعه‌ای که درو شده و هنوز کوبیده نشده ٣) هن هن، صدای نفس خسته

**شنەبا** şine ba شنەوا ف باد ملایم، نسیم

**شنەشن** şine şin هنەهن ف هن هن

**شنەفتن** şineftin بنوورە ئەژنەفتن ف نگا **ئەژنەفتن**

**شنەوا** şinewa ١) شنەبا ٢) ژنەوا ف ١) نسیم ٢) شنوا

**شنەیل** şineyl کۆیەێگە لە پەراو ک جووریْ دار دێریْ ک «شەن» وە پیْ درْس کەن ف کوهی در پراو که درختان ویژه‌ای دارد که ازچوب آن «شەن» یا افشون بوجاری درست کنند

**شۆ** şü پیایْ ژن ف شوهر

**شوُالْ** şuwaʃ پاپووش، لە سمنانی (şuwaʃ شووالْ) ئۆشن ف شلوار، در سمنانی (şuwaʃ شوال) گویند

**شوُالْ سووارانه** şuwaʃ suwarane پاپووشْ مەردمْ کرمانج ف شلوار مخصوص کردان کرمانج

**شواڵه** şuaʃe شێوڵ، هەندرِ ف لایه به لایه

**شواڵەشواڵه** şuaʃe şuaʃe شێوڵ شێوڵ ف لایه به لایه، متورق

**شواڵەکەنگ** şuaʃe kenig گیاێگە ئرایْ رەوانکردنْ رووده ف گیاهی مسهل

**شواڵەکەواو** şuaʃe kewaw شێوڵە برشن، هاوتایْ ( ئسنەیک) ف گوشت را به صورت مدور بریدن و در (ساج) کباب کردن، همتای (اسنیک)

**شوُان** şuwan ١) چاودێرکەرْ رییەن ٢) ناوێگەکورانە ف ١) چوپان ٢) نامی مردانه

**شوُانانه** şuwanane پامزْ شوان ف مزد چوپان

**شوُانخەڵەتنه** şuwan xeʃetine ١) مەلەوەرێگە ٢) مانگْ خاکەلییە ف ١) شبان فریب، پرنده‌ای است ٢) کنایه از اسفند ماه که گیاهان سبز می‌شوند

**شوُان شووان** şuwan şuwan گەمەێگە ف بازیی کودکانه

**شوُانکاره** şuwankare ١) ئێڵێگە ٢) دیەکەێگە لە جووانرۆ ٣) دیەکەێگە لە رەوانسەر ف ١) عشیرتی از کُردان که در مناطق ایران پخش شده‌اند ٢) روستایی در جوانرود ٣) نام روستایی در روانسر

**شوُانی** şuwanî وەرەلەوانی ف چوپانی

**شوُاو** şuwaw جووانی ف جوانی، عربی است

**شۆبرا** şübira شۆرا ف برادر شوهر

**شۆبرا ژن** şübira jin دش ف زن برادر شوهر

**شۆت** şüt ١) گیایْگە ٢) فیکە، لە لاتین (shout) وە مانایْ هاوار کردنە ٣) پێشگرْ دەمەوەری «شۆتْ شات» ٤) شۆت کردن وە تووپ ف ١) گیاه شوئید ٢) سوت زدن، در لاتین

(shout) به معنی فریاد کردن است ٣) پیشوند کولیگری ٤) شوت زدن به توپ

**شۆتْشات** şütişat شیتْشات، له لاتین (shout) ئۆشن ف کولیگری، بدگویی، در لاتین (shout) به معنی بدگویی کردن است

**شۆت کردن** şüt kirdin لەقە دان وە تووپ ف شوت زدن به توپ

**شۆت کیشان** şüt kîşan فیکە کیشان ف سوت زدن

**شۆتە** şüte شۆت «گ» ف گیاه شوئید

**شوُخ** şûx ١) شووق ٢) رەنگین ف ١) شوخ طبع ٢) زیبا، دلفریب

**شوُخ وشەنگ** şûx û şenĝ شووخ ف خوشگل، شوخ و شنگ

**شوُخی** şûxî یاری ف شوخی کردن

**شۆدار** şüdar ژنێگ کْ شۆ بێاشتوو ف زن شوهردار

**شۆدان** şüdan ١) رسوا کردن ٢) وە شۆ دان ف ١) کنایه از رسوا کردن ٢) شوهر دادن

**شۆڕ** şor̂ دەنگْ ئاو ف شُرشُر آب

**شوُڕ** şûr̂ ١) لانەماێ کاوڕێگە ٢) دریژ ف ١) نژاد گوسفندی است ٢) دراز

**شوُرئاواێ عەلیمراێ** şûrawaê élîmiraê دیەکە یَگە لە مایَەشت ف روستایی در مادیدشت

**شوُرئاواێ مرتزا** şûrawaê mirtiza دیەکەیَگە لە مایەشت ف روستایی در مادیدشت

**شوُر** şûr ١) سوولْ ٢) پاشگرە وە ماناێ شوورتن ٣) پاشگرە وە ماناێ شفت وشوور کەر ٤) دەسگاێ مووسقی ٥) گیایَگە چۆ سەگبنجگ کْ تامێ شوورە ف ١) شورمزه ٢) پسوند به معنی شستن ٣) پسوند به معنی شستشو کردن ٤) دستگاه موسیقی شور ٥) گیاهی شبیه «سەگبنجگ» که مزه‌اش شور است

**شۆرا** şüra شۆبرا ف برادر شوهر

**شوُڕا بۆن** şûr̂a bün دریژەو بۆن ف دراز شدن

**شۆراک** sürak شێرەکە کردن «ل» ف تشجیع، شیر کردن

**شۆراک کردن** sürak kirdin شێرەکە کردن «ل» ف شیر کردن، تحریک کردن

**شوُڕا کردن** şûr̂a kirdin دڕەو کردن ف دراز کردن

**شوُراو** şûraw ئاوْ شوور ف آب شور

**شوُراوا** şûrawa ١) مەڵوەنێگە لە چەرداوڕ ٢) ناوْ دیەکەیَگە لە سۆنقۆر ف ١) منطقه‌ای در چرداول ٢) روستایی در سنقر

**شوُڕ بۆن** şûr̂ bün شووڕەو بۆن ف دراز شدن

**شۆرت** şort شرت، تەنکە ف مایو، شورت

**شوُرت** şûrt ١) نۆغم، نادیار ٢) شوورد ف ١) گم، ناپیدا ٢) شست، فعل شستن برای سوم شخص

**شۆرتْک** şürtik شۆرتْگ ف گیاهی است

**شۆرتْگ** şürtig شۆرتْک ف گیاهی است

**شوُرتن** şûrtin شووردن ف شستن

**شوُردن** şûrdin شوورتن ف شستن

**شوُڕش** şûr̂iş ١) سەرهەڵدان ٢) ناوێگەکوڕانە ف ١) شورش ٢) نامی مردانه

**شوُڕ کردن** şûr̂ kirdin شووڕا کردن ف دراز کردن

**شوُرمانگا** şûrmanĝa شوومایَە، شوورمانگە ف غسلخانه، محلی که جنازه غسل داده شده راآنجا می‌گذارند تا آبش چکیده شود

**شوُرمانگە** şûrmanĝe شوومایَە، شوومانگە ف غسل خانه ، ترمی که جنازه غسل داده شده را روی آن می‌گذارند تا آبش چکیده شود

**شوُرمەزە** şûr meze شوورتام ف شورمزه

**شوُروا** şûrwa ١) ئاو نەواڵەێ یارسان ٢) خواردەمەنی ئاوەکی و شوور ٣) ئاوگوشت ف ١) آبی که از «نەواله» که نذری یارستان است و حالتی سوپ مانند دارد ٢) شوربا ٣) آبگوشت

**شۆڕە** şor̂e شۆڕە شۆڕ ئاو ف شُرشُر آب

**شوُرە** şûre ١) سوولە ٢) کەویشکْ سەر ف ١) شور است ٢) شوره‌ی سر

**شوُڕە** şûr̂e دریژە ف دراز است

**شۆرە** şüre عەیب «گ» ف عیب وعار

**شۆرەئی** şüreıî عەیب و عار «گ»، لەهەورامی «شه » و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «چوو» ئۆشن و لە لاتین (shame) ف عیب وعار، در گویش اورامانی «شه» و در دیگر گویشهای کردی «چوو» و در لاتین (shame) گویند

**شوُڕەژن** şûr̂e jin ژنْ رەنگین ف زن زیبا

**شوُڕەسووار** şûr̂e suwar خاسە سووار ف سوارکار ماهر

**شۆڕەشۆڕ** şorê şor چوورە چووڕ ف شُرشُر آب

**شوورەكات** şûrekat زڕوان ف شورەزار

**شوورەو بۆن** şûrêw bün شووڕا بۆن ف دراز شدن

**شوورەو كردن** şûrêw kirdin شووڕا كردن ف دراز كردن

**شۆری** şürî پەیشروو دان ف معرفی دادن، شناساندن

**شووریا** şûrya وە ئاو شووریاێ ف شسته شد

**شووریاگ** şûryag شووریاێ ف شسته شده

**شووریان** şûryan شوورتن ف شسته شدن

**شووریاێ** şûryaê شووریاگ ف شسته شده

**شوورین** şûrîn شووردن ف شستن

**شۆشمێ** şoşmê دیەكەیگە لە پاوە ف روستایی در پاوه

**شووفار** şûfar برەسان، سیخوڕ ف سخن‌چین، جاسوس

**شووفاری** şûfarî سیخوڕی ف جاسوسی

**شووفای** şûfay هەگوە، جانتای ف هنبانه، جوال

**شووفر** şûfir شفووڕ ف راننده

**شووق** şûq بنوورە شووخ ف نگا **شووخ** و تركیباتش

**شۆقاق** şoqaq شەقاق ف نگا **شەقاق**

**شۆكر** şokr شكر ف سپاس

**شۆكرانە** şokrane ۱) خەێرات ۲) لە داب ونەریتەیلْ یارسانە ف ۱) شكرانه ۲) یكی از مراسمات معنوی نذر دادن مردمان یارسان

**شۆكردن** şü kirdin وە ئەخدْ كەسێ دراتن ف شوهر كردن ، ازدواج كردن

**شووكە** şûke ۱) بەرْ مازوو ۲) شیرەێ بەڕۆ كْ دۆیاێ كوڵانن خەسەو بوود و چۆ هەسەڵە ف ۱) نوعی ثمر مازو ۲) شكركی كه بر روی كاسه بلوط ایجاد می‌شود و پس از جوشاندن و تغلیظ كردن مانند عسل شیرین است

**شۆل** şol شل، سس ف شُل، سست

**شووڵ** şûڵ دۆتای، خورج ف نوعی خورجین

**شۆل** şül شرشر «گ» ف شُرشُر آب

**شووڵ دەم** şûڵ dem كیف دەم، دەم وشا ف آنكه دهان گشاد دارد

**شوم** şum ۱) شام «ل» ۲) بەدرەژەن ف ۱) شام ۲) نحس

**شۆم** şom شۆیەم «ل» ف شخم

**شوماتگ** şûmatig بن وبنچینە، بنچینە ف اساس، پایه، ریشه

**شومانگە** şûmanĝe شوورمانگە ف نگا **شوورمانگە**

**شومایە** şûmaŷe شوورمانگە ف نگا **شوورمانگە**

**شوون** şûn ۱) رەت ۲) ئاسەوار ۳) دۆیاێ ٤) جی ٥) پەیمان «شەرت وشوون» ف ۱) رد، اثر ۲) آثار، اثر ۳) پس از ٤) جا، مكان ٥) پیمان

**شوونبەر** şûnber شوونْ دز بەر ف كسی كه رد دزدان را می‌برد

**شوون‌پەشێو** şûn peşêw رەد گۆم كردن ف رد گم كردن

**شوون‌پەشێوی** şûn peşêwî شوون پەشێو ف رد گم كردن

**شوون خسن** şûn xisin وە شوون خسن ف همراه كردن

**شوون دان** şûn dan نوون دان ف آدرس دادن

**شوونْد بوور** şûnid bûr دۆرەو بە ف گم شو

**شوون كەفتن** şûn keftin ۱) تالّوو بۆن ۲) وە شوون كەفتن ف ۱) پیروی كردن ۲) تعقیب كردن

**شوونگر** şûngir شوونگیر ف پیگیر كارها

**شوونگرتن** şûngirtin شوونگر بۆن ف ردیابی كردن، دنبال كردن

**شوون گۆم** şûn gom بێ سەر و شوون چین ف بی نام نشان رفتن، بی هیچ آدرسی رفتن

**شوونگۆمكردن** şûn gom kirdin شوون پەشێوی ف رد گم كردن

**شوونْ لوور** şûni lûr جی لوور ف جا ومكان

**شوون میلكان** şûn mîlkan شوون زمێە ف آثار بجا مانده از كوچ

**شوون نان** şûn nan وە شوون نان ف دنبال كردن

**شوونْ نووندار** şûni nûndar زێزْ ئاشاریاێ ف با اصل و نسب

**شوون ونوون** şûn û nûn ناو نیشان ف آدرس

**شوون ونوون دان** şûn û nûn dan ناو نیشان دان ف آدرس دادن

**شوون وەشوون** şûn we şûn هەردە وە هەردە ف منزل به منزل

**شوون هەڵگرتن** şûn heڵgirtin شوون گرتن ف رد یابی كردن

**شۆنە** şone خشی «ل» ف هزار پا

**شوێ** şuwê شەوە ف كابوس

**شوێ بریان** şiwê bir̂yan شووریٚ دراوردن ف شورش را در آوردن

**شوُێ دراوردن** şuwê dirawrdin شووێ برین ف شور کاری را درآوردن، شورش را درآوردن

**شوُێ گرتن** şuwê girtin شەوە گرتن ف دچار کابوس شدن

**شوُێ شووێ** şuwê şuwê کەم کەم، ئەرەوییە ف یواش یواش

**شتویەڵە** şüyeļe گڕ ئاگر ف شعله

**شتویەڵە شتویەڵ** şüyeļe şüyeļ گڕگڕ ئاگر ف زبانه کشیدن آتش

**شتویەم** şüyem شۆم، رەن ف شخم

**شتویەم کردن** şüyem kirdin شۆم کردن ف شخم زدن

**شتویەنەو نەر** şüyenew ner ئەرغە ف دو بهم زن

**شەبقە** şebqe جووریٚ کڵاو لیۆەدارە، شەفقە ف کلاه لبەدار

**شەبە** şebe بنوورە شەبیە ف نگا **شەبیە**

**شەبەق** şebeq ١) گوڵ سوو ٢) فرە سییە ف ١) شفق ٢) بسیار سیاه

**شەبیە** şebye جیە خرمان «جەنگ لە شەبیە دووسی لە خەرمان» ف جایی که خرمن را در آن پهن می‌کنند

**شەپ** şep ١) پرمشتێ ٢) کەرەێ نەتاویایٚ ٣) لەتر خواردن ف ١) پـُریک مشت ٢) کره نتابیده‌ای که هنوز از مشک خارج نشده ٣) تکان خوردن برای مایعات

**شەپْ شوور** şepişûr̂ شەپ وشوور ف دراز و بیقواره

**شەپشەپ** şep şep گنگن ف پـُر یک مشت

**شەپْشیر** şepişîr̂ جووریٚ دژمینە «باوگێ لە شەپْ شیرێ» ف دشنامی است

**شەپْگ** şepig خنجی منجی ف کودک زیبا وگوشتالو

**شەپْگی** şepigî شەپْگ ف کودک زیبا وگوشتالو

**شەپـْل** şepil شپیلـْک ف کودک زیبا وگوشتالو

**شەپلاق** şepļaq زیلە، چەپاڵە «ل» ف سیلی

**شەپ وشوور** şep û şûr̂ شەپْشوور ف دراز و بی قواره

**شەپەتۆتان** şepetütan ١) کرپوە ٢) لاناوە لە قێ کردن ف ١) هوای سرد طوفانی ٢) کنایه از غوغا کردن، کولاک کردن برای شخص

**شەپێگ** şepêg یەێ شەپ ف پـُر یک مشت

**شەت** şet چەمْ گەورا، ئەرەوییە ف شط، عربی است

**شەتاڵ** şetaļ شاتاڵ، شڵنگْ خوەێ دان ف کوشیدن، نهیب زدن

**شەتاو** şetaw چەمێ کْ لە وەفراو سەرچەمە گرێد ف رودی که از برفهای آب شده سرچشمه می‌گیرد

**شەتاوان** şetawan ئاو شەتاو ف نگا **شەتاو**

**شەتْپەل** şetipel لەتوپار، لە ئەوستا (şete شەتە) وە مانایٚ بریان وخسـْن تۆسریاس، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی « شەت» وە مانایٚ تیلْمنجەڕ برینە ف پاره پاره، قلع وقمع، در اوستا (şete شته) به‌معنای بریده وانداخته نوشته شده، در دیگر گویشهای کردی «شەت: اریب» گویند

**شەتْپەل کردن** şetipel kirdin لەت وپار کردن ف پاره پاره کردن

**شەتڵ** şetļ تۆلەکی ف نشاء

**شەتڵجاڕ** şetiļcar̂ جی تۆلەکی ف نشاءزار

**شەت وپەل** şet û pel شەتْ پەل ف پاره پاره

**شەت وپەل کردن** şet û pel kirdin شەتْپەل کردن ف پاره پاره کردن

**شەتە** şete ١) ئافەتێگە جوورْ سۆنە ک دەێدە قەێ دار ٢) تەشە ف ١) آفت شته‌ی درختی ٢) آفتهای موسمی

**شەتەک** şetek شەڵتەک، جەڕانن وبەسانْ شەڵتانْ خەرمان ف سفت کردن و محکم بستن دسته‌های درو شده‌ی غلات

**شەتیر** şetîr باڵتە، ساتوور «ل» ف ساتور

**شەخ** şex شەق «ل» لە سەکزی «شەخ» ئۆشن ف ترک، شکاف ریز، در سکزی «شـَخ» گویند

**شەخارتە** şexarte شەقارتە ف کبریت

**شەخ بردن** şex birdin شەق بردن «ل» ف ترک بر داشتن

**شەختە** şexte سایەقە ف سرمای سخت، سرماریزه

**شەختە بەسان** şexte besan یەخبەنان ف سرمای سخت، یخبندان

**شەخدان** şex dan شەقدان «ل» ف ترک برداشتن

**شەخرە** şexre شەقرەک «گ» ف نگا **شەقرەک**

**شەخڵ** şexļ شەقڵ «گ» ف مهر نشانه گذاری خرمن، مـُهر

**شەدە** şede پۆرتەنـْک «شەدەێ یەێ تاڵ زەرپەساسە سەرەو – سپەریاس وە رێ چیتْ ئەسپەرەو» (عەباس باباخانی) ف

دستار زنانە

**شەدەت** şedet شەدەد، ئەرەوییە [ف] شدت، عربی است

**شەدەد** şeded شەدەت [ف] شدت

**شەڕ** şer̂ مرافە [ف] جنگ

**شەرا** şera ۱) شرا «تاشەرائ مەرگ دالێ» ۲) سەوین، تاوێشتْ خوەر [ف] ۱) تا سرحد... ۲) گرمای آفتزا

**شەڕاشوو** şer̂aşû شەڕئاشوو [ف] شرور، جنگ طلب

**شەڕانچوو** şer̂ançû شەڕانشوو [ف] شرور، جنگ طلب

**شەڕانشوو** şer̂anşû شەڕانچوو [ف] جنگ طلب

**شەڕانی** şer̂anî پرشنگ [ف] جنگ طلب

**شەراو** şeraw شراو [ف] شراب

**شەراوخانە** şerawxane شرابخانە [ف] میکدە

**شەراوخوەر** şeraw xwer شراوخوەر [ف] شرابخوارە

**شەراوخوەری** şerawxwerî شراوخوەری [ف] ظرف شراب خوری

**شەراوفرووش** şeraw firûş شراوفرووش [ف] کسی کە فروشندە شراب است

**شەراوی** şerawî شراوی [ف] برنگ شرابی

**شەربە** şerbe شەروە [ف] ظرفی سفالی

**شەربەت** şerbet شەروەت [ف] شربت

**شەربەتاو** şerbetaw شەربەت [ف] شربت

**شەربەتخوەری** şerbet xwerî شەروەتخوەری [ف] ظرف شربت خوری

**شەربەت ساز** şerbet saz شەروەت ساز [ف] شربت ساز

**شەربەت فرووش** şerbet firûş شەروەت فرووش [ف] شربت فروش

**شەرپەن** şerpen ۱) وەرەلا ۲) گووزە کردن و دەر چین [ف] ۱) لاابالی ۲) مذبوحانە گریختن

**شەرپەن کردن** şerpen kirdin گووزە کردن و دەر چین [ف] زبونانە و مذبوحانە گریختن

**شەرپەنی** şerpenî وەرەلایی، دەفن برین [ف] لاابالی و الواطی

**شەرت** şert ۱) گرەو ۲) پەیمان ۳) بائیسە [ف] ۱) شرط بندی ۲) پیمان، عهد ۳) لازم، ضروری

**شەرت بوو** şert bû ئاد بوو [ف] پیمان باشد، شرط باشد کە...

**شەرتْ شرووت** şerti şirût گرەو کردن، ئەرەوییە [ف] شرط و قید

**شەرتْشوان** şerti şuwan لە بیسْ گاقوور تا بیسْ ماڵەژێر [ف] از بیستم مرداد تا بیستم شهریور کە رمە داران قرارداد خود را با چوپانان می‌بندند، ماە شهریور

**شەرتوو** şertû شەرت بوو [ف] شرط باشد کە...

**شەرت وشرووت** şert û şirût گرەو کردن، ئەرەوییە [ف] شرط و قرار

**شەرت وقەرار** şert û qerar شەرت وشرووت، ئەرەوییە [ف] شرط و قرار

**شەرتە** şerte ۱) بائیسەس «کوڕْ خاسێگ بوودن شەرتە» ۲) شەرتوو [ف] ۱) لازم است ۲) شرط باشد کە ...

**شەرد** şerd شەرت [ف] شرط

**شەردە** şerde بارهاوردن وە رێ دین [ف] طبق شرع تربیت کردن

**شەڕفرووتن** şer̂ firûtin شەڕفرووشان [ف] ستیزە جویی کردن، بهانە گرفتن

**شەڕفرووش** şer̂firûş پرشنْگ [ف] ستیزەجو

**شەڕفرووشان** şer̂ firûşan شەڕ فرووتن [ف] ستیزە جویی کردن

**شەڕ فرووشتن** şer̂ firûştin شەڕ فرووشان [ف] ستیزە جویی کردن

**شەڕ کردن** şer̂ kirdin مرافە کردن [ف] جنگ کردن

**شەڕ کەر** şer̂ ker جەنگ کەر [ف] جنگاور

**شەڕگە** şer̂ge گەمەیگە [ف] بازیی شبیە بیس‌بال

**شەرم** şerm ۱) شۆرەئی ۲) شەرمە ۳) حەیا [ف] ۱) عیب و عار ۲) شرمگاە ۳) شرم و حیا

**شەرمدار** şerm dar سجا [ف] آبرومند

**شەرمسار** şermsar خەجاڵەت [ف] شرمسار

**شەرم شکانن** şerm şikanin لە رۆدەربایس دەر چین [ف] از خجالت بیرون آمدن

**شەرمنە** şermine شەرمەندە [ف] شرمندە

**شەرموو** şermû کەم رۆڕەگا [ف] خجالتی

**شەرمە** şerme شەرمگا [ف] شرمگاە

**شەرمەزار** şermezar شەرمەسار [ف] شرمسار

**شەرمەزاری** şermezarî شەرمەساری [ف] شرمساری

**شەرمەزووری** şer̂mezûrî شەرمەشووری ف ستیزه جویی

**شەرمەسار** şermesar شەرمەزار ف شرمسار

**شەرمەسار بۆن** şermesar bün خەجاڵەت بۆن ف شرم سار شدن

**شەرمەساری** şermesarî شەرمەزاری ف شرمساری

**شەڕمەشووری** şer̂meşûrî شەڕمەزووری ف ستیزه جویی

**شەڕمەگەڕی** şer̂megerî شەڕمەشووری ف ستیزه جویی

**شەرمەندە** şermende شەرمەنە ف شرمنده

**شەرمەنە** şermene شەرمەندە ف شرمنده

**شەرواڵ** şerwaľ پاپووش ف شلوار

**شەروە** şerwe بنووڕە شەربە ف فنجان، لیوان، نگا **شەربە** و ترکیباتش

**شەروەتی** şerwetî ١) ناوێکە ژنانە ٢) چەرمێ «ل» ف ١) نامی زنانه ٢) سفید

**شەڕ وە زوور** şer̂ we zûr دوڕ ف مستبد، قلدر

**شەڕ وە زووری** şer̂ we zûrî شەڕمەشووری ف ستیزه جویی

**شەروێنە** şerwêne دیەکەێگە لە جووانڕو ف روستایی در جوانرود

**شەڕەتووپ** şer̂etûp شەڕگە ف بازیی شبیه بیس‌بال

**شەڕەزۆل** şer̂ezül کۆیەیگە لە ئەێوان ف کوهی در شهر ایوانغرب

**شەڕەژن** şer̂ejin جەنگْ ژنانە ف دعوای زنانه

**شەرەف** şeref ئرز، ئەرەوییە ف شرف

**شەریف** şerîf نەجیم، ئەرەوییە ف شریف

**شەریف‌ئاباد** şerîf abad دیەکەێگە لە کەنۆلە ف روستایی در کندوله

**شەریک** şerîk ١) هاوسەر، ژن ٢) شیەریک ف ١) دوست، همسر ٢) شریک در سرمایه

**شەریکە دز** şerîke diz شیەریکە دز ف دزد افشار

**شەریکی** şerîkî شیەریکی ف شراکتی

**شەس** şes ١) ژمارەێ شەس ٢) یەێهووش «شەسم ئاگا بی...» ٣) شەسە ٤) کلْگ کەڵە، بنووڕە سپیە کوژە ف ١) شماره شصت ٢) هوش، آگاهی ٣) موسم بارانهای بهاری ٤) نگا **سپیەکوژە**

**شەس‌بێدار** şes bêdar وریا ف هوشیار

**شەسپەڕ** şesper̂ گیائێگە چۆ شەودەر ف گیاهی شبیه شبدر خودرو

**شەست** şest بنووڕە شەس ف نگا **شەس**

**شەستم** şestim شەسم ف شصتم

**شەستمین** şestimîn شەستم ف شصتمین

**شەستیر** şestîr دەسرێژ ف مسلسل

**شەسم** şesim شەستم ف شصتم

**شەسە** şese شەسەوار، بەختەواران ف بارانی که در اوایل خرداد می‌بارد

**شەسەوار** şesewar بنووڕە شەسە ف نگا **شەسە**

**شەش** şeş ژمارەێ شەش ف شش، عدد شش

**شەشان** şeşan شەش گلە ف شش عدد، شش تا

**شەشپالۆ** şeşpalü شەش چۆز ف شش گوشه

**شەشپەڕ** şeşper̂ شەسپەڕ ف شبدر خودرو

**شەشپەلْگ** şeş pelig ١) لاناوە لە فرە «ئەسرْ شەش پەلْگ» ٢) گیسْ فرەوان ف ١) کنایه از زیاد گریستن ٢) گیسوان پـُر پشت

**شەشپەلی** şeş pelî شەش پەلْگ ف نگا **شەش پەلْگ**

**شەشخان** şeşxan جوورێ تفەنگە ف نوعی تفنگ

**شەشخانە** şeşxane شەش چۆز ف شش گوشه

**شەشدانگ** şeşdanĝ ١) تێار، ئامادە ٢) گشتی، وە کولی ف ١) کنایه از آماده وقبراق ٢) ششدانگ ملک

**شەش سۆک** şeş sük شەش گووشە ف شش گوشه

**شەشسەد** şeşsed ژمارەێ پانسەد وسەد ف ششصد

**شەش کلْک** şeş kilik ئەو کەسە کْ شەش کلْک دێرێد ف کسی که انگشت اضافه دارد

**شەشگووشە** şeş gûşe شەش سۆک ف شش گوشه

**شەشڵە** şeşľe لە چووارم تا شانزەهەمْ وەفرانوار ف از چهارم تا شانزدهم بهمن

**شەشم** şeşim دۆیاێ پەنجم ف ششم

**شەشمین** şeşimîn شەشم ف ششمین

**شەش‌مەتەقەڵ** şeş meteqeľ تەقەڵ گەورا وناڕیک ف دوختن با فاصله و ناریک

**شەش وی** şeş wî دیەکەێگە لە جووانڕو ف روستایی در جوانرود

**شەشەرێ** şeşer̂ê دیەکەێگەلە دێرە ف روستایی در دیره

**شەشەداڵوو** şeşe daĺû چلەیٚ زمسان «ل» ف چلەی زمستان

**شەش یەک** şeş yek لە شەش بەش یەیٚ بەش ف یک ششم، یک سهم از شش سهم

**شەش یەکی** şeş yekî شەش یەک ف یک ششم، یک سهم از شش سهم

**شەفا** şefa دەرمان ف شفا، نگا **شفا** و ترکیباتش

**شەفتالو** şeftalü جووریٚ هەلۆیە ف نوعی هلو

**شەفەق** şefeq گوڵ سوو ف شفق، صبح زود

**شەفەق نەمایٚ تاڕ** şefeq nemaê tar̂ لاناوە لە گوڵ سوو ف کنایه از شفق، صبح زود

**شەق** şeq ١) شەخ ٢) دەس وەشانن «شەقەزیلە» ٣) ناو ڕاس «شەقْ نیمەڕوو» ٤) سفت و سەخت «کەلە شەق» ف ١) ترک، شکاف ٢) صدای سیلی زدن ٣) وسط ٤) سخت و سفت

**شەقارتە** şeqarte شەخارتە ف کبریت

**شەقاق** şeqaq شۆقاق، شەقْ قاق، شەقْ وشک ف بیماری ترک سم در چهارپایان، ترک خشک

**شەقاڵ** şeqaĺ ١) جووریٚ بلاڵۆکە ٢) شەنقاڵ ف ١) نوعی گیلاس وحشی ٢) بره احشام که در همان روز تولد جثه بزرگی داشته باشد

**شەقانن** şeqanin شاقانن ف آواز کبک و مرغ پس از تخم گذاری

**شەقانە** şeqane شەقانە و مەردانە ف مردانه، لوتی وار

**شەقانە ومەردانە** şeqane û merdane مەردانە ف مردانه، لوتی وار

**شەق بردن** şeq birdin ١) لە خوسە تەرەکیان ٢) تەرکیان ف ١) از غـصـه ترکیدن ٢) ترک برداشتن

**شەق خواردن** şeq xwardin فاق هێز دان ف ترک بر داشتن

**شەقدان** şeq dan لەت کردن ف شقه کردن

**شەقرەک** şeqrek شەخرەک ف وسیلەای برای حمل کردن غلات درو شده که از دو قسمت به شکل پله اما کوچکتر درست شده که بوسیله رسنی بهم متـصل است و قابل حمل با دوش است

**شەقشەق** şeq şeq تەرەک تەرەک ف ترک ترک، شکافته

**شەقشەقی** şeq şeqî لاناوە لە توڕە ف عصبی، ناراحت، اخمو

**شەق کردن** şeq kirdin ١) تەرەکانن ٢) دۆ بەش کردن ف ١) ترکاندن ٢) دو نیم کردن

**شەقڵ** şeqĺ ١) شاق، مۆهرْخەرمان ٢) مۆهر ٣) دیەکە یٚگە لە مەسۆری ف ١) مهر خرمن کوبی ٢) مُهر ٣) روستایی در بخش منـصوری

**شەقڵ شکانن** şeqĺ şikanin ١) لاناوەلە وەرجلە دیگران دەسپێکردن ٢) موور لە سەر چشتیٚ لاوردن ٣) لاناوە لە شەقڵ گوونا شکانن ف ١) کنایه از قبل از دیگران شروع کردن ٢) مُهر از سر چیزی برداشتن ٣) افتتاح کردن

**شەقڵ کردن** şeqĺ kirdin موور وموۆم کردن ف مُهر وموم کردن

**شەقڵ کەڵام** şeqĺî keĺam قسیەیٚ با سەنەد ف سخن مستدل و مستند

**شەقڵە** şeqĺe بنووڕە شەقڵ ف نگا **شەقڵ**

**شەق وشووق** şeq û şûq شەقە شەقە ف صدای پیا پی

**شەق وهڕ** şeq û hir̂ گارەگار ف صدای خواندن کبک و مرغ پس از تخمگذاری

**شەقە** şeqe ١) لەتە ٢) دەنگْ فرینْ باڵدار ٣) لەتەیٚ گووشت ٤) دەنگْ قەڵماسنگ ٥) شەقەزیلە ٦) دەنگْ تەقین ف ١) شکافتن، لتەکردن ٢) صدای بال پرنده هنگام پرواز ٣) شقه گوشت ٤) صدای فلاخن ٥) سیلی ٦) صدای ترکیدن

**شەقە داس** şeqe das هەنهەنْ درەو کردن ف موسم درو کردن گندم وجو که به اصطلاح غلات خشکیده شده‌اند و صدای آن در اثر تماس با داس می‌آید که نشانه خشک شدن ساقه است

**شەقەزیلە** şeqezîle چەپاڵە، زیلە ف سیلی

**شەقەشەق** şeqe şeq دەنگْ باڵ لە هەیٚنْ فرین ف صدای بال پرندگان در هنگام پریدن

**شەقەکردن** şeqe kirdin ١) لەتکردن ٢) دەنگْ قەڵماسنگ ف ١) شقه کردن ٢) صدای فلاخن خوب بافته شده

**شەقەگوڵ** şeqe gwiĺ گیایٚگە چۆ خوەشیر ف گیاهی شبیه «خوەشیر»

**شەقەیٚ باڵ** şeqeŷ baĺ دەنگْ فرینْ کەوک و … ف صدای بال پرندگان هنگام پریدن، بویژه کبک

حیوانات

**کیژ** kîj کیش، کەش ف کش تنبان

**کیژکاوڕ** kîj kawiȓ ئاژاژگی ف خمیازە، کشیدن بدن

**کیس** kîs ١) لە دەس چین ٢) لاناوەلە هەرچێ هات خوەش هات «کیس کیسْ جانم» ف ١) از دست رفتن ٢) هرچە بادا باد

**کیس کردن** kîs kirdin کووم نەکردن ف ریسک کردن، نترسیدن

**کیسگ** kîsig خورج «چەبۆ نیەژنەوم هەیهەێ شوانێ- سەفا بوواریێ ژ کیسگ دانێ» ف خورجین

**کیسە** kîse ١) خورج ٢) کیسەێ حەمام ف ١) کیسە ٢) کیسە حمامی

**کیسەبڕ** kîse biȓ دز، چەتە ف دزد

**کیسەکەش** kîse keş دەلاک ف کیسەکش حمام

**کیسەڵ** kîseĺ کەسەڵ، کەسا، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «کێسو، کووس، کیسی، کسل، کەسە، کووسی، کووسەل، کووسەلە» ئۆشن و لە زووانْ ئەوستا (kesyepe کەسیەپە) ئۆسرپاس ف سنگ پشت، لاکپشت، در دیگر گویشهای کردی «کێسو، کووس، کیسی، کسل، کەسە، کووسی، کووسەل، کووسەلە» گویند و در اوستا (kesyepe کسیەپە) نوشتە شدە

**کیسەڵ پا** kîseĺ pa ١) کونر لە رێ کردن ٢) پا قەۆ ف ١) کند پا ٢) پا گندە

**کیسەڵ گون** kîseĺ gwin گیزەڵگون ف نگا **گیزەڵ گون**

**کیسەڵە** kîseĺe ١) جوورێ سۆنە ٢) قوتەێ رۆ جگر کاوڕ و مانگا و... ف ١) نوعی سن آفت مزارع ٢) غدە سفید رنگ و چرکی روی جگر احشام

**کیش** kîş ١) کەش ٢) کەژ، لە سەکزی «کیش» ئۆشن ٣) کیش هاتن ٤) پاشگرە وە ماناێ کیشان «کەێ کیش، سیکار کیش» ٥) وشە، واتە«ل» ٦) ئامرازْ چشت کیشان «قوڕ کیش» ٧) چەشتن «زەجرکیش، زامەتکیش» ف ١) کش تنبان ٢) نوعی روسری نازک زنانە، در سکزی «کیش» گویند ٣) کش آمدن ٤) پسوند بە معنای کشندە ٥) واژە، کلمە ٦) وسیلە نقل ومکان کنندە ٧) کشیدن، چشیدن

**کیشا** kîşa ١) وەزن کرد ٢) جی وەجی کرد ٣) کیشاد ٤) وە سەربرد ٥) کیشانْ چەقوو، خنجەر ٦) وینە کیشان ٧) کیشانە زگا ٨) دێان کیشا ف ١) وزن کرد ٢) جابجا کرد ٣) کشید ٤) تحمل کرد، بسر برد ٥) آختن چاقو ٦) نقاشی کشیدن ٧) سبقت گرفتن ٨) کشیدن دندان

**کیشاپێا** kîşa pêa کیشا رۆیەو ف بر آن پوشاند، بر آن کشید

**کیشاد** kîşad بنوورە کیشا ف نگا **کیشا**

**کیشادا** kîşada کیشادەو ف بر کشید

**کیشادان** kîşadan ١) ئەوانە کیشا ٢) وێنەیان گرت ٣) ئەوانە وەزن کرد ٤) ئەوانە هەڵکیشا ف ١) آنها را کشید ٢) نقاشی کرد ٣) آنها را وزن کرد ٤) آنها را برکشید

**کیشادەو** kîşadew کیشادا ف بر کشید

**کیشادەێ** kîşadeŷ ١) وەزنێ کرد ٢) وێنەێ گرت ٣) ئەوە کیشادەو ف ١) آنرا وزن کرد ٢) آنرا نقاشی کرد ٣) آنرا بر کشید

**کیشادێا** kîşadiêa کیشادێەو ف آنرا برکشید

**کیشادێان** kîşadiêan کیشادان ف نگا **کیشادان**

**کیشادێەو** kîşadiŷew کیشادێا ف آنرا برکشید

**کیشا زگێا** kîşa zigêa دا لە نووایا ف سبقت گرفت

**کیشاس** kîşas ١) وێنە گرتێە ٢) وە سەر بردێە ٣) وەزن کردیە ف ١) نقاشی کردە ٢) بسر بردە، تحمل کردە ٣) وزن کردە

**کیشاسا** kîşa sa کیشاسەو ف بر کشیدە

**کیشاسان** kîşa san ١) ئەوانە کیشاس ٢) وێنەیان گرتێە ٣) وەرەو خوەێ کیشاس ف ١) آنها را کشیدە ٢) آنها را نقاشی کردە ٣) بسوی خود کشیدە

**کیشاسەو** kîşa sew کیشاسا ف بر کشیدە

**کیشاسەێ** kîşa seŷ ١) ئەوە وەزن کردێە ٢) وێنەێ ئەوە گرتێە ٣) کیشاس ف ١) آنرا وزن کردە ٢) آنرا نقاشی کردە ٣) آنرا کشیدە

**کیشاسێا** kîşa siêa کیشاسێەو ف آنرا برکشیدە

**کیشاسێان** kîşa siêan کیشاسان ف نگا **کیشاسان**

**کیشاسێەو** kîşa siŷew کیشاسێا ف آنرا برکشیدە

**کیشاگ** kîşag بنوورە کیشا ف نگا **کیشا**

**کیشاگە** kîşage بنوورە کیشاێە ف نگا **کیشاێە**

**کیشاگەو** kîşagew کیشادەو ف برکشید

**کیشاگەێ** kîşageŷ کیشادەێ ف نگا **کیشادەێ**

**كيشدار** kîşdar ژيدار ف كشدار، كشش‌دار

**كيشدان** kîşdan شوونْ چشتێ گرتن و وەتن ف كش دان

**كيشكاوڕ** kîş kawir̂ كيژكاوڕ ف خميازه، كشش بدن

**كيشمانه** kîşimane ترازێ ف ترازو، وزن كردن

**كيشماێ كيش** kîşmaê kîş هڕيكيش، كيشمەكيش، وەردە وەردە ف جدل، درگيری

**كيشمەكيش** kîşme kîş وەردە وەردە ف درگيری، جدل

**كيشه** kîşe ١) كيش، واتە «ل» ٢) كيشان، گەنم و جۆيە ... وە ماڵ ف ١) واژه ٢) انتقال غله درويده به منزل

**كيشهاتن** kîş hatin ژی داشتن ف كش آمدن

**كيشهاوردن** kîş hawrdin كيشان ف كشيدن كش

**كيشيان** kîşyan ١) وەزن كريان ٢) وێنە گريان ٣) لە بن دراوردن دێان ٤) كيشانن ف ١) وزن شدن ٢) نقاشی كردن ٣) كشيدن دندان ٤) كشيدن

**كيشياێ** kîşyaê ١) وەزن كرياگ ٢) وێنە گرياگ ٣) كيشياگ ف ١) وزن شده ٢) نقاشی شده ٣) كشيده شده

**كيف** kîf ١) دەنگْ مار ٢) خورجْ دەسی ٣) كۆيە ف ١) صدای مار ٢) كيف دستی ٣) كوه، در ديگر گويشهای كردی « كێف» گويند

**كيفانن** kîfanin كيفە كردنْ مار ف صدای مار

**كيف دەم** kîf dem لاناوە لە دەم وشا ف كنايه از دهن گشاد

**كيفن** kîfin منگن ف كسی كه بينی‌اش صدا می‌كند

**كيفه** kîfe دەنگْ مار ف صدای مار

**كی كيانی** kî kyanî لاناوەلە خودا ف كنايه از خدا

**كێكف** kêkif كەيكم ف درختچه‌ای است

**كێكو** kêkû كەيكم ف درختچه‌ای است

**كيڵ** kîl̂ پەێمانە ف پيمانه چوبين غله

**كيل** kîl سانْ قەور ف سنگ قبر

**كيلْمنجەڕ** kîli mincer̂ تيلْمنجەڕ ف نگا **تيلْمنجەڕ**

**كيلوو** kîlû كيشمانەێگە ف كيلو

**كيلْ وەرد** kîli werd رميان و لە جی كەفتن ف در اثر دردی ناگهانی بستری شدن

**كيڵە** kîl̂e كيڵ ف پيمانه چوبين غله

**كيڵەمەن** kîl̂e men كيڵ ف پيمانه چوبين غله

**كيلەچەرمگ** kîle çermig ديەكەێگە لە سەرپيەڵ ف روستايی در سرپـُلذهاب

**كيميا** kîmya ١) كەس نەدار ٢) گيايْگە كْ ئۆشن هەر گيانەوەرێگ لێ بخوەێد دێانەيلێ بوودە تلا ف ١) كيميا ٢) گياهی است كه بنا به اعتقادی هر موجودی از آن تغذيه كند دندانش به طلا تبديل می‌شود

**كيمياگەر** kîmya ger ١) لاناوەلە دەس‌دڕس ٢) زانایێ كيميا ف ١) كنايه از پزشكی كه دستش شفا دارد ٢) كيمياگر

**كين** kîn كينەت ف كين، كينه

**كينگەڕێ** kînĝer̂ê كوانێ سەرپووشرياێ جوورْكۆرەێ ئاسنگەری، شوومينە «گ» ف اجاق سرپوشيده مانند كوره آهنگری، شومينه

**كينه** kîne دژمنی ف كينه

**كينەت** kînet كونيەت ف كينه

**كينەتی** kînetî كونيەتی ف كينەتوز

**كينەدار** kîne dar كونيەتی ف كيتەتوز

**كيه** kye كام كەسە ف كيست؟

**كيەر** kyer كەهر، لە سەكزی «كەرە» و لە زاراوەيلْ ترەكْ كوردی «كار» و لە لاتين (kid) ئۆشن ف بـُز غاله، در سكزی «كَره» و در ديگر گويشهای كردی «كار» و در لاتين (kid) گويند

**كيەراو** kyeraw ١) ئاو دووێگ كْ كەنەێ چڵاسْ سەێ ٢) ئاو گووشتێگ كْ وە گووشتْ كيەر دڕس بوود ف ١) پس مانده دوغ و لبنيات كه در «چلاس» يا همان ظرف غذاخوری سگ ريزند ٢) آبگوشتی كه از گوشت بـُز درست شده باشد، آبگوشت بز باش

**كيەر خسن** kyer xisin پاوْسی ف تنبلی، ناتوانی

**كيەر خسێ** kyer xisê نەتۆيەنم ف تنبل، ناتوان

**كيەرد** kyerd بگدە، لە ئوردیبەهەشت يەشت لە ئامرازەيلْ پزشكی باس كەێد (kertebeışezû كەرتە بەئشەزوو) ناو بەێد ف كارد، در ارديبهشت يشت كه از وسايل پزشكی سخن می‌گويد از (kerte beışezû كرته‌بئيشه‌زوو) نام می‌برد كه همان كارد پزشكی است

**كيەرد وكەفن** kyerd û kefin جوورێ شفا وڵاڵە ئڕاێ پيايلە، وەێتەور كْ وە ئاغابانوو بانْ چەويلێان بەسن و پێلاگانێيان خەنە ملێان و وە تناف لە نووا كيشنان و وە پاێ پەتی تيەرنان و كەفن و كيەردێگ دەنە دەسێان يا وەكيەرد

کوشێد و کەفن کەێد یا تنافەگان برێد وکەفنەگەێش درێد ف مراسم کارد کفن که نوعی از بخشش و قصاص است بدین گونه که متهم را در حالی که چشمانش را با سربند بسته‌اند و کفشهایش را به گردن آویخته‌اند و کارد وکفنی بر دست می‌آورند صاحب دم یابا کارد می‌کشد و کفن می‌کند یا طنابها را پاره می‌کند و کفن را نیز می‌درد

**کیەرزگ** kyer zig زگْ بۆچگْ ف شکم کوچک وناریک

**کیەرەلەوان** kyere lewan ئەو کەسە کْ کیەرەیل بەێدە لەوەڕ ف کسی که بُزغاله‌ها را می‌چراند

**کیەرەمۆ** kyeremü مۆکیەر کْ ئەولْ رۆن و نیمەنمەک نەنەێ بانْ دەسْ شکیاێ ف موی بُزغاله که همراه روغن و نیمه‌نمک بر روی اندام شکسته یا در رفته گذاشته و می‌بندند

**کیەرێز** kyerêz بنوورە کارێز ف نگا **کارێز**

**کیەنی** kyenî کەنی، کانی ف چشمه

**کیەنیاو** kyenyaw کانیاو، ئاو کیەنی ف چشمەسار، آب چشمه

**کیەنی چەرمێ** kyenê çermê ۱) دیەکەێگەلە ئارۆن ئاوا کْ ئۆشن گڵکووێ بالۆل رێبەرْ یارسان ها ئەورە ۲) کیەنی و دیەکەێگە لە دێزگران ۳) دیەکەێگە لە کرماشان ف ۱) روستایی در بیست وپنج کیلومتری اسلام آبادغرب که قبر « بهلول ماهی» یکی از رهبران یارسان آنجاست ۲) چشمه و روستایی در دیزگران ۳) روستایی درکرماشان

**کیەنیعیسا** kyenî ìsa دیەکەێگەلە گوواوڕ ف روستایی در گواور

**کیەنیکوچگین** kyenî kwiçgîn دیەکەێگەلە هەمەیل ف روستایی در بخش حَمیل

**کیەنیکەو** kyenî kew ۱) دیەکەێگە لە ئارۆن ئاوا ۲) دیەکەێگە لە ساڵح ئاباد ۳) دیەکەێگە لە بێڵەوار ف ۱) روستایی در اسلام آبادغرب ۲) روستایی در صالح آباد ایلام ۳) روستایی در بیله‌وار

**کیەنی ماسی** kyenî masî دیەکەێگە لە گاوڕووانی ف روستایی در گاوروانی

**کیەنی مای** kyenî may کەنیمای ف نگا **کەنیمای**

**کیەنی وەڵگە** kyenî welige دیەکەێگەلە مەسۆری ف روستایی در منـصوری

**کیەنیهاجگە** kyenî hacige دیەکەێگە لە گوواوڕ ف روستایی در گواور

**کییووپ** kî yûp بنوورە پامەرە ف نگا **پامەرە**

# گ

**گ** gi ١) کیشْ ئەلفبا ٢) پاشگرْ فرمانی «بووگ، چووگ» ٣) کوْل، گشت «گجارێ، گکارێ» ف ١) حرف «گ» ٢) پسوند مغعولی ٣) کُل، همه، همگی

**گا** ga ١) کەڵێا، لە پەهڵەوی (gev گەڤ) و لە ئەوستا (gevû گەڤوو) و لە گیلەکی (ga گا) نۆسریاس ٢) جار وەخت، گاجار ٣) گاین ٤) قەێ «گا کەوتەر، گا بەرد» ٥) ستۆنە «ل» ٦) پێشگرە وە ماناێ جی «گامیەر، گامێشان، گامەخەڵیە» ٧) پاشگرە وەماناێ جی «خەرگا» ف ١) گاو نرّ، در اوستا (gevû گوو) و در پهلوی (gev گو) و در گیلکی (ga گا) نوشته شده ٢) گاه ٣) گایدن، کردن ٤) بزرگ، گنده ٥) شپشک غلات ٦) پیشوند به معنای مکان ٧) پسوند به معنی مکان، جا

**گاباز** ga baz هاوتاێ گورگەچەرمڵە ف گاو پیشانی سفید

**گابووره** ga bûrê دیکْ گەورایگ کْ تەقە دەنە لێ ئراێ هەێوانْ وراز «ل» ف دیگ بزرگی که با ضربه زدن به آن گرازها را از مزارع فراری می‌دهند

**گابەرد** ga berd سانْ گەورا ف سنگ بزرگ

**گاپاخسێ** ga pa xisê لاناوە لە شەولەش، تەمەڵ ف کنایه از تنبل

**گاپاروو** ga parû گرانن و هەلا کردنْ گەماڵ ف خیز برداشتن و حمله کردن برای سگ سانان

**گاپت** gapit جوورێ تفەنگە ف نوعی تفنگ

**گاپیا** ga pya ١) پیاێ ماقووڵ ٢) رازاێ پیاێ نەفام ف ١) مرد عاقل، عاقله مرد ٢) صفت مرد نفهم، نفهم

**گاتووپە** ga tûpe گیاێگە «ل» ف گیاهی است

**گاتەگات** gate gat وە نەرمەنەرم رێ کردن ف آرام آرام راه رفتن

**گاتیا** gatya ١) وە نەرم نەرم ٢) سیەم کەسْ یەکڵە لە کردارْ گاتیان ف ١) یواش یواش ٢) سوم شخص مفرد از فعل « گاتیان» به معنی آرام آمد

**گاتیان** gatyan وە نەرمیەو هاتن ف لنگلنگان آمدن

**گاجار** ga car جار وەختێ ف گاهی، گاهی اوقات

**گاجفت** ga cift گا وجفت ف گاو نر شخم زنی

**گاحووڵە** ga hûle گاێ حووڵە کردن ف گاو بُنه

**گاچاڵی** ga çalî دیەکەێگە لە سەرپیەڵ ف روستایی در سر پـُلذهاب

**گاچان گیچان** gaçan gîçan بنوورە کانمەکان ف نگا **کانمەکان**

**گاچاو** ga çaw ١) گاچەو ٢) ئەو کەسە کْ چەو گەورا دێرێد ف بزرگترین نقش قالی

**گاچرانک** ga çiranik ئەڤداڵ ف پرنده دراج

**گادان** ga dan وە گاین دانْ مانگا، وە کەڵ دانْ مانگا ف گشن دادن

**گادڕ** ga dir̂ کەنینْ پووس جوورێ کْ تەنیا وە دەردْ دەباخی بخوەێد ف کندن پوست حیوان ذبح شده بگونه‌ای که تنها بدرد دباغی می‌خورد ونمی‌شود از آن بعنوان مشک استفاده کرد

**گادووشە** gadûşe دیگْ گەوراێ شیرەواڕە ف دیگ بزرگ ویژەی مراسم «شیرەواڕە»

**گادووڵ** ga dûl ١) چاخان کردن ٢) خۆڕمە ف ١) بلوف زدن ٢) چراگاه

**گار** gar ١) پاشگرْ فرمانکاری «ئامووژگار» ٢) هەن، کات «رووژگار، شەوگار» ٣) گارەگار ف ١) پسوند فاعلی ٢)

هنگامه ۳) صدای مرغ کُرچ

**گاڕاج** garâc جی ماشین و... [ف] گاراژ

**گاڕام** garâm بنووڕە گاران [ف] غاوشنگ، نگا **گاڕان**

**گاڕان** garân گاڕام، له پەهڵەوی (gevaze گەوازه) نۆسریاس [ف] گاو زن، در پهلوی (gevaze گوازه) نوشته شده، نگا **گاڕام**

**گاران** garan گارەگار کرد [ف] صدای آواز مرغ یا کبک هنگام تخمگذاری، کراخ

**گاڕان دۆ** garân dü ئەسپێگ ک هەمیشه دۆێ ڕۆ ئەو خواره [ف] اسبی که دمش همیشه رو به پایین و آویزان است

**گارانن** garanin گارەگار کردن [ف] کراخیدن کبک یا مرغ تخمگذار

**گاردی** gardî پسپسەکڵی «ل» [ف] رتیل

**گارکه** garke گارانن، گارەگار [ف] نگا **گارەگار**

**گاڕم** garîm بنووڕە گاران «ل» [ف] غاوشنگ، نگا **گاڕان**

**گاره** gare گارانن [ف] صدای مرغ یا کبک هنگام تخم گذاری

**گارەگار** gare gar گارانن [ف] کراخیدن کبک یامرغ تخم گذار

**گاڕەو** ga rêw خاکْ کزرەو بۆ دۆیایٚ واران [ف] گاو رو، زمینی که پس از بارندگی کمی خشک شده و به اصطـلاح گاو رو شده

**گاڕی** garî ۱) داشقه، ئەرەبانه ۲) دیەکەێگەله سەرپیەڵ [ف] ۱) گاری ۲) کوه و روستایی در سرپل ذهاب

**گاڕێ** garê ۱) مەڵوەنێگه له سنجاوی ۲) ڕێ گاوڕەو [ف] ۱) منـطقه‌ای در سنجابی ۲) راه گاو رو

**گاز** gaz ۱) قەپ گرتن ۲) گووش گاگر ۳) شوونْ دەمْ تەور ٤) ئوجاخ گاز ٥) وه تاو رانین ٦) جووریٚ چیخه [ف] ۱) گاز گرفتن ۲) انبر، کلبتین ۳) ضربه زدن با تبر ٤) اجاق گاز ٥) گاز زدن ٦) نوعی چیت

**گازاره** gazare گەزاره، ڕەفەتای [ف] ضـخامت، کلفتی

**گازڕ** gazir ۱) گازم ۲) جیڕجیڕەک «ل» [ف] ۱) چاقوی کفاشی ۲) جیرجیرک

**گازڕان** gazirân گازْگەور [ف] کابوس دیدن

**گازرانی** gaziranî پاپووشێگه له خوری [ف] شلواری از پشم

**گاز گرتن** gaz girtin ۱) وه تن رانینْ ئتر ۲) خنکیان له گاز [ف] ۱) گاز زدن و تند راندن ۲) گاز گرفتگی

**گازْگەور** gazigewr گازڕان [ف] کابوس

**گازڵووک** gazilûk گازووڵک [ف] سرگین جنبان

**گازڵەگۆری** gazle gorî لاناوەله فره کەم [ف] بسیار ناچیز

**گازْم** gazim گازْن، گازْڕ، له زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «گەزلک» و له سەکزی «گیزەن» و له تۆرەکەمەنی «گەزلیک» ئۆشن [ف] چاقوی کفاشی، در دیگر گویشهای کردی «گَزلک» در سکزی «گیزَن» و در ترکمنی «گَزلیک» گویند

**گازْن** gazin گازم، گازڕ [ف] چاقوی کفاشی

**گازووان** ga zuwan گوڵ گازووان [ف] گل‌گاو زبان

**گازوور** ga zûr ۱) خەرزوور ۲) فەن مەزان له زووران [ف] ۱) قدرتمند ۲) کسی که در کشتی فن نمی‌داند اما قدرت بدنی بسیار دارد

**گازووڵک** gazûlik گازڵووک [ف] سرگین غلتان

**گازه** gaze ۱) شفا ولاڵه، لاوکه، له ئەوستا (gate گاته) نۆسریاس ک هەڵەس چۆن پیتْ «ت» و «ز» وەک یەکه و ئەوەێ ک وه ناو «گاتها» ناسیاره له بنەڕەتەو «گازەها»سه ۲) گازیان، ترسیان [ف] ۱) تمنا و نیایش، در اوستا (gate گاته) نوشته شده که اشتباه است زیرا حرف «ت» و «ز» تقریبا شبیه هم است و آنچه ما به عنوان گاتها می‌خوانیم در اصل «گازەها» است ۲) ترسیدن

**گازیان** gazyan ترسیان [ف] ترسیدن

**گاس** gas ۱) گاهس ۲) گاێگه [ف] ۱) شاید ۲) گاو است

**گاسکه** gaske گووزه کردن، له فەرانسەی (gascon) وەێ ماناسه [ف] در رفتن، با خواری فرار کردن، در فرانسوی (gasco) گویند

**گاسکه کردن** gaske kirdin گاسکه [ف] نگا **گاسکه**

**گاسکەگاسک** gaske gask ۱) ژاو خواردن و پتەکەنه کردن ۲) وه نەرمەنەرم [ف] ۱) ول گشتن و به آرامی جستجو کردن ۲) آرام رفتن

**گاسْن** gasin گاوەسن، گیەڵا «ل» [ف] گاوآهن

**گاسنووق** ga sinûq سنووق گەورایٚ پۆل [ف] گاو صندوق

**گاسۆر** gasür گاسۆیەر [ف] روستایی در گواور

**گاسۆیەر** gasüyer گاسۆر [ف] روستای گاوسوار در گواور

**گاشاخ** ga şax جووریٚ دڕگه [ف] نوعی خار

**گافاره** gafare گاواره [ف] گهواره

**گافارەکووڵ** gafare kûl گیانداریٚگه خیاڵی له ئەوەڵ هەر وەرز تیەێد و مەردم دانەکوڵانه دڕْس کەن و ئۆشن تێد له لێ

خوەێد «گ» ف موجودی خیالی که مردم براین باورند که در اوایل هر فصل ظاهر می‌شود و برای او خوراکی می‌گذارند

**گاقڕان** ga qir̂an نەخوەشی قڕانْ مانگا ف بیماری مرگ و میر گاوها

**گاقووڕ** gaqûr̂ گاغووڕ، مانگْ دۆیەمْ تاوسان ف مرداد ماه

**گاکردن** ga kirdin سۆنەدانْ خەلیە «ل» ف شپشک زدن غلات

**گاکوش** ga kwiş جووریٚ کیەردە ف نوعی کارد بزرگ

**گاکوڵ** ga kûʃ گووڕەکوڵیٚ ف اصطبل مخصوص گاو و گوساله

**گاکۆنی** ga künî لاناوە لە ترخن و نەتۆیەنم ف کنایه از تنبل و تن پرور، معنای واژه به واژه یعنی گاو کونی

**گاکەمووتەر** ga kemûter بنووڕە گاکەوتەر ف نگا **گا کەوتەر**

**گاکەوتەر** ga kewter ١) گاکەوتەرە ٢) جووریٚ کەمو وتەرە ف ١) دود کش سیاەچادر ٢) کبوتر چاهی

**گاکەوتەرە** ga kewtere کەوتەڕْ سییەماڵ ف دودکش سیاەچادر

**گاکۆیەیلە** ga küyeyle گایٚ کۆیەی ف گوزن

**گاکیە** gakye دیەکەێگە لە کرماشان ف نام روستایی در کرماشان

**گاگا** ga ga جارجار ف گاه‌گاه

**گاگریوە** ga girîwe گری کردن و بەێت خوەنینْ ژنەیلْ لە ئازیەت «ل» ف گریستن و مرثیه سرایی زنان در سوگواری

**گاگوڵوومە** ga goʃûme گوڵوومە بۆن ف بستری شدن، فلج شدن

**گاگەل** ga gel گایل، گاگەیل ف رمه گاوان

**گاگەلە** ga gele گاگەل ف رمه گاوان

**گاڵ** gaʃ ١) هەو کردن «گاڵێان کردن» ٢) بڵووم دان «گاڵیٚ دەمە پێد» ٣) گڕگاڵ مناڵ ٤) مان کردن، منا کردن ف ١) هو کردن ٢) تحریک کردن کسی ٣) سخنان نامفهوم نوزاد ٤) منع کردن

**گاڵتە** gaʃte گاڵە، هەنەک ف شوخی

**گاڵتەچی** gaʃte çî هەنەک چی ف شوخی باز

**گاڵتەکردن** gaʃte kirdin هەنەک کردن، گاڵە کردن ف شوخی کردن

**گاڵدان** gaʃ dan ١) هەو کردن ٢) بڵووم دان ف ١) هو کردن ٢) برانگیختن

**گاڵکردن** gaʃ kirdin هەو کردن ف هو کردن

**گاڵوورە** galûre دەنگێگ ک ئڕایٚ مانگاله هەێنْ شیر دووشین خوەنن ف آوازی که هنگام شیر دوشی برای گاو می‌خوانند

**گاڵووش** gaʃûş وشا «گ» ف گشاد

**گاڵووک** gaʃûk تێڵا ف غاوشنگ

**گاڵووکە** gaʃûke گاڵووک ف غاوشنگ

**گاڵوون** gaʃûn پیت ف گالن

**گاڵە** gaʃe ١) هاوار کردن ٢) گەمە ٣) گاڵتە ٤) زیقْ باڵ کردنْ مناڵ ٥) کوڵوو ٥) خشتْ نەورشیایٚ ک وە بیٚ قاڵب درْسیٚ کەن ف ١) فریاد کردن ٢) بازی کردن ٣) شوخی کردن ٤) صدای خنده و فریاد نوزاد ٥) کلوخ ٦) خشت خامی که بدون قالب درست کنند

**گاڵە کردن** gaʃe kirdin گاڵتە کردن ف شوخی کردن

**گاڵەگاڵ** gaʃe gaʃ قرمْقاڵ ف سر و صدا

**گام** gam ١) کەم، مْ گامەیٚ ٢) قێەم، لە پەهلەوی (game گامە) نۆسریاس ٣) گایٚ مْ ف ١) می‌کنم، می‌گایم ٢) گام، در پهلوی (game گامه) نوشته شده ٣) گاو من

**گاما دان** gama dan ژێڕْ رۆ کردنْ نان لە بان ساج ف زیر رو کردن نان بر روی ساج جهت پختن طرف دیگر

**گاماسی** gamasî ماسی گەورا ف ماهی بزرگ

**گاماسیاو** gamasiyaw چەمێگە گەورا لە لوڕسان سەر چەوە گرێد، بەشْ لا بانینْ سەیمرە، وە بوونەیٚ داشتنْ ماسیەیلْ گەورا وە پیٚ ئۆشن گاماسیاو واتە ئاوێگ ک ماسیەگانیٚ چەنە گاێگە ف قسمت بالایی رودخانه سیمره در استان لرستان که بعلت داشتن ماهیهای بزرگ به گاماسیاو مشهور است

**گامپەڕ** gam per̂ گامپەڕان ف جهیدن، پریدن با گام

**گامپەڕان** gam per̂an گامپەڕ ف جهیدن، پریدن

**گامڕن** gamirin گامریٚ، گامرنگ ف مرگ و میر گاوها، بیماری طاعون گاوی

**گامڕنگ** ga mirinĝ گامریٚ ف طاعون گاوی

**گامریٚ** ga mirê گاقڕان ف طاعون گاوی

**گامش** gamiş گامێش ف گاومیش

**گامل** ga mil ملهڕ ف گردن کلفت

**گامڵەکی** gamʃekî گامووڵەکی ف چهار پا راه رفتن نوزاد،

تشبیه به حالت گاو راه رفتن

**گامووڵە** gamûĺe ١) گامووڵە ٢) مووڵە بەسانْ گایل ف ١) چهار زانو راه رفتن نوزاد، شبیه به راه رفتن گاو ٢) گرد هم آمدن گله گاوان

**گامووڵەسگ** gamûĺesig جووریٚ سووسکە ف نوعی سوسک

**گامووڵەکی** gamûĺekî گامڵەکی ف نگا **گامڵەکی**

**گامە** game ١) بنووڕە گامادان ٢) ئەوە گایمە ٣) گایٚ منە ف ١) نگا **گامادان** ٢) آنرا یا او را کردەام، گاییدەام ٣) گاو من است

**گامەخەلیە** gamexelye مخڵدانْ مانگایل ف سر را زیر شکم هم کردن گاوها و استراحت کردن

**گامەرە** gamere دیەکەیٚگە لە جەلاڵوەن ف روستایی در جلالوند

**گامەلە** gamele جووریٚ مەلەسە، چۆ مانگا مەلە کردن ف نوعی شنا کردن

**گامەو دان** gamew dan گاما دان ف نگا **گامادان**

**گامێش** gamêş گامش ف گامیش

**گامێشان** gamêşan دیەکەیٚگە لە سۆنقوڕ ف روستایی در سنقر

**گامێزڵگە** gamêziĺge نەخشێگەلە پەراوێزْ وەڕ ف طرحی که در حاشیه گبه طراحی کنند

**گامێزەک** gamêzek دیەکەیٚگە لە مایەشت ف روستایی در مادیدشت

**گامێسە** ga mŷese ١) مانگایٚگ کْ مێەس ئازاریٚ دەێد و وەرەو هەر لایٚگ چوو ٢) مێەسْ سەگ ف ١) گاوی که مگسها او را اذیت می‌کنند و به هر سویی می دود ٢) مگس سگ

**گان** gan ١) کردن ٢) پاشگرْ کوومەڵ «کتاوەگان» ٣) گیان ف ١) جماع ٢) پسوند جمع ٣) جان

**گانْد** ganid پاشگرْ کوومەڵ حازر «کتاوەگانْد» ف پسوند جمع حاضر

**گانْدان** ganidan پاشگرْ کوومەڵ حازر «کتاوەگانْدان» ف پسوند جمع حاضر

**گاندان** gan dan داین ف مفعول واقع شدن

**گاندەر** gan der بێەر ف مفعول، دهنده

**گان کردن** gan kirdin کردن ف فاعل واقع شدن

**گانکەر** gan ker بکەر ف فاعل در جماع

**گانەقنگی** gan qinĝî ئارد وە ئارد ف همجنس بازی

**گانەویە** ganewbe نەوبەگا ف نوعی شبانی کردن برای گاوها بگونه‌ای که هر روز یک نفر گله گاوهای روستا را به چرا می‌برد

**گانەزەر** ganezer لە بیسمْ جۆیەزەردان تا مانگْ ناوینْ تاوسان ف از بیستم خرداد تا بیستم تیرماه

**گاو** gaw مان کردن ف منع وملامت کردن، گوشزد کردن

**گاوا دان** gawa dan گاوەو دان ف سرزنش کردن

**گاوا دەر** gawa der گاو دەر ف سرزنش کننده

**گاوارە** gaware ١) بەشێگە لە گووران، شارْ گاوارە ٢) گافارە، لە پەهڵەوی (gahwarek گاهوارەک) تۆسریاس ٣) بنووڕە سێخوارە ٤) دیەکەیٚگە لە مەسۆری ف ١) بخشی در اسلام آباد غرب که مردمانش بر آیین یارسانند ٢) گهواره، در پهلوی (gahwarek گاهوارَک) نوشته شده ٣) نگا **سێخوارە** ٤) روستایی در بخش منصوری

**گاواسن** gawasin گاوەسن ف گاو آهن

**گاواشە** gawaşe گاوشە، ئسمْتاق ف استیضاح، توبیخ

**گاواشەکردن** gawaşe kirdin گاوشە کردن، ئسمْتاق کردن ف استیضاح کردن، توبیخ کردن

**گاوان** gawan چاودێرْ گایل ف گاوبان، گاوچران

**گاوانەڕەشکە** gawane r̂êşke سییەکەرک ف نگا **سییە کەرک**

**گاوانی** gawanî ١) گایل لەوەڕن ٢) پامزْ گاوان ف ١) گاوبانی، گاو چرانی ٢) دستمزد گاوچران

**گاوخان** gawxan ١) ئەو بەشە لە زەۆ کْ گاجفت لە یەیٚ رووژْ شۆیەمیٚ کەێد ٢) بەشێگە لە زەۆ کشت و کاڵ ف ١) مقدار زمینی که گاو شخم‌زنی در یک روز شخم می‌زند ٢) واحدی برای زمین کشاورزی

**گاودان** gaw dan گاوەو دان ف سرزنش کردن

**گاودەر** gaw der گاوا دەر ف سرزنش کننده

**گاوڕ** gawir̂ قڕام، جووریٚ زەڵْ باریک و تێژە ف نوعی گیاه مردابی که باریک و تیز است

**گاوڕام** gaw r̂am بنووڕە گاڕان ف نگا **گاڕان**

**گاوڕووانی** gawr̂uwanî دیەکە و سەرواێگە لە مەسۆری ف روستا و سرابی در بخش منصوری

**گاو زووان** gaw zuwan گوڵ گازووان ف گاو زبان

**گاوْس** gawis مەشکەیێگە فرە گەوراتر لە دورگ، گاوی ف مشکی بزرگتر از مشکهای معمولی که باپوست گاو درست کنند

**گاوْشە** gawişe ١) گوشلێ ٢) ئسمْ تاق، گاواشە ف ١) سبوی بزرگ ٢) توبیخ، استیضاح، بازخواست

**گاوْشە کردن** gawişe kirdin گاواشە کردن، ئسمْتاق ف بازخواست کردن، استیضاح کردن، توبیخ کردن

**گاوکردن** gaw kirdin گاوا دان ف ملامت کردن

**گاوکەر** gaw ker گاو دەر ف سرزنش کننده

**گاوگووڵ** ga û gûl̂ هەر چارەوایگ بێجگە مانگا وپەس و بزْن ف چهارپا، هر دامی بجز گاو وگوسفند وبـُز

**گاولْکی** gawlikî گامووڵەکی ف نگا **گامووڵەکی**

**گاوماخان** gawmaxan دیەکەیێگە لە گیەلان ف روستایی در گیلانغرب

**گاوە** gawe ١) گاوی، گاوْس ٢) نێوەڵ ٣) ئاوات «ل» ف ١) نگا **گاوْس** ٢) ستونی که بعنوان تکیه‌گاه بکار برده می‌شود ٣) امید

**گاوەخت** ga wext گاجار ف بعضـی اوقات

**گاوەرد** gawerd گۆوەرد، گاوخان ف مقدار زمینی که گاو در یک روز شخم می‌زند

**گاوەسان** gawesan گەلە گا، لە ئەوستا (gevû stane گەڤووستانە) نۆسریاس ف گلەگاو، دراوستا (gevû stane گووستانە) نوشته شده

**گاوەسن** gawesin گاواسن ف گاو آهن

**گاوەلۆ** gawelü هەلۆ گەورا وسییە ف هلوی درشت و سیاه رنگ

**گاوەنار** gawenar گۆوەنار، شمشێرە ف پیمی چوبی که «کوریه» را به «دارهەلا» در گاو آهن متـصل می‌کند

**گاهس** gahis گاهەس، گاس ف شاید

**گاهەس** gahes گاهس ف شاید

**گاوی** gawî بنوورە گاوْس «گاوی ستویەرەگەم دەنگێ زڵاڵە-کەرەێ لە وێنەێ رێخْ گڵاڵە» ف نگا **گاوْس**

**گای** gay کرد، گایەێ ف گایید

**گائانە** gaêane گادانە، گاودانە، لە سۆرانی «کزْن» ئۆشن ف گاودانە

**گائانەخوەر** gaêane xwer دیەکەیێگە لە ئارۆنئاوا ف روستایی بر آیین یارسان در اسلام‌آبادغرب

**گائار** gaêar جفتێار ف شخم زن، کسیکه بدنبال گاوهای شخمی زمین را شخم می‌زند

**گائاری** gaêarî جفتێاری ف شخم زنی

**گائێر** gaêr گێەر ف گودالی که در آن گندم ذخیره کنند

**گائێریا** gaêrya وەگاین دریا ف گایده شد

**گائێریان** gaêryan وە گان دریان ف گایده شدن

**گایلەگەبریای** gaylege biryay گەمەیێگە ژنانە وەێ تەور ک ژنەیلْ یەێ ئابادی سەر و مل پێچن و چنە ئاوایتر مانگایلێان دزن وژنەیلْ ئاوایتر تیەن و میبەیلْ ئی ئاوایە دزن ئی گەمە چۆنکە لە شەوە دْفێشتر ئڕاێ ئەزموون کردنْ دلْوجۆرەتْ ژنەیلە ف بازیی است مخصوص زنان بدین ترتیب که زنان یک روستا سر و صورت را پیچیده و به روستای مجاور می‌روند و گاوهای شیرده را می‌دزدند و زنان روستای مجاور به تلافی آمده میشهای روستا را می‌برند و این بازی چون در شب انجام می‌شود بیشتر برای آزمودن شجاعت زنان کُرد طراحی شده

**گاین** gayn گایین، لەسەکزی «گاین» ئۆشن ف گاییدن، در سکزی «گاین» گویند

**گایەمە** gayeme جوورێ پەڵووشەس ف نوعی گیاه «پەڵووشە»

**گت** git ١) تەقەڵ لە دۆرانن ٢) وچان، وسان ٣) گچ ٤) گورتینە «ل» ٥) پاشگرێگە چۆ ئات«گتْ گناڵ» لە فەرانسەی (gate) وە ماناێ فاسدە ف ١) دوخت ٢) وقفه ٣) کلمه راندن گوساله ٤) پرده بکارت ٥) پیش درآمد بد وخراب، در فرانسوی (gate) به معنی فاسد وخراب است

**گت کردن** git kirdin ١) دۆرانن ٢) وچان، وسان ف ١) دوختن ٢) وقفه کردن

**گتلی** gitlî گورتینە، گت «ل» ف پرده بکارت

**گت وفت** git û fit رێوڕەنگ ف نیرنگ

**گتْ وەن** giti wen دۆخت ودووز ف دوخت ودوز

**گتە** gite وچان دەرکردن و دەس کیشان لە کار ف وقفه

**گجا** gi ca کول جا، هەر جایگ ف همەجا

**گجارێ** gi carê کول وەختێ ف همه وقت

**گجْگ** gicig کورگە «بزْن تا گجگێ نەخورێ نانْ شووان نیەخوەێد» ف شرمگاه احشام بویژه بز

**گجوور** gi cûr کول جوورێ ف همەجور

**گجی** gicî ١) کول جی ٢) شەق، کراس ف ١) همەجا ٢) پیراهن

**گچ** giç گت ف کلمه راندن گوساله

**گچشتێ** gi çiştê کول چشتێ ف همه چیزی

**گخْ وخ** gixi wix گفت ولفت، گفت وخوڵک خاس ف آنکه ارتباط گیری قوی دارد، آنکه براحتی با دیگران ارتباط برقرار می‌کند

**گدووڵ** gidûl̂ نزم، کووتا ف کوتاه

**گدی** gidî دگی «گ» ف کلمه صدا زدن بُز

**گر** gir ١) پاشگره وه ماناێ قەرار گرتن «پاشگر، پێشگر» ٢) پاشگر وەماناێ بساو «دنیاگر، ماڵگر» ٣) پاشگر وەماناێ جی «ماڵ مێمانگر» ٤) پاشگر وه ماناێ فرمانکار «فاڵگر» ٥) پاشگر وەماناێ نێانگر «قەپگر» ٦) پاشگر وه ماناێ دڵخواز «دڵگر» ٧) کردارْ دەسووری ف ١) پسوند به معنی قرار گرفتن ٢) پسوند به معنی گیرنده ٣) پسوند بمعنی جادار ٤) پسوند به معنی کننده‌ی کار ٥) پسوند به معنی گاز گیرنده ٦) پسوند به معنی دلکش و گیرا ٧) فعل امر از گرفتن

**گڕ** gir̂ ١) ئان، دەم ٢) شۆڵەێ ئاگر، له هندی «گڕ» ئۆشن ٣) بێ وچان «تیرێ داسه لێم وەلا راسەوه- خۆنم گڕ نیەکەێ وه کراسەوه» ٤) تاوْ ئاگر ٥) گڕانْ سەگ ٦) گوڕەو بۊن ٧) داڵ گرتن له گەمەێ هەشارهەشار ف ١) دم، لحظـه ٢) شعله ، در هندی «گڕ»گویند ٣) بی وقفه، یکریز ٤) شدت گرما ٥) حالت تهاجمی سگ ٦) مشتعل شدن ٧) گرفتن «دال» در بازی قایم باشک

**گرا** gira ١) گیریا ٢) گورێ گرتن ٣) خا وه بەن کردنْ مامر ف ١) اسیر شدن ٢) الفت پیدا کردن، مانوس شدن ٣) هنگامه تخم گذاری جوجه بالغ

**گرا بەسان** gira besan گرا گرتنْ مامر، له فەرانسەی (grener) ئۆشن ف هنگامەای که جوجه بالغ شده و آماده تخمگذاری است، در فرانسوی (grener) به معنی تخم بستن است

**گرازە** giraze وه دەنگْ بەرز ناخاس وەتن، دەمەوەری ف با صدای بلند دشنام دادن، کنایه از کولیگری

**گرا گرتن** gira girtin ١) گرا بەسان ٢) گیرسیان ف ١) نگا **گرابەسان** ٢) مشتعل شدن

**گڕاڵ** gir̂al̂ گەڕاڵ «خوەم درەوەنیەگەێ گڕاڵ گردەو کەڕ تن خودا پێ داێ شەق حەریر له وەر» ف غله کم پشتی که حتی ارزش درویدن هم ندارد، از واژه «گَرّ» مشتق شده

**گراڵ** giral̂ دیەکەێگە له پاوە ف روستایی در پاوه

**گرام** giram ١) گیریام ٢) یەک له سەدْ کیلوو ٣) دەزگاێ گرامافوون ف ١) اسیر شدم، گرفتار شدم ٢) گرم، واحد وزنی ٣) گرامافون

**گران** giran ١) گیریان ٢) زێڕْ ئەرزان ٣) سەنگین ٤) مۆهم، له زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «گرینگ» ئۆشن ٥) گرانگ ف ١) گرفتار شدند ٢) گران قیمت ٣) سنگین ٤) مهم ٥) گلوگاه

**گڕان** gir̂an ١) ئاگرْ گوڕ ٢) گڕانْ سەگ ف ١) شعلەور ٢) حالت تهاجمی سگ

**گرانجام** giran cam گرانجان ف گرانفروش

**گرانجان** giran can گرانجام ف گرانفروش

**گرانسییە** giran sîye دژ هروو ف کسی که بسیار دیر رابطـه‌ی دوستی برقرار می‌کند

**گرانگ** giranĝ ١) ئەو بەش له قوڕاتەێ دار کْ چەترەو نێاێە و لەوە ئەو بان چەترەو داێە، له پەهلەوی (gerenĝhe گەرەنگهە) تۆسریاس ٢) گەردنە ف ١) از ریشه تا محل رویش ساقه، گلوگاه، در پهلوی (gerenĝhe گرنگهه) نوشته شده ٢) گلوگاه

**گڕانن** gir̂anin دێانەرِیچی گەماڵ له هەێنْ هەڵمەت بردن، لەفەرانسەی (grincer) وەماناێ دێان رِیچەکیە ف حالت تهاجمی سگ که دندانها را به علامت تهاجم نشان می‌دهد، در فرانسوی (grincer) بمعنی دندان قروچه است

**گرانی** giranî ١) زێڕْ ئەرزانی ٢) گیانەڵگیانی «دووسْ گرانی» ٣) سەنگینی ٤) قاتی، وشکەساڵی ف ١) گرانی نرخ ٢) صمیمی ٣) سنگینی ٤) تنگسالی، قحطـی

**گڕاوەن** gir̂awen دیەکەێگە له هەمەیل ف روستایی در حَمیل

**گڕ بۊن** gir̂ bün ئاگر گڕ کریاێ ف مشتعل شدن

**گڕپە** gir̂pe کڵپەێ ئاگر ف مشتعل شدن

**گرت** girt ١) گرد، ئەێ گرت ٢) لکْ چوو ف ١) گرفت ٢) برآمدگی روی چوبدستی

**گرتا** girta ١) تووک گردا، تووک گردەو ٢) ئەنامْ له جی چی وه جی خس ٣) رەسیه ئەوا، گردەوەێ ف ١) پوست کند، برگرفت ٢) عـضو در رفته را جا انداخت ٣) به او رسید

**گرتان** girtan ئەوانە گرت ف آنها را گرفت

**گرتانا** girtana ۱) ئەوانە گردا ۲) تووکێان گرتەو ۳) دەس و پەلێان گرتەو ف ۱) به آنها رسید ۲) پوست آنها را برگرفت ۳) اعضای در رفته را جا انداخت

**گرتانەو** girtanew بنوورە گرتانا ف نگا **گرتانا**

**گرتمە** girtime گردمە ف گرفته‌ام

**گرتمەسا** girtime sa ۱) ئەو پەلە کْ لە جی چیە گرتمەسەو ۲) سەنمەسەو، گرتمەسەو ف ۱) عضو دررفته راجا انداخته‌ام ۲) پس گرفته‌ام

**گرتمەسەو** girtime sew گردمەسەو، بنوورە گرتمە سا ف نگا **گرتمەسا**

**گرتمەمل** girtime mil وە مل گرتم ف بر عهده گرفتم

**گرتمەو** girtimew بنوورە گرتما ف نگا **گرتما**

**گرتمەوەێ** girtimeweŷ ۱) ئەو پەلە کْ لە جی چیە گرتمە سەو ۲) رەسیمەپێا ۳) تووکێ گرتمەو ٤) نەیشتم بەێدە زەو، گرتمەوەێ ف ۱) عضو در رفته را جا انداختم ۲) به او رسیدم ۳) پوستش را کندم ٤) مانع از افتادن شدم، او را گرفتم

**گرتمەێ** girtimeŷ گردمەێ ف او را گرفتم

**گرتن** girtin ۱) گردن، لە پەهلەوی (griften گرفتەن) نۆسریاس ۲) تووکەو گرتن ۳) ئەسیر کردن ٤) ئەنگار کردن ٥) کپا کردنْ کونا و... ٦) تراشینْ مۆ وناخۆن و...۷) پیرووز بۆن، چاکربۆن ۸) گۆشارتن، جەڕانن ۹) گونجانن، جی گرتن ۱۰) لە بەندیخانە کردن ۱۱) رەسین وە هاماڵ، تەک خسن ۱۲) پەل و پوو گرتنەوە ۱۳) جەمام بۆنْ ئەنام ف ۱) گرفتن، در پهلوی (griften گریفتَن) نوشته‌شده ۲) برگرفتن، کندن ۳) اسیر کردن ٤) فرض کردن ٥) اندودن سوراخ ٦) چیدن ناخن یا تراشیدن مو ۷) فتح کردن ۸) فشردن ۹) گنجایش ۱۰) حبس کردن ۱۱) رسیدن، به رقیب رسیدن ۱۲) شکسته‌بندی کردن یا گرفتن عضو در رفته ۱۳) گرفتگی عضـلات

**گرتنا** girtina ۱) لەێ نوو تووکەو گرتن ۲) رەسینە پێانا ۳) پەلێان گرتنەو ٤) نەیشتن بەنە زەوا، گردنانەو ف ۱) برگرفتند، پوست کندند ۲) به آنها رسیدند ۳) جا انداختن یا شکسته‌بندی اندام شکسته ٤) مانع از افتادنشان شدند

**گرتنەدڵ** girtne diĺ وە دڵ گرتن ف به دل گرفتن، دل گیر شدن

**گرتنە دەس** girtine des وە دەس گرتن ف به دست گرفتند

**گرتنەسا** girtine sa ۱) پەلەیلێان گرتنەسەو ۲) رەسینەسە پێانا ۳) تووکێان گرتنەسەو ف ۱) اعضای در رفته را جا انداخته‌اند ۲) به آنها رسیده‌اند ۳) پوستشان را برگرفته‌اند

**گرتنەسان** girtine san گردنەسان ف آنها را گرفته‌اند

**گرتنەسەو** girtine sew گرتنەسا ف نگا **گرتنەسا**

**گرتنەسەوەێ** girtine seweŷ ۱) تووکێ گرتنەسەو ۲) پەلەیلْ لە جی چی گرتنەسەو ۳) رەسینەسە پێا ٤) نەیشتنە بەێدە زەوا، گردنەسەوەێ ف ۱) پوست آنها را بر گرفته‌اند ۲) اعضای در رفته را جا انداخته اند ۳) به او رسیده‌اند، به او نزدیک شده‌اند ٤) مانع از افتادنش شده‌اند، او را در هوا گرفته‌اند

**گرتنەسەێ** girtine seŷ ئەوە گردتنە ف او را گرفته‌اند

**گرتنەکار** girtine kar وە کار گرتنە، گرتنەسە کار ف بکار گرفتند

**گرتنەمل** girtine mil گرتنەسە مل ف آنها برعهده گرفتند

**گرتنەناو** girtine naw وە ناو خوەێان گرتن ف در میان گرفتند

**گرتنەو** girtinew بنوورە گرتنا ف نگا **گرتنا**

**گرتنەوەێ** girtineweŷ ئەوە گرتنەو ف به او رسیدند

**گرتنەێ** girtineŷ ئەو گرتن ف او را گرفتند

**گرتنێا** girtiniêa گردنێا، بنوورە گرتنا ف نگا **گرتنا**

**گرتنێان** girtiniêan گردنێان ف آنها را گرفتند

**گرتنێەو** girtinŷew گردنێەو ف نگا **گرتنێا**

**گرتەدڵ** girte diĺ گردە دڵ ف دلگیر شد

**گرتەدەس** girte des گردە دەس ف بدست گرفت

**گرتەکان** girtekan گردەکان ف گردو

**گرتەمل** girte mil گردە مل ف بر عهده گرفت

**گرتەو** girtew گردەو، بنوورە گرتا ف نگا **گرتا**

**گرتەوەێ** girteweŷ ۱) رەسیە پێا ۲) پەلێ کْ وە جی چۆد گرتەو ۳) تووکێ گردەو ٤) نەیشت بەێدە زەو، گردەوەێ ف ۱) به او رسید ۲) عضو در رفته را جا انداخت ۳) پوستش را بر گرفت ٤) مانع از افتادنش شد

**گرتەێ** girteŷ گردەێ ف او را گرفت

**گرتی** girtî گردی ف گرفتی

**گرتێ** girtê نگران، ناڕەحەت ف گرفته، غمگین

**گرتیا** girtya ١) رەسیدە پێ ٢) ئەو پەلە کْ وە جی چۆد گرتیدا ٣) تووکێ گردیدا ٤) گردیدیا ف ١) به او رسیدی ٢) عضو در رفته راجا انداختی ٣) پوست آن را برگرفتی ٤) مانع از افتادنش شدی

**گرتێا** girtêa ١) رەسیە پێا ٢) ئەوپەلە کْ وەجی چۆد گرتەو ٣) تووکێ گرتەو ٤) نەیشت بەێدە زەوْوا، گردێا ف ١) به او رسید ٢) عضو در رفته را جا انداخت ٣) پوستش را برگرفت ٤) مانع ازافتادنش‌شد

**گرتیان** girtyan گردیان ف آنها را گرفتی

**گرتێان** girtêan گردێان ف آنها را گرفت

**گرتیەو** girtyew گردیەو، بنوورە گرتیا ف نگا **گرتیا**

**گرتێەو** girtŷew گردێەو، بنوورە گرتێا ف نگا **گرتێا**

**گرچ** girç گرت، لکْ چوو ف گره چوب

**گرچْگ** girçig لیزمەێ تەرگ لە ناو سیەماڵ ئەرِاێ وەرگیری لە واراناو ف مقداری هیزم که در کف سیاه چادر می‌گذارند و نمد یا قالی را روی آن پهن می‌کنند تا آب ناشی از باران باعث خیس شدن وسایل خانه نشود

**گرچگرچ** girç girç گرنج گرنج ف چوب گره‌دار

**گرچن** girçin گرچگرچ، گرنجگرنج ف چوب گره‌دار

**گرد** gird ١) بنوورە گرت ٢) خرِ ٣) وە کولی ٤) قورنە ، دەورا دەور ٥) کۆرتەبالاَ ف ١) نگا **گرت** ٢) مدور، گرد ٣) یکجا، بەکلی ٤) محیط ، پیرامون ٥) کوتاه‌قد

**گردا** girda گردەو، گرتەو، بنوورە گرتا ف نگا **گرتا**

**گردا بۆن** girda bün کووەو بۆن ف جمع شدن

**گردا کردن** girda kirdin گردەو کردن ف گردآوری کردن

**گرداو** girdaw گێژاو ف گرداب

**گرد برِ** gird bir̂ لە بنەو برِیان ف کاملاً از ته بریده شدن

**گردبەن** girdben وە کولی ف همگی، جملگی

**گردْپەرِ** girdi per̂ ١) گردْفرد ٢) کووەو کردنْ خەرمانْ کوتیاێ ٣) دەورە کردن ف ١) جمع و جوور ٢) گرد کردن خرمن کوبیده شده ٣) احاطه شده

**گرد شک** gird şik ١) لە بنەو شکیان ٢) لە پیەناوە شکیان ف ١) کاملا شکسته و خرد ٢) از قسمت پهنا یا عرض شکستن

**گردْفرد** girdi fird ١) خنجی منجی ٢) رەنگین، خنجْ منج ف ١) جمع و جور ٢) زیبا، کوچولوی زیبا روی

**گرد کردن** gird kirdin گردا کردن ف گردآوری کردن

**گردْگ** girdig ١) گلێ، جوورێ نان ٢) گووشتْ گن، گلْنگ ف ١) نوعی نان ٢) گوشت لُپ، فیله

**گردْ گنیلْک** girdi ginîlik ١) وە کولی، وە گشتی ٢) نەختی، وە نەخت ف ١) به طور یک جا، جملگی، همگی ٢) نقداً، نقدی

**گردن** girdin بنوورە گرتن ف نگا **گرتن** وترکیباتش

**گردۆ** girdü گرتۆ ف گرفته بود

**گردوُ** girdû گردەکان، گوز ف گردو

**گردوگردبەن** gird û girdben وە کولی، وە گشتی ف همگی، جملگی

**گردە** girde ١) گردْگ، گلێ ٢) خرِە ف ١) نوعی نان ٢) گرد است، مدور است

**گردەبا** girde ba گەردەگۆچان ف گردباد

**گردەکان** girdekan گردوو، گوز، لە پەهلەوی (guz گوز) نۆسریاس ف گردو، درپهلوی (guz گوز) نوشته شده

**گردەکانقاقەزی** girdekanqaqezî جوورێ گردەکانْ پووس نازکە ف نوعی گردوی پوست نازک

**گردەکانە** girdekane دیەکەێگە لە کەنگەوەر ف روستایی در کنگاور

**گردەڵ** girdeɫ خرِیلْک ف مدور

**گردەنشین** girde nişîn گولْوولْە بۆن ف ازکار افتادن و خانەنشین شدن

**گردەنوو** girdenû دیەکە وتەپەێگە لە زهاو ف روستا و تپه‌ای در سرپل ذهاب

**گردەو** girdew گرتەو ف نگا **گرتەو** و ترکیباتش

**گردەو بۆن** girdew bün گردا بۆن ف جمع شدن

**گردەو کردن** girdew kirdin گردا کردن ف گردآوری کردن

**گردەوەێ** girdeweŷ گرتەوەێ ف نگا **گرتەوەێ**

**گردی** girdî ١) بنوورە گرتی ٢) خرِی ف ١) نگا **گرتی** و ترکیباتش ٢) گردی، مدوری

**گردێ** girdê دیەکەێگە لە جووانرِو ف روستایی در جوانرود

**گردین** girdîn گرتین ف نگا **گرتین** و ترکیباتش

**گرز** girz گرزنە، ساقەێ کەوەزەنگ ف ساقه‌ی چوب خشک و سفت

**گرزکه** girzke نانێ کْ چەورێ کەن و دەنەێ سەگ «گ» ف نانی که آنرا چرب کرده و به سگ می‌دهند

**گرزنچن** girzin çin جوورێ بافینه له قەڵماسنگ ف نوعی بافتن در قلابسنگ

**گرزنه** girzine گرز، قۆتووێ کەوەزەنگ ف ساقەی چوب سفت و خشک

**گرزه** girze بنووڕه رسک ف نوعی موش بزرگ، نگا **رسک**

**گرژ** girj ئەخم وتەخم کردن ف خشمگین شدن

**گرژ بۆن** girj bün گرژ هەڵاتن ف خشمگین شدن

**گرژ هەڵاتن** girj heĺatin گرژ بۆن ف خشمگین شدن

**گرسانن** girsanin گیرسانن، دەم دان ف افروختن

**گرسووز** girsûz جوورێ چراخه ف گردسوز، نوعی چراغ روشنایی

**گرسیا** girsya گیرسیا ف افروخته شد

**گرسیاگ** girsyag گیرسیاگ ف روشن شده

**گرسیان** girsyan گیرسیان ف روشن شدن

**گرسیاێ** girsyaê گیرسیاێ ف افروخته شده

**گرشه** girşe درەوشیان ف درخشش

**گرشەدار** girşe dar پرتۆر ف نورانی

**گرشەگرش** girşe girş بریقْباق ف درخشش

**گرفت** girift گیر وگرفت ف مانع، سد راه، مشکل

**گرفتار** giriftar ١) یەخسیر ٢) لاناوه له ئاشق ف ١) اسیر، گرفتار ٢) کنایه از عاشق

**گرفتار بۆن** giriftar bün ١) عاشق بۆن ٢) یەخسیر بۆن ف ١) عاشق شدن ٢) گرفتار شدن

**گرفتاری** giriftarî ئەنگەمه، گیر وگرفت ف گرفتاری، درد سر

**گرفه** girfe کوڵپه، گرپه ف صدای شعله آتش

**گرفەگرف** girfe girf گرفەێ هەیتاهەیت ف صدای پیاپی شعله آتش

**گڕکردن** gir̂ kirdin گوڕ کردن ف مشتعل ساختن آتش

**گڕگ** girig چەو تیل ف کسی که چشمانش گیچ است

**گڕگاڵ** girî gaĺ گاڵه کردنْ منال ف صدای نوزاد

**گرگاو** girgaw ئەوچگه له خەلیه کْ له ڕێخشوور وه جی بمینێد، سییەگنیلْک «ل» ف نگا **سییەکنیلْک**

**گڕگڕ** gir̂ gir̂ جار جار ف گاەبگاه

**گڕگرتن** gir̂ girtin گوڕگرتن ف مشتعل شدن آتش

**گڕگڕێ** gir̂ girê جار جارێ ف گاهگاهی

**گڕگورج** girî gwirc گورجْ فرج ف آماده، چابک

**گڕگورجەو بۆن** girî gwircew bün گورجەو بۆن ف آماده شدن

**گڕگورجەو کردن** girî gwircew kirdin گورجەو کردن ف آماده کردن

**گڕگه** girîge تۆڵ، کالگ ف نوعی خربزه دیمی

**گرم** girm ١) دەنگْ گرمەێ هەور ٢) دەنگْ گوله ٣) دەنگْ کەفتنْ چشتْ سەنگین ف ١) صدای رعد و برق ٢) صدای گلوله و بمب ٣) صدای افتادن جسم سنگین

**گرْم** girim ئەوەڵ کەسْ یەکڵه له گرتن ف می‌گیرم

**گرْما** girima ١) ڕەسمه پێەو ٢) ئەو پەله کْ وه جی چیه ئەوجی خەم ٣) تووکێ گرمەو ٤) نیەیلم بەێده زەتوا، گرْمەو ف ١) به او می‌رسم ٢) عضو در رفته را جا می‌اندازم ٣) پوستش را می‌گیرم ٤) از افتادنش جلوگیری می‌کنم

**گرْمان** giriman ئەوانه گرْم ف آنها را می‌گیرم

**گرْمانا** girimana ١) ڕەسمه پێانا ٢) ئەو پەلەیله کْ وه جی چینه ئەو جی خەم ٣) تووکێان گرمەو ٤) نیەیلم بەنه زەتوا، گرْمانەو ف ١) به آنها می‌رسم ٢) اعضای در رفته را جا می‌اندازم ٣) پوستشان را می‌گیرم ٤) در هوا می قاپم، مانع از افتادنشان می‌شوم

**گرمانن** girmanin گرمەهەڕْ ئاسمان، له رووسی (grom) ئۆشن ف غرنبیدن، در روسی (grom) گویند

**گرْمانەو** girimanew بنووڕه گرْمانا ف نگا **گرْمانا**

**گرمْگه** girmige سەخری ف باسن

**گرمْگه قەق** girmige qeüقنگ قەق ف کنایه از کون گشاد

**گرمْن** girmin زگ قەق، له فەرانسەی (gourmand) ئۆشن ف پُر خور، شکم گنده، در فرانسوی (gourmand) گویند

**گرمْهڕ** girmi hir̂ گرمەهەڕ، له پەهڵەوی (gerun mane گەرونمانه) ئۆسریاس ف رعد و برق، آسمان غرنبه، درپهلوی (gerunenam گروونمانه) نوشته‌شده

**گرمْوهڕ** girm û hir̂ گرمْ هڕ ف آسمان غرنبه

**گرمه** girme بنووڕه گرم ف نگا **گرم**

**گرمەگرم** girme girm گرمەێ هەیتاهەیت ف صدای«

گرمه»ی پیاپی

**گرْمەو** girimew بنووڕە گرْما [ف] نگا **گرْما**

**گرْمەوەیٚ** girimeweŷ ١) ئەوە گرمەو ٢) رەسمە پێا ٣) تووکیٚ گرْمەو ٤) پەلْ شکیایٚ یا دەرچیٚ گرمەو [ف] ١) در هوا می‌قاپم، مانع از افتادنش می‌شوم ٢) به‌او می‌رسم ٣) پوستش را می‌گیرم ٤) عضو در رفته را جا می‌اندازم

**گرمەهەڕ** girme her̂ گرمْ هڕ [ف] نگا **گرمْهڕ**

**گرْن** girin ئەوانە گرْن، ئەوەلْ کەسْ گەل لە گرتن [ف] می‌گیرند

**گرْنا** girina ١) رەسنە پێەو ٢) پەلەیلْ لە جی چی ئەو جی خەن ٣) تووکێان گرْنەو ٤) نیەیلن بەیْدە زەوْوا، گرْنەو [ف] ١) به آنها می‌رسند ٢) اعضای در رفته را جا می‌اندازند ٣) پوستشان را می‌گیرند ٤) در هوا می‌قاپند، مانع از افتادنشان می‌شوند

**گرْنان** girinan ئەوانە گرْن [ف] آنها را می‌گیرند

**گرنج** girinc ١) چوو گرتەدار ٢) ئاژانن «گیانیٚ گرنج گرنجەو کرد» [ف] ١) چوب گره‌دار ٢) آجیدن، زبری

**گرنج گرنج** girinc girinc بنووڕە گرنج [ف] نگا **گرنج**

**گرْنە دلْ** girine dil̂ وە دلْ گرْن [ف] دلگیر می‌شوند

**گرْنە دەس** girine des وە دەس گرْن [ف] به دست می گیرند

**گرْنە مل** girine mil وە مل گرْن [ف] بر عهده می‌گیرند

**گرْنەو** girinew بنووڕە گرْنا [ف] نگا **گرْنا**

**گرْنەوەیٚ** girineweŷ ١) ئەوە گرْنەو ٢) رەسنە پێا ٣) تووکیٚ گرْنا ٤) پەلْ شکیایٚ یا لە جی چیٚ گرنەو [ف] ١) در هوا می‌قاپند، مانع از افتادنش می‌شوند ٢) به او می‌رسند ٣) پوستش را می‌گیرند ٤) عضو در رفته را جا می‌اندازند

**گرۆ** girô ویْانگْ منالْ [ف] بهانه‌گیری بچه

**گرووژ** girûj کول رووژێگ [ف] همه روزه

**گرووژانە** gi rûjane کول رووژێگ [ف] همه روزه

**گرووژیٚ** gi rûjê کول رووژێگ [ف] همه روزه

**گرووژێگ** gi rûjêg کول رووژێگ [ف] همه روزه

**گروفڕ** gir̂ û fir̂ فیس و کبر، ترِوفیس [ف] خودستایی

**گروگالْ** gir̂ û gal̂ گرْگالْ [ف] صداهای نامفهوم نوزاد

**گرە** girê ١) تاوێشت ٢) گرانْ سەگ [ف] ١) هـُرم، گرما ٢) حالت تهاجمی سگ

**گرەکەر** girê ker ١) بریقە کەر ٢) لاناوە لە جەڕْنیمە رووژ [ف] ١) درخشان ٢) کنایه از ظهر

**گرەکەر نیمەڕوو** girê keri nîmerû جەڕْ نیمەڕوو [ف] گرمای نیم روز

**گرەگڕ** girê gir̂ گرەیٚ ئاگر [ف] گرمای آتش

**گرەو** girew ١) مەرج ٢) گرەوگان [ف] ١) شرط، گرو ٢) گروگان

**گرەوسیان** girewsyan ماوەیٚ نفتە بەسیان [ف] زمان تشکیل نطفه

**گرەوشیان** girewşyan گۆیەریانْ رەنگ [ف] تغییر رنگ دادن

**گرەو کردن** girew kirdin مەرج کردن [ف] شرط کردن، شرط بندی

**گرەوگان** girewgan یەخسیری [ف] گروگان

**گرەو گرتن** girew girtin گرەوگان گرتن [ف] در گرو گرفتن

**گرەوی** girewî گرەو گرتن [ف] به گروی گرفتن

**گرەوی گرتن** girewî girtin گرەو گرتن [ف] به گروی گرفتن

**گری** girî ١) گیرە، گیرسن ٢) ئەوەلْ کەسْ یەکلە لە گرتن [ف] ١) گریستن ٢) می‌گیری

**گرێا** girêa ١) رەسێدە پێانا ٢) ئەو پەلەیلْ لە جی چیە ئەو جی خەێد ٣) نیەیلیٚ بەیْدە زەوْوا، گرێدا ٤) تووکیٚ گرێدەو [ف] ١) به آنها می‌رسد ٢) اعضای در رفته را جا می‌اندازد ٣) مانع از افتادنش می‌شود ٤) پوستشان را می‌گیرد

**گریا** girya ١) ئەوْ گیریا ٢) بنووڕە گریدا [ف] ١) گرفته شد، اسیر شد ٢) نگا **گریدا**

**گریان** giryan ١) ئەوانە گریان ٢) گیرە کردن [ف] ١) آنها گرفته شدند ٢) گریستن

**گریانا** giryana ١) پەلەیلْ لە جی چی ئەو جی کەفتن ٢) ئەوانە گریانەو [ف] ١) اعضای در رفته جا انداخته شدند ٢) به آنها رسیدند، آنها را گرفتند

**گریانە** giryane ١) گیریانە ٢) دائم گیرە کەن [ف] ١) گرفته شده‌اند ٢) همیشه گریانند

**گریانەو** giryanew بنووڕە گریانا [ف] نگا **گریانا**

**گرێبەست** girêbest پەیمان، قەرارداد [ف] قرارداد، شرط

**گریپەلْمووکە** girî peĺmûke ١) ئاگرەوارە بۆن ٢) بنووڕە

پەڵمەگیرە [ف] ١) سراسیمه شدن ٢) نگا **پەڵمەگیرە**

**گریت** girît پەلامار بردن، له فەرانسەی (guerre) وه ماناێ شەڕە [ف] یورش بردن، در فرانسوی (guerre) به معنی جنگ است

**گریچ** girîç بنووڕە گۆژ، گۆج [ف] زالزالک، نگا **گۆژ**

**گرید** girîd ١) گیره کەید ٢) گری [ف] ١) گریه می‌کنی ٢) می‌گیری

**گرێد** girêd گرێ [ف] می‌گیرد

**گریدا** girîda ١) رەسیده پێا ٢) ئەو پەله کْ وه جی چیه ئەو جی خەید ٣) نیەیلی بەێده زەق، گریدەو ٤) تووکێ گریدەو [ف] ١) به آنها می‌رسی ٢) عضو در رفته را جا می‌اندازی ٣) مانع از افتادنش می‌شوی ٤) پوستش را می‌گیری

**گرێدا** girêda ١) ئەوانه گرێدا ٢) ئەو پەڵْ له جی چیه ئەوجی خەێد ٣) نیەیلێد بەێده زەق‌وا ٤) تووکێ گرێدەو [ف] ١) به آنها می‌رسد ٢) عضو در رفته را جا می‌اندازد ٣) مانع از افتادنش می‌شود ٤) پوستش را می‌گیرد

**گریدان** girîdan ئەوانه گرید [ف] آنها را می‌گیری

**گرێدان** girêdan ١) ئەوانه گرێد ٢) گریه دان [ف] ١) آنها را می‌گیرد ٢) گره می زند

**گریدانا** girîdana ١) رەسیده پێانا ٢) ئەو پەلەیله کْ وه جی چینه گریدەو ٣) نیەیلی بەنه زەق‌وا، گریدانەو ٤) تووکێان گریدەو [ف] ١) به آنها می‌رسی ٢) اعضای در رفته را جا می‌اندازی ٣) مانع افتادنشان می‌شوی ٤) پوستشان رامی‌گیری

**گرێدانا** girêdana ١) رەسێده پێانا ٢) نیەیلێ بەنه زەق‌وا، گرێدانەو ٣) تووکێان گرێدەو ٤) ئەو پەلەیله کْ وه جی چینه گرێدەو [ف] ١) به آنها می‌رسد ٢) مانع افتادنشان می‌شود ٣) پوست آنها را می‌گیرد ٤) اعضای در رفته را جا می‌اندازد

**گری کردن** girî kirdin گیره کردن [ف] گریستن

**گرێگ** girêg گرێ، کاتێگ [ف] دمی، لحظه‌ای

**گرێ گاو** girê gaw دەنگْ گیرسن [ف] صدای هق‌هق گریه

**گریم** girîm گریمن [ف] می‌گیریم

**گریما** girîma ١) رەسیمنه پێانا ٢) نیەیلیم بەنه زەق‌وا، گریمنا ٣) ئەو پەلەیله کْ وه جی چینه ئەو جی خەیم ٤) تووکێان گریمنەو [ف] ١) به آنها می‌رسیم ٢) مانع از افتادنشان می‌شویم ٣) اعضای در رفته‌را جا می‌اندازیم ٤) پوستشان را می‌گیریم

**گریمْن** girîmin بنووڕە گریم [ف] نگا **گریم**

**گرین** girîn ١) دۆیەم کەسْ گەل له گرتن ٢) گری [ف] ١) می‌گیرید ٢) گریه کردن

**گرینا** girîna ١) رەسینه پێانا ٢) پەڵْ له جی چی ئەو جی خەین ٣) نیەیلین بەێده زەق‌وا ٤) تووکێ گرینەو [ف] ١) به او می‌رسید ٢) عضو دررفته را جا می‌اندازید ٣) مانع از افتادنش می‌شوید ٤) پوستش را می‌گیرید

**گرینان** girînan ئەوانه گرین [ف] آنها را می‌گیرید

**گرینەدەس** girîne des وه دەس گرین [ف] بدست می‌گیرید

**گرینه مل** girîne mil وه مل گرین [ف] برعهده می‌گیرید

**گرینەو** girînew بنووڕە گرینا [ف] نگا **گرینا**

**گرینەوەێ** girîneweŷ ١) ئەوه گرینەو ٢) رەسینەپێا ٣) پەڵْ پوو گرینەو ٤) تووک ئەوه گرینەو [ف] ١) مانع از افتادنش می‌شوید ٢) به او می‌رسید ٣) عضو در رفته جا می‌اندازید ٤) پوستش را می‌گیرید

**گرینەێ** girîneŷ ئەوه گرین [ف] او را می‌گیرید

**گریو** girîw گیره، گری [ف] گریه

**گریوانن** girîwanin گیرانن، وەگیره خسن [ف] گریاندن

**گرێ ورێ** girê wirê فێڵ دان [ف] آنکه کاسه‌ای زیر نیم کاسه دارد

**گریوە** girîwe گیره [ف] گریه

**گریه** girye ١) گیره ٢) قڵف وبەن وه گورووک ٣) گرتەێ دار [ف] ١) گریه ٢) گره، گره زدن ٣) گره در چوب

**گریەپێچ** girye pêç گریەدان و واز نەکردن [ف] گره محکم زدن و نگشودن

**گریەخواردن** girye xwardin گریەپێچ کەفتن [ف] گره خوردن

**گریەدان** girye dan ١) گریه داین ٢) ئەوانه گریه دان [ف] ١) گره زدن ٢) آنها گره زدند

**گریەداین** girye dayn ١) گریه دان ٢) ئۆیه گریه داین [ف] ١) گره خوردن ٢) شما گره زدید

**گریەسییە** girye sîye دیەکەێگه له دێره [ف] روستایی در دیره

**گریەکوورە** girye kûre گریه له بانْ گریه دان [ف] گره روی گره زدن

**گریه له کارکەفتن** girye le kar keftin گیر و گرفت له

کار ف گره در کار افتادن

**گریە وڕووو** girye û r̂û گریە و روو روو ف گریه وشیون

**گریەی** giryey گریەید ف گرفتار می‌شوی

**گریەێ** giryeŷ گرێەێد ف گرفتار می‌شود

**گرْ یەێجا** girî yeŷ ca زۆزی، گوڕاێ گوڕ ف دم به ساعت، هر دقیقه

**گز** giz ١) فەن، لەیلاجی ٢) زەنْبەلەق ٣) هەکە «چنجْگ گز دێرێد» ف ١) نیرنگ، حیله ٢) کوشش، تلاش ٣) حکه، کرم

**گزتاو** giztaw زەنْبەلەق ئەڕاێ کارێگ ف کوشش و جهد برای انجام کاری

**گزتاو کردن** giztaw kirdin گزتاو داشتن ف تلاش داشتن، کوشش داشتن

**گزْک** gizk هان، بلْووم «ل» ف تشجیع، تحریک

**گزْگ** gizig گزێ، بنوورە جاڕوو ف جارو، نگا **جاڕوو**

**گزْگدان** gizig dan گزێ دان ف جارو زدن

**گزگز** giz giz وە تەشْ تاو، وە تاو ف باعجله، باشتاب

**گزگلْ** gizgiľ بنوورە کلْکاف «گ» ف نگا **کلْکاف**

**گزگەیل** gizgeyl گزتاو، هەڵەپڵە کردن لە خواردن «ئامان لەیلی گزگەیلی- نان لە خوانچە نمەیلی» ف آنکه بسیار با عجله غذا می‌خورد

**گزلیک** gizlîk ١) سوڕ، ئەو کەسە کْ خۆنْ خوەێ وە ملْ دیگران کەێد ٢) جووری درگە ف ١) افراد سمج، مانند گنه چسبیدن ٢) نوعی خار

**گزم** gizm ١) لەت، تیکە، کوت ٢) رفاتە،رفه ف ١) قطعه ٢) ضخامت، کلفتی، قطر

**گزمگزم** gizm gizm تیکەتیکە ف قطعه قطعه

**گزمووڵە** gizmûľe گولوو خەڕگین ف گلوله گلی

**گزْن** gizin فەنباز ف نیرنگباز

**گزنەک** giznek گەزنەک ف بیماری اگزما

**گزێ** gizê گزْگ ف جارو

**گزێ دان** gizêdan گزْگ دان ف جارو زدن

**گزیر** gizîr ١) گزْن ٢) پاکار ف ١) نیرنگباز ٢) نماینده خان که مامور گردآوری مالکانه است

**گزیل** gizîl گزْن، گزیر ف نیرنگ باز

**گزینْک** gizînik ١) ختْ پشکەر ٢) دۆیەتی چەو، لە تۆرکەمەنی «گوزونگ» ئۆشن ف ١) کاوش وجستجو از روی فضولی ٢) مردمک چشم، درترکمنی «گوزونگ» گویند

**گزێ نەفتینە** gizê neftîne کتکەنەفتینە، کتگ ف سخن چین، دو بهم زن

**گژ** gij ١) کەڵە گژ، وشەێ هان دانْ کەڵێا ٢) قەێ «گژْ دار» ٣) دەنگْ وا ٤) شەڕ کردن «چینە گژْ یەکەو» ٥) مۆ، قژ ٦) گیا، گژْ گیا ف ١) کلمه تشجیع گاو نر ٢) بالا رفتن ٣) صدای باد در منفذ ٤) گلاویزشدن ٥) موی ژولیده ٦) گیاه‌جات، ادویه جات

**گژاو** gijaw کەڵە گژژ ف کلمه تشجیع گاو نر

**گژْگ** gijg کوژەک «ل» ف دکمه

**گژگژی** gijgijî قژقژی ف موی آشفته و درهم

**گژْ گیا** giji gya گژ وگیا ف ادویه‌جات گیاهی

**گژمووڵە** gijmûľe گولوو خەڕگین ف گلوله گلی

**گژْن** gijin قژن ف ژولیده مو

**گژنیژ** gijnîj گشنیز ف گیاه گشنیز

**گژنیژە** gijnîje ١) جووری زینەتی ژنانەس ٢) دەنْگ ئەرەقْ رق دەمچەو ف ١) نوعی زیور زنانه ٢) دانه‌های ریز عرق بر گونه

**گژ وگیا** gij û gya گژْگیا ف ادویه‌جات گیاهی

**گژە** gije ١) گژاو ٢) دەنگْ وا ف ١) کلمه تشجیع گاونر ٢) صدای باد در منفذ

**گژەبا** gije ba گژەوا ف باد تند

**گژەگژ** gije gij گژەێ وا ف صدای پیاپی باد

**گژەێ وا** gijeŷ wa دەنگْ وا ف صدای باد

**گست** gist تۆواس «ل» ف خواست، طلبید

**گستن** gistin هواستن، تۆواسن «ل» ف خواستن

**گسْک** gisik گزْگ ف جارو

**گسْک دان** gisik dan گزْگ دان ف جارو زدن

**گش** giş گشت، کول ف همه

**گشت** gişt گش ف همه، همگی

**گشتْ دان** giştidan ئێوە وە گشتی ف همه شما

**گشتکارێ** gişt karê گشکارێ ف همه کاری را، همه کار

**گشتکەس** gişt kes گشکەس ف همه کس من

**گشتْمان** giştiman ئیمە وە گشتی ف همه ما

**گشتێ** giştê کولێ، گشتێان ف همه، جملگی

**گشتێان** giştêan ئەوان وە گشتی ف همه آنها

**گشکارێ** giş karê گشتکارێ ف همه کاری

**گشکەس** giş kes گشتکەس ف همه کس من

**گشکەسەگەم** giş kesegem گشکەسم ف ای همه کس من

**گشکەسێ** giş kesê کول کەسێگ ف همه کسی

**گفت** gift وەتن، پەیمان ف پیمان، قول

**گفتْ لفت** gifti lift حاڵ خەوەر ف احوالپرسی، جویا شدن

**گفتمان** giftiman وەت و وێژ ف گفتمان، گفتگو

**گفتْ واز** gifti waz وەتن، گفتمان ف باز گو کردن

**گفتە** gifte ۱) بەیشەرات ۲) فزە «گفتە نەکرد» ف ۱) پیمان، قول ۲) کمترین سخن، کمترین صدا

**گڤ** giv ۱) گژ، قژ ۲) ڤنگەێ کوچگ ۳) گرژ هەڵاتن «فڵانی گڤ کردێە» ف ۱) موی ژولیده ۲) صدای پرتاب سنگ ۳) خشم، عصبانیت

**گڤْ گاڵ** givi gaĺ بەرچە کردن و وراوە وژاوە ف تهدید توخالی، تهدید لفظی

**گڤن** givin گڤ دریژ ف ژولیده موی

**گڤە** give ڤینگەێ کوچگْ قەڵماسنگ ف صدای پرتاب سنگ از فلاخن

**گڤەگڤ** give giv گڤْ گاڵ ف تهدیدتوخالی، تهدید لفظی

**گکارێ** gi karê کول کارێگ ف همه کاری

**گگل** gigil کولیچە وە زووانْ منالّەیل ف بیسکویت به زبان کودکان

**گل** gil ۱) جار، کەرەت ۲) بنچینەێ کردارْ گلانن ۳) خلورانن، لە سەکزی «گل» ئۆشن ٤) گلادان ٥) گل خواردن ٦) لک، قوتە «خوداکەس نەوْنێ لە پەژارەێ من- قسیەێ دووس گلە لە گلارەێ من» ۷) ژان، ئەیش «گل بکەی» ف ۱) بار، دفعه ۲) ریشه فعل «گلانن» به معنای زمین زدن ۳) غلت، درسکزی «گل» گویند ٤) نزدخود نگه داشتن ٥) گردش کردن، گشتن، راه رفتن ٦) غده، آماس ۷) درد، ناخوشی

**گڵ** giĺ ۱) خاکەرا ۲) رۆشوور ۳) خەرێ ف ۱) سرشت ۲) گل سر شوی ۳) گل

**گڵا** giĺa وەڵنگ ف برگ درخت

**گلابێە** gila bŷe ۱) گلەو بێە ۲) لە لای خوەد گل بێە ف ۱) مانع از رفتن شو ۲) نزد خود نگەدار

**گڵاخان** giĺa xan گەڵاخان، گڵارێزان ف برگریزان

**گلاخواردن** gila xwardin گلەوخواردن ف مراجعت کردن ، برگشتن

**گڵاخە** giĺaxe قژگە ف شاخ و برگ ریز درختان

**گلادان** gila dan ۱) گلەو دان ۲) هەرۆکە دان ف ۱) نزد خود نگه داشتن ۲) مانع شدن

**گلادایِن** gila dayn ۱) گلادان ۲) هەرۆکە دان ف ۱) نزد خود نگه داشتن ۲) مانع شدن

**گلادە** gila de ۱) گلەو دە ۲) لە لای خوەد بیل ف ۱) مانع از رفتن شو ۲) نزد خود نگەدار

**گلاراو** gilaraw ۱) نەخوەشی سیپەڵاو ۲) لاناوە لە نەسرەویان ف ۱) بیماری آب مروارید ۲) کنایه از آرام وقرار نداشتن

**گلاراو کردن** gilaraw kirdin لاناوە لە نەسرەویان ف کنایه از آرام ننشستن

**گڵارزیان** giĺa r̂izyan لاناوە لە پیری هاتن ف کنایه از پیر شدن

**گلار بۆن** gilar bün سەرەو ژێر بۆن ف سرازیر شدن، غلتیدن

**گلارْک** gilarik دۆیەتی، گزینْک «گ» ف مردمک چشم

**گلارە** gilare ۱) دیدە، دیە، چەو، لە عبری «گلارا» ئۆشن ۲) ناوێگە ژنانە ۳) گزینْک ف ۱) چشم، دیده، در عبری « گلارا» گویند ۲) نامی زنانه ۳) مردمک چشم

**گلارەگەم** gilaregem چەوەگەم ف ای نور دیدەام

**گڵارێزان** giĺarêzan ۱) وەرزْ تۆل تەکن ۲) مانگ شەشمْ ساڵ ف ۱) پاییز ۲) ماه شهریور

**گڵاڵ** giĺaĺ کووردەرە، دەروەن ف درەای که رودخانەی فصلی دارد

**گلان** gilan ۱) گەمەێگە چۆ گولوان ۲) رمان ۳) پەسا کردن و شوورتنْ نژی ف ۱) بازیی مانند تیلەبازی ۲) بر زمین زدن ۳) پاک کردن وشستن غلات بویژه ماش و عدس

**گلانن** gilanin رمانن ف بر زمین زدن

**گلاوش** gilawş بنوورە کریس، تایە ف نگا **کریس**

**گل بوونەوە** gil bûnewe گلار بۆن ف غلتیدن

**گل بێە** gil bŷe ۱) بنوورە گلابێە ۲) خرِ بێە، بگەردن ف ۱) نگا **گلابێە** ۲) بچرخان، بگردان، فعل امر از «گل‌دان»

پسوند فاعلی، فرستنده ۳) کنایه از شجاع

**نێرانه** nêrane کوڕانه، پیاوانه [ف] شجاعانه

**نێردووڵه** nêrdûĺe دیه‌که‌یگه له چه‌رداوڕ [ف] روستایی در چرداول

**نێرزا** nêr za نێره‌زا، دژمینێگه وه ماناێ نێردانیش زایه [ف] توهینی به معنای اینکه نرّ شما هم می‌زاید

**نێرش** nêriş دیه‌که‌یگه له جووانرۆ [ف] روستایی در جوانرود

**نێرگ** nêrig ۱) زاتدار ۲) دوڕ [ف] ۱) نترس ۲) زور گو، دیکتاتور

**نێرگه‌له** nêrgele رییه‌نْ بزن وکاوڕ یا که‌ڵیا ئڕاێ په‌رواری [ف] رمه بُز یاگوسفند یاگاو نرّ جهت پروار بندی

**نێرْما** nêri ma نێروما، ئڕاێ ئایم و بزن و... باوه‌ڕ مه‌ردم یه‌سه کْ ئه‌گه‌ر بزن نێروما له ناو رییه‌ن بوو به‌ره‌که‌ت دێرێد [ف] خنثی، شامل انسان و بُز و بر این باورند که اگر بُز خنثی در میان گله باشد برکت دارد

**نێرۆک** nêrûk ۱) گیاێ هه‌رز کْ ئه‌ولْ سیمووکه سه‌ونز که‌ێد ۲) به‌شْ نێری گیا ۳) نێرووک مایووک [ف] ۱) گیاهی هرزه که همراه «سیمووکه» سبز می‌شود ۲) نرینگی گیاه ۳) خنثی، بویژه برای نر

**نێرۆک مایووک** nêrûk maîûk ۱) نێری ومایه‌یی گیا ۲) نێروما [ف] ۱) نرینگی ومادگی گیاه ۲) خنثی، نرّ و ماده

**نێروما** nêr û ma بنووڕه نێرْما [ف] نگا **نێرْما**

**نێرهاڵ** nêrhaĺ چنگه‌شێو کردن [ف] قر و قاطی کردن

**نێره** nêre ۱) زێڕْ مایه ۲) لاناوه له زاتدار «نێره پیا، نێره ژن» [ف] ۱) نرّ، مقابل ماده ۲) کنایه از شجاع

**نیره** nîrê ده‌نگْ پشی [ف] صدای گربه

**نێره‌پیا** nêre piya لاناوه له زاتدار [ف] کنایه از مرد شجاع

**نێره‌خه‌ر** nêre xer ۱) لاناوه له قتْ قه‌ۆ ۲) خه‌ر نێر [ف] ۱) کنایه از لندهور و نفهم ۲) خر نرّ، نرّه‌خر

**نێره‌خه‌ره‌یل** nêrexereyl دیه‌که‌یگه [ف] روستایی است

**نێره‌زا** nêre za بنووڕه نێرزا [ف] نگا **نێرزا**

**نێره‌ژن** nêre jin ژنْ زاتدار [ف] زن غیرتمند

**نێره‌که‌و** nêre kew که‌و نێر [ف] کبک نرّ

**نێره‌مووک** nêremûk ۱) نێروما ۲) لانه‌ماێ جووڕێ قاتره [ف] ۱) خنثی، نرّ وماده ۲) نژادی از قاطر

**نیره‌نیر** nîrê nîr نیره‌ێ پشی [ف] صدای گربه

**نێری** nêrî ساورین، له ئه‌وستا (neŷryu نه‌یْریوو) تۆسریاس [ف] تکه، شاک، در اوستا (neŷryu نَیریوو) نوشته شده

**نێرینه** nêrîne زوورْ ئاخر، کوڕانه زوور کردن [ف] آخرین زور، قدرت نهایی، غایت نهایت

**نێرینه‌ێ خوه‌ێ رانین** nêrîneŷ xweŷ ranîn زوورْ ئاخر کردن و وه په‌رتخ ره‌سین «ئی نه‌خوه‌شیه تا نێرینه‌ێ خوه‌ێ نه‌ڕانێ ده‌س له قه‌وێ نیه‌که‌ێده‌و» [ف] به هدف ومقصود رسیدن

**نیست** nîst نه‌ۆن، فتوور هاتن «نیست و نابوود بی» [ف] نیستی

**نیست ونابووت** nîst û nabût فتوور هاتن [ف] نابود شدن

**نیسک** nîsk ۱) به‌له‌مرک، کوڕنیشک ۲) وه‌ره نیسک، هنهن کردن ۳) نژی «ل» له زاراوه‌یلْ تره‌کْ کوردی «نیسک» ئۆشن ٤) بنْ قوڕێ، حه‌نجه‌ره [ف] ۱) آرنج ۲) هق‌هق کردن هنگام گریه ۳) عدس ٤) ته حلق، حنجره

**نیسکاو** nîskaw ئاشێگ ک وه نیسک درْس بۆیه «ل» [ف] عدسی، غذای عدسی

**نێش** nêş نه‌خشه، ده‌ڵه‌سه «مْ زانم یه نێش کییه» [ف] نقشه، توطئه

**نیش** nîş زێڕْ نووش [ف] نیش، آزار

**نیشان** nîşan ۱) ئاماج ۲) خاڵ ۳) مه‌داڵ، پنت ٤) ناو نیشان ٥) یاد دان ٦) نیشانن ۷) ده‌زۆرانی کردن ۸) نوخس گرتن ۹) تۆر، ره‌د، له فه‌رانسه‌ی (nichan) وه‌ێ ماناسه [ف] ۱) آماج، هدف ۲) خال بر پوست ۳) مدال ٤) نشان، آدرس ٥) آموختن ٦) نشانیدن، نشاندن ۷) نشان کردن برای ازدواج ۸) هدفگیری ۹) رد، اثر، در فرانسوی (nichan) گویند

**نیشاندان** nîşan dan ۱) یاد دان ۲) له دۆره‌و چشتێ نیشان که‌سێگ دان [ف] ۱) آموختن، نشان دادن ۲) از دور چیزی را نشان دادن

**نیشان کردن** nîşan kirdin ۱) ره‌خته‌برانه کردن ۲) چشتێ وه نیشان کردن ئه‌ڕاێ رێ گوم نه‌کردن [ف] ۱) نشان کردن برای ازدواج ۲) علامت گذاری کردن

**نیشان گرتن** nîşan girtin نوخس گرتن [ف] هدف گیری کردن

**نیشان لێ سه‌نن** nîşan lê senin ناو نیشان سه‌نن [ف]

آدرس گرفتن

**نیشانن** nîşanin ١) نیشانن منالْ ئەڕاێ ریان ٢) وە جییگ نیشانن [ف] ١) سردست نشاندن نوزاد جهت رفع حاجت ٢) نشانیدن

**نیشانه** nîşane نوخس [ف] هدف، هدفگیری

**نیشانی** nîşanî ناو نیشان [ف] مشخصات، آدرس

**نیشای** nîşay ناو زۆنەێ مایەشت، بنووڕە مایەشت [ف] نام باستانی مادیدشت، نگا **مایەشت**

**نیشت** nîşt ١) دانیشت ٢) باڵندە نیشتەو ٣) تاێرمە دا ٤) دامردەو ٥) خوەرئاوا بۆن [ف] ١) نشست ٢) پرنده نشست ٣) تەنشین شد ٤) فرو نشست ٥) غروب کرد

**نیشتا** nîşta نیشتەو [ف] دوباره فرو نشست

**نیشتگانی** nîştiganî زێژ سەرپایی [ف] نشسته، سینەخیز

**نیشتم** nîştim دانیشتم [ف] نشستم

**نیشتمان** nîştiman ١) مەڵوەن، وەتەن ٢) ئەنجومەن، جی نیشتن و گەپ دان [ف] ١) میهن ٢) انجمن، محل نشستن برای گفتمان

**نیشتمان پەروەر** nîştiman perwer وەتەن پەرەس [ف] میهن پرست

**نیشتن** nîştin ١) دانیشتن ٢) تاێرمە دان ٣) دامردن ٤) لاناوەلە ریان ٥) ئاوا بۆنْ خوەر [ف] ١) نشستن ٢) رسوب کردن ٣) فرو نشستن ٤) کنایه از ریدن ٥) غروب کردن

**نیشتەئاو** nîşte aw وە ئاو رەسینْ چاڵاو [ف] به آب رسیدن چاه

**نیشتەبان** nîşte ban نیشتە سەرەو [ف] بالا قرار گرفت

**نیشتەبانْ یەک** nîşte bani yek کوو بۆن [ف] جمع شدن، بالای هم قرار گرفتن

**نیشتەپا** nîşte pa لاناوە لە گیاندار، هەر چشتێ کْ پا بێاشتوو [ف] کنایه از جاندار، هرچیزی که پا داشته باشد

**نیشتەپاوا** nîşte pawa نیشتە قنگەو [ف] از حالت نشسته یا درازکش به حالت ایستاده ایستادن

**نیشتەجی** nîşte cî جیگیر بۆ [ف] جای گیر شدن، مقیم

**نیشتەخوار** nîşte xwar نیشتەلا خوارەو [ف] در پایین نشست

**نیشتەر** nîşter نیشدەر [ف] نشتر

**نیشتەدڵ** nîşte diĺ ١) خواردەمەنی وە دڵ بۆن ٢) لە ناخ دڵ جیگیر بۆن [ف] ١) باب میل بودن خوراکی ٢) به دل نشستن

**نیشتەژان** nîşte jan هاتە ژان [ف] بدرد آمد

**نیشتەسەر** nîşte ser نیشتە بان [ف] بالا قرار گرفت

**نیشتەسەر یەک** nîşte seri yek نیشتە بانْ یەک [ف] بر روی هم قرار گرفت، جمع شد

**نیشتە قنگەو** nîşte qinĝew بنووڕە نیشتەپاوا [ف] نگا **نیشتەپاوا**

**نیشتەکار** nîşte kar وە کار کەفت، کەفتە کار [ف] بکار افتاد

**نیشتە گەرد** nîşte gerd هاومنووس بۆ [ف] هم نیشن شد

**نیشتەمل** nîşte mil کەفتە مل [ف] بر عهده... افتاد

**نیشتەو** nîştew نیشتا [ف] دوباره نشست

**نیشتی** nîştî تْ نیشتی [ف] نشستی

**نیشدار** nîş dar ١) قسەێ ژار دار ٢) ژار دار [ف] ١) سخن زهردار ٢) حیوان زهر دار

**نیفەک** nîfek پزگەێ پاپووش، لە سەکزی «نیفوو» ئۆشن [ف] تنبان، نیفه، در سکزی «نیفوو» گویند

**نیقن** nîqin نیقوو [ف] کوتاه وبی نمود

**نیقوو** nîqû نیقەڵ [ف] کوتاه وبی نمود

**نیقەڵ** nîqeĺ نیقوو [ف] کوتاه قد وبی نمود

**نیقەڵتووز** nîqeĺtûz ١) پڕاوپڕ، زوورم ئەڕاێ ئاو ٢) دمەڵێگ کْ دۆیاێ رەسین وە دەرزی بەنە تێ [ف] ١) لبریز، برای مایعات ٢) دملی که پس از رسیدن با سوزن سر آنرا باز کنند تا چرک خارج شود

**نێک** nêk دۆمدۆک [ف] دسته چوبین دوک نخ ریسی دستی

**نیک** nîk کار خودا پەسەن [ف] نیک، نیکو

**نیکانیک** nîkanîk کارامە لە کارْ ئتر، لاتینیە «مکانیک» [ف] استاد مکانیک

**نیل** nîl لێڵ [ف] کدر

**نیلاو** nîlaw لێڵاو [ف] آب کدر

**نیلگاو** nîligaw نیلاو [ف] آب کدر

**نیلووپەڕ** nîlûper لۆلپەڕ [ف] نیلوفر

**نیله** nîle کەهەر [ف] اسب کهر مایل به سیاه

**نیم** nîm ١) نسم ٢) نییم [ف] ١) نیم، نصف ٢) من نیستم، نیستم

**نیم برش** nîm birş نیمەبرش ف نیم پختە، نیم برشتە

**نیمپوخت** nîm puxt نیمەکوڵن ف نیم پختە

**نیمپەز** nîm pez نیم پوخت ف نیم پخت، نیم پز

**نیمتلا** nîm tiĺa ناوێگە ژنانە ف نامی زنانە

**نیمتەنە** nîm tene مراخانی ف نیم تنە

**نیمچە** nîm çe بۆچگ، ناتەمام ف نیمچە، کوچک، ناتمام

**نیمڕووژ** nîm r̂ûj نسمْ رووژ ف نیم روز، نصف روز

**نیم ڕیەن** nîm r̂yen یەک لە چووارْ رییەن ف یک چهارم گلە، واحدی برای شمارش گلە

**نیمسووز** nîm sûz نیمە سووز ف نیمسوز شدن

**نیم گەز** nîm gez نسمْ گەز «گەز دۆر و نیم گەز نزیک» ف نیم زرع

**نیملا** nîm la نیم لەت ف یک چهارم

**نیم لەت** nîm let نیم لا ف یک چهارم

**نیمن** nîmin ئیمە نییم ف نیستیم

**نیم نگا** nîm niga باڵ چەو دان ف نیم نگاه

**نیمە** nîme ١) نسمە ٢) ناوێگە ژنانە ٣) کوتێ لە ئاجوڕ ٣) نییم «نیمە ماڵ» ف ١) نامی زنانە ٢) نصف آجر ٣) نیستم در...

**نیمە تەمام** nîme temam نیمەچڵنگ ف نیمە تمام

**نیمەچڵنگ** nîmeçiĺîng ١) نیمەتەمام ٢) نیمەکوڵن ف ١) نیمە تمام، نیمەکارە ٢) غذای نیم پز

**نیمەڕدۆیا** nîmer̂î düya دۆیاێ نیمەڕوو، نیم ئەر دویا ف بعد از ظهر

**نیمەڕوو** nîmer̂wû شەقْ رووژ ف ظهر

**نیمەڕوو دۆیا** nîmer̂û düya نیمەڕدۆیا ف بعد از ظهر

**نیمەڕووژە** nîmer̂ûje پالەرە ف عصرانە

**نیمەڕووسا** nîmer̂û sa شەکەتی دەر کردن لە نیمەڕوو ف رفع خستگی در نیمروز

**نیمەڕووسا کردن** nîmer̂û sakirdin نیمەڕووسا ف کنایە از رفع خستگی در نیمروز

**نیمەڕێ** nîme r̂ê رەفیقْ نیمەچڵنگ ف رفیق نیمە راه

**نیمەزووان** nîme zuwan پتْ لاڵ ف الکن

**نیمەشەو** nîme şew نسمْ شەو ف نصف شب، نیمە شب

**نیمەکار** nîme kar دیەکەێگەلە جووانرۆ ف روستایی در جوانرود

**نیمەکارە** nîme kare نیمەچڵنگ ف نیمە کارە

**نیمەکوڵ** nîme kwiĺ نیمەچڵنگ، نیمەکوڵن ف نیم پز

**نیمەکوڵن** nîme kwiĺîn نیمەچڵنگ، نیمەکوڵ ف نیم پز

**نیمەکوڵ ونیمەچڵ** nîme kwiĺ û nîme çiĺ نیمەکوڵن ف نیمەپختە، نیمی پختە ونیمی خام

**نیمەگیان** nîme gyan نیمە عەمر ف نیمە جان

**نیمەگیان کردن** nîme gyan kirdin نسمە عەمر کردن ف نیمەجان کردن

**نیمەنمەک** nîme nimek پەپگێ کێ لە ئارد و خوا و رۆن درس کەن ونەنەێ بانْ کوترگیان ف مخلوط آرد ونمک و روغن کە مانند کلوچە آنرا درست می‌کنند و روی کوفتگی می‌گذارند

**نیمەوناتەمام** nîme û natemam نیمەچڵنگ، نسمە و ناتەمام ف نیمەکارە، نصفەکارە رها کردن

**نین** nîn نیین ف نیستند

**نێو** nêw ناو، ناوڕاس ف میانە

**نێوان** nêwan ناوەێن ف مابین

**نێوڵ** nêwiĺ نێوە، نێوەڵ ف تکیەگاە، گرانیگاە

**نێوُنگر** nêûngir بنووڕە نێانگر «ل» ف نگا **نێانگر**

**نێوە** nêwe ١) نێوەڵ، سێوە ٢) نیمە ف ١) تکیە گاە، ستون ٢) نیمە

**نێوەشەو** nêwe şew نیمەشەو ف نیمەشب

**نێوەڵ** nêweĺ نێوە، ستون ف تکیەگاە، گرانیگاە

**نیە** nye نییە ف نیست

**نیەپووڕێ** nyepûr̂ê رێژْ پووڕێ ف ممکن نیست، امکان ندارد

**نیەت** nyet ئلا وبیم ف نیت، تصمیم

**نیەت کردن** nyet kirdin ئالوبیم کردن ف نیت کردن، تصمیم گرفتن

**نیەت هاوردن** nyet hawrdin ئالوبیم کردن ئەڕاێ کارێگ ف نیت کردن برای کاری

**نیەرینجْگ** nyeryncig لەچ، لەنچ ف لچ، لجبازی

**نیەرینجْگە** nyeryncige جەروو ف لجباز

**نیەزام** nyezam نیەزانم ف نمی‌دانم

**نیەزانم** nyezanim نیەزام ف نمی‌دانم

**نیەڵەنامەی** nyeĺe namey بنووڕەر ناڵە ونامەی ف نگا **ناڵەونامەی**

# و

**ۆ** ü پیتْ ئەلفبا ک زوورم لە ناو کوردەیلْ باشوورْ رووژ هەڵات ئۆشریەیْد جاروەخت نیشانەیٚ کردارْ ویەردەیٚ فرە دۆرە «بردۆ، خواردۆ» ئی پیْتە خوەیٚ جار وەخت فۆنوتیکە وهنایٚ هاوشان «ی» نیشیدن دەنگْ «وی»دیْریْد وجیاواز نیەنۆسریەیْد وەک کۆیە، شۆیەم، ... ئەوستا ناسەیل ئۆشن بنیان پیْتەیلْ ئەوستا هەیشت فۆنیمە (ذ - ڭ - ۊ - ڤ - پ- چ - ژ - ش) فۆنیمْ «ذ»ک هیْمان لە هەورامان ئۆشریەیْد و دەنگیْگە لە مابەیْنْ (د) و (گ) وەک «ئەذا » وە مانایٚ داڵگ و «ڭ» یا (ک) سەنگین ک دەنگیْگە لە مابەیْن (خ) و (ڭ) هیْمان لە کرمانجی ژووروو ئۆشریەیْد و «ۊ» دەنگیْگە لە مابەیْنْ (و) و (ی) ک لە باشوورْ رووژهەڵات ئۆشریەیْد و ئەو دۆیای ئی فۆنیمەیلە وە گشتی لە ناو کورد و فارس و تورک ئۆشریەیْد هۆکارْ پاراستنْ ئی فۆنیمەیلە لە ناو فارس و تورک یەسە ک ئەوان دەسەڵات ئابۆری و عەسکەری دیْرن و ئەو دۆیای هنْ ئیمەس و بایْسەس ک بپیەریْزنیمیْان ف از حروف الفبای کردی که در جنوب شرقی کردستان تلفظ می‌شود و نشانه‌ی ماضـی بعید است باید متذکر شد که این حرف گاهی خود آوا یا فونوتیک است و تنها با قرار گرفتن در کنار «ی» کامل می‌شود مانند «کۆیه» یا «شۆیەم» که گاه به غلط «کۆە» یا«شۆەم» می‌نویسند هیچگاه دو آوا حرف را تشکیل نمی‌دهند زیرا (ۆ) و (ه) در نگارش کردی هر دو آوا هستند یعنی در کنار هم هیچ حرف بخـصوصـی را تداعی نمی‌کند. اوستا شناسان اولیه اساس فونیمهای اوستا را هشت حرف می‌دانند که عبارتند از «ذ - ڭ - ۊ - ڤ - پ- چ - ژ - ش» که به ترتیب در گویشهای کردی ماندگار شده‌اند فونیم «ذ» که تلفظـی مابین (د) و (گ) است هنوز در اورامان گفته می‌شود و «ڭ » تلفظـی مابین (خ) و (ک) است در کردی کرمانجی و «ۊ» که تلفظـی مابین (و) و (ی) است در جنوب شرقی کردستان گفته می‌شود که علیرغم آنکه تلفظ می‌شود و نشان ویژه دارد اما متاسفانه در نوشتار کردی رعایت نمی‌شود

**وُ** û ١) کیشْ عەتف «زۆ چیم و هاتمەو» ٢) کیشْ پەیوەندی «دار و دەوەن» ٣) کیشْ سەرسۆڕمان «من و ئی کارەیلە!» ٤) لەیٚ نوو «بردمەو، دامەو» ٥) کیشْ هاوڕیٚ بۆن «من و تۆ » ف ١) واو عـطف ٢) حرف اتـصال ٣) حرف تعجب ٤) دوباره، باز هم ٥) حرف همراهی

**وا** wa ١) پەنەمیان ٢) ئیجووره «لیْوا مەکە» ٣) باد، وا، لە ئەوستا (wate واتە) و(va ڤا) و (vat ڤات) و لە پەهڵەوی (wat وات) و (way وای) و لە سا نسکریت (vat ڤات) نۆسریاس ٤) داکردن، چەکانن «واکە، واکرد»٥) ئاشْئاوەکی «شووروا» ٦) پاشگرْ فرمانکاری «نانەوا» ٧) نیشانەیٚ یەکڵە «بارەوا، بامەوا» ٨) گیرسانن ٩) فیس، غروور ١٠) رسین، وا دان ١١) واز ف ١) باد کردن ٢) اینگونه، این‌طور ٣) باد وزیدنی، در اوستا (wate واته) و (va وا) و (vat وات) و در پهلوی (wat وات) و(way وای) و در سانسکریت (vat وات) نوشته شده ٤) بازکردن، گشودن ٥) آش آبکی ٦) پسوند فاعلی ٧) نشانه‌ی مفرد در فعل ٨) روشن کردن ٩) غرور ١٠) تابیدن نخ ١١) باز

**وابردیٚ** wa birdê ١) فرە سووک، بابردەڵە ٢) لاناوە لە لەڕ ف ١) بسیار سبک آنچانکه باد آنرا جابجا کند ٢) کنایه از بسیار لاغر

**وابزان** wa bizan حەمڵ کە، فەرز کە ف بپندار، فرض کن که

وابکه wa bike ۱) بگیرسن ۲) واکه ف ۱) آتش روشن کن ۲) باز کن

وابۆن wa bün ۱) گیرسیان ۲) واز بۆن ف ۱) روشن شدن ۲) باز شدن

وابه wa be واز بوو ف باز شو

وابەر waber نەوەردێگ کْ گونْگ وە پیَ پیەنەو کەن ف نوردی که با آن چونه خمیر را پهن کنند

واپڕ we pir̂ ئەو کەسە کْ لە زوورْ دەوینْ فرە پەنەمێد ف آنکه در اثر دویدن بیش از حد بشدت نفس نفس می‌زند و شکمش ورم می‌کند

واپرس wapirs حاڵ وخەوەر دان، لە سەکزی وەو کەسە کْ چووده پرسەو دۆیایَ هاتنەوە لە پرسە خەوەر دەێد ئۆشن ف پرسیدن و خبر دادن، در سکزی «واپرس» به کسی که به پـُرسه رفته و پس از بازگشت شرح پـُرسه را بازگو می‌کند گویند

واپڕە wa pir̂ê واپڕ کردن ف تند تند نفس زدن و تنگ نفس شدن

واپەڕێ waper̂ê بیَ ئراده ف بی اراده

وات wat وەت ف گفت

واتا wata ۱) واتووره ۲) مەسڵەت، پەندْ پێشنان ف ۱) شایعه ۲) ضرب‌المثل

واتش watiş وات، لە ئەوستا (vaxş ڤاخش) وە مانایَ وتاره و لە گیلەکی (vatiş ڤاتش) ئۆشن ف گفت، در اوستا (vaxş واخش) به معنای گفتار است و در گیلکی (vatiş واتش) به معنای گفتن است

واتووره watûre چکڕاو، شافه ف شایعه

وات و وڕە wat û wir̂e واتووره ف شایعه

واته wate بنووڕه واتا ف نگا **واتا**

واتەشەک wateşek شێرپەنجە ف بیماری سرطان

واتەوات wate wat واتووره ف شایعه کردن

واته وبسات wate û bisat لوومەیَ بسات، ئەرنەیَ خەڵک ف ضرب‌المثل خاص و عام شدن، رسوای زمانه شدن

واتەیَ بسات wateŷ bisat بنووڕه واته وبسات ف نگا **واته وبسات**

واتەویره wate wîre پەژاره ف پریشانی، فکر و خیال

واتی watî وەتی ف گفتی

واج wac گیژ، سات و وڕ ف گیج، منگ

واجب wacib واجوو، ئەرەوییه ف واجب

واجبی wacibî مۆبڕ، مخوڕ ف داروی نظافتی

واجز waciz تەرەکْ فره بۆچگ کْ وا لیَ بائێده ناو ف تـَرَک بسیار ریز، منفذ

واجوو wacû واجب، ئەرەوییه ف واجب

واجوُ واپرس wacû wapirs پرس وجوو کردن، پەتەکەنە کردن ف ضرورت برای پرسیدن، پژوهیدن

واچ waç وەتن «بواچ» لە ئەوستا و سانسکریت (waç واچ) ئۆسریاس ف گفتن، سخن گفتن، در اوستا و سانسکریت (waç واچ) نوشته شده

واچه waçe واته، لە ئەوستا وسانسکریت (waç واچ) ئۆسریاس ف گفتن، در اوستا وسانسکریت (waç واچ) نوشته‌شده

واچین waçîn پەیمانه کردنْ شیرْ شیرەوارە ف پیمانه کردن شیری که برای «شیره‌واره» می‌آورند

واخەفانن wa xefanin فیسْ کەسیَ خەفانن ف غرور کسی را خوابانیدن

وادا wa da بەنەگە هەڵکرد ف نخ را تابانید

وادار wadar ۱) فیسوو ۲) هان دان ف ۱) مغرور ۲) تحریک

وادار بۆن wadar bün فیس گرتن ف مغرور شدن

وادار کردن wadar kirdin هاندان ف وادار کردن، تحریک کردن

واداری wadarî فیس‌داشتن، بەرچەک بەرچەک کردن ف غرور داشتن، ادعا داشتن

وادن wadan ۱) وادار کردن ۲) هەڵکردنْ بەن ۳) هەڵە خەرجی کردن ف ۱) تحریک کردن ۲) تابانیدن نخ ۳) به باد دادن

واده wade ۱) وایە، پەیمان، ئەرەوییه ۲) قەرار نایین ۳) دەسوور وە وا داین ف ۱) وعده ۲) میعاد ۳) امر به تابانیدن نخ

واده دان wade dan وایە دان ف وعده دادن

واده سەنن wade senin واده گرتن ف وعده گرفتن از کسی

وادەکرد wade kird ۱) وایەکرد ۲) پەیمان کردن ف ۱) سرقرار ماندن، در وقت مقرر پرداخت کردن یا ادا کردن ۲) پیمان

**وادەگرتن** wade girtin وادە سەنن ف وعده گرفتن

**وادەمن** wademin واشەمەک، باشەمەک ف دمه، بادبزن

**وادەمە** wademe لاسامە ف برف و باران و باد که با هم می‌وزد، کولاک

**وادەنان** wade nan قەرا نان ف وعده گذاشتن

**وادەێ سەرخەرمان** wadeŷ seri xerman لاناوە لە وادەێ بێخودی ف وعده سر خرمن

**واڕ** war̂ ساتْ وڕ، وڕ ف گیج ومنگ

**وار** war ١) جی لوور «وارگە» ٢) هەیتاهەیت «دووارە » ٣) پاشگرْ داشتن ٤) پاشگرْ شایسەیی «سزاوار» ٥) بنچینەێ کردارْ وارین ٦) خوار، هوار، لە لاتین (ward) ئۆشن ف ١) جای، محل ٢) بار، دفعه ٣) پسوند دارابودن ٤) شایسته ٥) ریشه فعل باریدن ٦) پایین، در لاتین (ward) گویند

**واران** waran ١) ئاوێگ کْ لە ئاسمان تێدە خوار، لە ئەوستا (var ڤار) و (varişte ڤارشتە) و لە زووانْ پەهلەوی (verente ڤەرەنتە) و (vare ڤارە) و (varent ڤارەنت) ئۆسریاس ٢) پاشگرْ وارین «گولە واران» ف ١) باران، در اوستا (var وار) و (varişte وارشته) و در پهلوی ( verente وَرَنته) و (vare واره) و (varent وارَنت) نوشته شده ٢) پسوند به معنی ریزش، باریدن

**واراناو** waranaw ئاو واران ف آب ناشی از باریدن باران

**واران بڕان** waran bir̂an وارووبڕان، بەختەواران ف موسم پایان بارانهای بهاری

**وارانن** waranin وارین ف باریدن

**وارْد** warid کارامە ف وارد، کارآمد

**واردن** wardin هواردن، خواردن «ل» ف خوردن

**وارشت** warişt وارین، لە ئەوستا (varişte ڤارشتە) ئۆسریاس، لە گیلەکی (variş ڤارْش) ئۆشن ف باریدن، در اوستا (varişte وارشته) نوشته شده و در گیلکی (variş وارش) گویند

**وارْفتە** war̂ifte وادەمە، لاسامە ف نگا **وادەمە**

**وارْگ** war̂ig مامرێگ کْ هاتۆدە خا کردن، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «وارۆک، بارۆکە، وارۆ» ئۆشن ف جوجه بهاره که تخمگذار شده، در دیگر گویشهای کردی «وارۆک، بارۆکه، وارۆ » گویند

**وارْگ سەر** war̂ig ser سەرباریک ف کسیکه کله‌اش مانند کله مرغ است

**وارگە** war̂ige ١) هەوارگە، هەوارێا ٢) دیەکەێگە لە گیەلان ف ١) ییلاق ٢) روستایی در گیلانغرب

**وارگەوپاش** war̂ige û paş پەخش‌وپلا، تەفراو تۆناو ف پراکنده و پخش وپلا شدن

**وارۆش** warüş داپلۆوسکیان، دازلگیانْ خواردەمەنی ف بیش از حد معمول پخته شدن غذا و وا رفتن غذا

**وارو** warû ١) مەوارو ٢) پشتەک وارو ف ١) باران می‌بارد ٢) وارو زدن

**وارو بڕان** warû bir̂an واران بڕان «ل» ف موسم پایان بارانهای بهاری

**وارووک** warûk وارگ، مامرْ سەرە، بنووڕە وارگ «ل» ف نگا **وارگ**

**وارە** ware ١) جار، سەفەر «دووارە» ٢) پاشگرە وە ماناێ هامێاری «شیرەوارە» ٣) وانگ هلاوردن «وارە دا لە وەر» ف ١) بار، دفعه ٢) پسوند همکاری داشتن ٣) تغییر حالت روحی ناشی از شنیدن خبر ناگوار

**وارە** war̂e ١) واڕێ، وانگ ٢) هانا، هاخاس ف ١) تغییر حالت روحی ناشی از شنیدن خبر بد وناگوار و با صدای بلند گریستن و فریاد کردن ٢) داد، داد خود ستاندن

**وارەبەشانە** war̂ebeşane بەخشینْ بەشێگ لە دەسا وەێ مەشکە وە هاوارەێگ ک مەشکە لە کاتێگ کەفێدە دەسێ ک گژگیا کەمەو بۆیە ف بخشیدن مقداری از محصول مشک به « هاواره» در موقعی که نوبت مشک اوست وگیاه وسبزه کم است و گله شیرش کم است

**وارەسە** warese سەرساو کردن ف آگاه کردن، خبر دادن

**وارەسی** waresî ئیسفا گرتن ویتەکەنە کردن، لە ئەوستا ( varethmen ڤارەسمەن) وە ماناێ پەناگا ونگادار ئۆسریاس ف بازبینی، بازدید و نگهداری، در اوستا (varethmen وارَثمَن) به معنای پناهگاه و نگهدارنده نوشته شده

**وارەوار** ware war شەکەت رێ کردن ف خسته خسته راه رفتن

**وارەو بۆن** war̂ew bün هانا بردن، داد بردن ف داد خود به جایی بردن

**واری** warî واران واریە ف بارید

**واڕێ** war̂ê وارە لە وەر دان ف نگا **وارە**

**وارێ** warê مەوارێ، وارێد ف میبارد

**واریان** waryan تنیان وە ملْ کەسێگەو، لە لاتین (warn) و (warning) ئۆشن ف بە تندی بر خورد کردن، سرزنش کردن، در لاتین (warn) و (warning) بە معنی اخطار دادن و هشدار است

**واریانە پێا** waryane pêa تنیانە پێا ف بە تندی برخورد کرد

**وارێد** warêd وارێ ف میبارد

**وارێگ** warêg وارێد ف میبارد

**وارڕێ لەوەر دان** war̂ê le wer dan وانگ هڵاوردن، هاوار کردن ف با صدای بلند گریستن وفریاد کردن

**وارین** warîn وارشت، لە پەهڵەوی (warîten واریتەن) ئۆسریاس ف باریدن، بارش، در پهلوی (warîten واریتَن) نوشتە شدە

**واز** waz ١) واز و وڵنگ، زێڕْ بەسیا ٢) کووتا هاتن «دی واز بار» ٣) بێجگە «لە فڵانی واز بارێد کەسێ نیەتیەێدە لام» ٤) گەڵواز ٥) خواز، داواکەر «جیا واز» ٦) گڤْ گاڵ، وا گرتن « فڵانی واز گرتۆدەێ» ٧) کاوڵ «لانەواز» ٨) جێواز کردن « وازانن» ٩) دپیەک کردن «واز گفتێ کە» ف ١) باز، مقابل بستە ٢) کوتاه آمدن در گفتار و کردار ٣) بجز، بە غیر از ٤) پرش ٥) خواهان ٦) باد بە غبغب انداختن ٧) ویران، خراب ٨) جابجا کردن ٩) دوبارە بازگو کردن

**وازانن** wazanin جێواز کردن ف جابجا کردن

**واز بردن** waz birdin گەڵواز گرتن ف پریدن

**وازبۆن** waz bün ١) سا کردنْ ئاسمان ٢) لە یەک چەکیان ٣) واز بوون ٤) گریە لە کار واز کردن ف ١) آفتابی شدن آسمان ٢) ازهم گسستن ٣) باز شدن ٤) گره از کار گشودن

**وازراو** waziraw ئاشکرا، (واضح) ئەرەوییە ف آشکار، واضح

**واز کردن** waz kirdin واکردن ف باز کردن

**وازکەر** waz ker کەسێگ کێ بەسریاێ واز کەێد ف باز کنندە، گشایندە

**واز گرتن** waz girtin واگرتن و قسەێ قەۆ قەۆ کردن ف باد بە غبغب انداختن، بلف زدن

**وازگفت** waz gift وازگوو ف بازگو کردن

**وازگوو** waz gû وازگفت ف بازگو کردن

**وازْ ولا** wazi wil̂a واز و وڵنگ ف کاملاً باز

**وازْلین** wazilîn جووری داکْ دەوایە لە نەفت گرنەێ ف وازلین

**واز لێ هاوردن** waz lê hawrdin ١) ماوە وە پێ دان ٢) کار وە کارێ نێاشتن ف ١) مهلت دادن ٢) دست برداشتن از ...، ول کردن

**وازْوڵنگ** wazi wil̂ng وازْ ولا ف کاملاً باز، چهار تاق باز

**وازْوەرەن** wazi weren لە پەژارە وخەمْ دنیاێ خود ساختە بۆن، تۆشْ تەوەهۆم هاتن «واز = وەتن+ وەرەن = وڕینە کردن» ف رویا، اوهام، توهم، دنیای خود ساختە «واز = گفتن+ وەرەن = وڕینە»

**واز هاوردن** waz hawrdin واز لێهاوردن ف کوتاه آمدن، دست برداشتن از...

**وازەن** wazen وەزەن، ئاسووێ خووفناک ف بلندی مخوف و ترسناک، پرتگاه

**وازی** wazî گەمە، بازی ف بازی

**واژ** waj گێژ و واژ ف گیج، منگ

**واژوو** wajû لەوەڕ کردن «شەواژوو» ف چریدن

**واژە** waje ١) دواژە، واژەوە ٢) بۆش، بواچ، بویژ، واچە، واژە ٣) لەێ نوو ف ١) میشی کە پس از جفتگیری دوبارە جفتخواه باشد ٢) بگو، امر بە گفتن ٣) دوبارە، از نو

**واژەو کردن** wajewe kirdin دواژە کردن، لەێ نوو کار کردن ف دوبارە کاری کردن

**واژەوە** wajewe دواژە، بنووڕە واژە ف نگا **واژە**

**واژەوەن** wajewen بنووڕە واژە ف نگا **واژە**

**واس** was ١) پاشگرە وە مانای خوازین «تووواسام» ٢) خواس ٣) زاف، خاێس ٤) مەنگ، گێژ ف ١) پسوند بە معنای خواهان ٢) گدایی، قرض ٣) ضـعف عمومی بدن ٤) گیج، منگ

**واستن** wastin خواستن، تووواسن «ل» ف خواستن

**واس کردن** was kirdin زاف کردنْ ئاژەڵ یا ئنسان ف ضـعف عمومی انسان یا دام از شدت گرسنگی

**واسکوو** waskû ١) کووس کەفتن، تەختە شکیان ٢) کەسایەتی ئڕاێ ژن «واس، وەس، وس = وەک، وەکوو+ کوو = کووە، کۆیە» ف ١) بدنام شدن، از شخصیت افتادن ٢) شخصیت برای زنان «واس، وەس، وس = مثل و مانند+ کوو = کوە»

**واسواس** waswas دڵنیایی نیاشتن، وەرواس فـ وسواس

**واسواسه** waswase وەرواسه فـ وسوسه به خرج دادن

**واسْ وڕ** wasi wir̂ گێژ و وڕ فـ گیج، منگ

**واسەر** waser ١) سەران سییه ٢) واێگ کْ هەور وارانْ ئەوڵ خوەێەو تیەرێد فـ ١) بیماری میگرن ٢) بادی که ابر باران زا را با خود می‌آورد

**واسەو بردێ** wasew birdê ساتْ وڕ فـ گیج ومنگ

**واش** waş ١) خاس «واشەو بۆ» ٢) ئاماڵ «سپی واش» فـ ١) سالم و سرحال ٢) فام، گون

**واشْنه** waşine وا شەنه فـ نسیم

**واشه** waşe ١) باشه ٢) وەک، واش «سفێد واشه» فـ ١) پرنده شکاری، قوش ٢) گون، فام

**واشەچەو** waşeçew چەوقەشەنگ فـ آنکه چشمان زیبا دارد

**واشەر** waşer واشر، لاتینیه فـ واشر، لاتینی است

**واشەمەک** waşemek وادەمنْ دەسی فـ باد بزن دستی

**واشەنگ** waşenĝ وەشەنگ، وەرشەنگ، له ئەوستا (veışenĝh ڤەئشەنگهـ) وه ماناێ ئافەت وخەمباریه، له گیلەکی (ڤەرشندی) ئۆشن فـ باران تند و مخرب، در اوستا (veışenĝh وَئشَنگهـ) بمعنای آفت وغمزدگی است، در گیلکی (وَرشندی) گویند

**واشەنه** waşene واشْنه فـ نسیم

**واشەو بۆن** waşew bün خاسەو بۆن فـ خوب شدن، سالم شدن

**وافووڕ** wafûr̂ ئامرازْ تلیاق کیشان فـ وافور

**وافووڕی** wafûr̂î تلیاقی فـ وافوری

**واق** waq ١) یەێهووش ٢) ماق ٣) دەنگْ سەگ فـ ١) هوش و حواس ٢) مبهوت ٣) پارس سگ

**واقانن** waqanin وەق وەق کردن سەگ فـ پارس سگ

**واقپەڕین** waq per̂în یەێهووش پەڕین له ترس یا سەرسڕ مەنین فـ هوش وحواس نماندن از ترس یا شگفتی

**واقچین** waq çîn واق پەڕین فـ نگا **واقپەڕین**

**واقمەنن** waq menin ماق مەنن فـ شگفت زده شدن

**واقنووڕسن** waq nûr̂isin ماق نووڕسن فـ خیره نگریستن

**واق واق** waq waq دەنگْ سەگ فـ صدای سگ

**واقه** waqe مەلْ دەریایی فـ مرغ دریایی

**واقه واق** waqe waq واقانن فـ صدای پارس سگ

**واکردن** wa kirdin ١) پەنەمیانْ مانگا و پەس له زوورْ خواردن شەودەر و ...، له ئەوستا (vem ڤەم) وه ماناێ هژهڵاوردنه ٢) واز کردن ٣) گیرسانن فـ ١) باد کردن سیرابی گاو و گوسفند در اثر زیاده روی در خوردن، در اوستا (vem وَم) به معنی بالا آوردن خوراکی است ٢) باز کردن ٣) روشن کردن آتش

**واکف** wakif هەوگل کردن فـ عود کردن بیماری، بهبودی از بیماری و سپس مبتلا شدن به همان بیماری

**واکفت** wakift بنووڕه واکف فـ نگا **واکف**

**واکفت کردن** wakift kirdin بنووڕه واکف فـ نگا **واکف**

**واکف کردن** wakif kirdin هەوگل کردن فـ نگا **واکف**

**واکه** wake ١) بگیرسن ٢) واز بکه فـ ١) روشن کن ٢) باز کن

**واگژه** wagije واگێژه فـ گردباد

**واگفت** wagift وازگفت، وازگوو فـ بازگو کردن

**واگل** wagil هەوگل فـ بازگشت، عود کردن بیماری

**واگوو** wagû واز گفت فـ بازگو کردن

**واگووزار** wa gûzar تەسەق «واگووزارێ وه خودا» فـ واگذار، در مقام نفرین

**واگوو کردن** wagû kirdin وازگفت کردن فـ بازگو کردن

**واگیر** wagîr داوڕانن فـ تصرف کردن

**واگێژان** wagîjan واگێژه فـ گردباد

**واگێژه** wagîje واگژه فـ گردباد

**واڵ** wal̂ ١) وڵا ٢) پارچەێ نازگ نیلی رەنگ ئەڕاێ پاڵووین، له سەکزی «واڵ» ئۆشن فـ ١) گشاد، باز ٢) پارچه نازک صورتی رنگ که به عنوان صافی بکار برده می‌شود، در سکزی نیز گفته می‌شود

**واڵ وژ** wal̂î wij واڵ، وڵا فـ گشاد، عریض

**واڵه** wal̂e ١) پاشگرێگه وه ماناێ هارخپارخ «ورده واڵه» ٢) خوەیشک «گ» فـ ١) اسباب و اثاثیه ٢) خواهر

**والی** walî خان، گەورا فـ والی، خان

**والی بەڕ** walî ber̂ شاێ وڵات، ئەڕاێ ژن «چه بکەم له دەسْ ئی والی بەڕه- شەوان پەێ دۆریی دیدەگەم تەڕه» فـ شاه سرزمین، تشخص برای زنان

**والی زاێه** walî zaŷe ١) خانزاێه ٢) لاناوه له رەنگین فـ

١) والی زاده ٢) کنایه از دختر زیباروی

**واليه** walye ناوێگە ژنانە «واڵە» وە ماناێ خوەیشکە ف نامی زنانه

**وام** wam ١) هەێوام ٢) قەرت ف ١) فرار می‌کنم ٢) وام

**وامەنە** wamene ١) دۆیاڕنگ ٢) دەرمەنە ف ١) تە ماندە، باقیماندە ٢) وامانده

**وان** wan ١) هەێوان ٢) باڵندەێگە ٣) پاشگرْ چاوە دێری ٤) پاشگرْ کارامەیی لە کار «شەنەوان، دەیشتە وان» ف ١) فرار می‌کنند ٢) پرنده‌ای است ٣) پسوند نگهداری ٤) پسوند کار آمدی

**وانگ** wanĝ وارە، لە ئەوستا (evenĝ ئەڤەنگ) تۆسریاس ف شیون کردن با صدای بلند، در اوستا (evenĝ اَوَنگ) نوشته شده

**وانگ لەوەر دان** wanĝ le wer dan وارێ لە وەر دان ف بانگ برآوردن وگریستن

**وانگ هلاوردن** wanĝ hiʃawrdin وانگ لە وەر دان، لە ئەوستا (evenĝanemim ئەڤەنگ ئانەمم) تۆسریاس ف بانگ بر آوردن و گریستن، در اوستا (evenĝanemim اَوَنگ آنَمم) یعنی شیون با صدای بلند نوشته شده

**وانە** wane ١) پاشگرە «دەسەوانە، لۆتەوانە» ٢) بانە ٣) ئەوەڵ هاڕخ پاڕخْ کووچبار کْ دامەزرنن ف ١) پسوند ابزاری ٢) قسمتی از چراگاه که به گله داده می‌شود ٣) اولین اسباب واثاثیه که درهنگام کوچ در جایی که مستقر می‌شوند می‌گذارند

**واوا** wawa ١) نەخوەشی وەبا ٢) باوگە ف ١) وبا، بیماری وبا ٢) بابا

**واوریز** wawirêz زوورْم، تەنانەت ف بویژە، نگا **تاتەنانەت**

**واوڵ** wawiʃ ١) واوڵە ٢) لێوە ٣) ساورینێگ کْ بوو تەگەێ تیەێد ٤) کووری، لێلاوی ف ١) آماسیدن اندام ٢) دیوانه سر ٣) بُز تگه که بوی نامطبوع دارد ٤) کوری، نابینایی

**واوڵە** wawiʃe ١) واوڵ ٢) کووری، لێلاوی ف ١) ورم، آماسیدن اندام ٢) کوری، نابینایی

**واوەڕوو** wawe r̂û واوەڕووە ف باد وباران، بوران

**واوەڕووە** wawer̂uwe واوەڕوو ف بوران و باران

**واوەسە** wawese پاێەداری کردن، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی بەرخوەدان ئۆشن ف استقامت، استواری، در دیگر گویشهای کردی «بەرخوەدان» گویند

**واوە وریز** wawe wirêz واوریز ف نگا **تاتەنانەت**

**واهوُ** wahû ١) وە تەڵەو کارێگ چین ٢) حەواڵ گرتن ف ١) به دنبال کاری رفتن ٢) سراغ گرفتن

**واهۆفتە** wahofte واڕفتە ف بوران، باد وباران

**واهێلان** wahêʃan هەواێ تەپ وتووزین ف هوای غبارآلود

**وای** way ١) هەێوای ٢) ناڵە ف فرار کرد ٢) وای

**وائ** waê هەێوائێد ف فرار می‌کند

**وائانن** waêanin فراری دان ف فراری دادن

**وائ باڵ بریان** waê baʃ bir̂yan لاهنا لە شەکەت بۆن ف اصطلاحاً به معنی خسته شدن است

**وائ تاوْنە** waê tawine تاوْنە، تاعوون ف باد طاعون آور

**واید** wayd هەێواید ف فرار کردی

**وائێد** waêd هەێوائێد ف فرار می‌کند

**وایدن** waydin هەێوایدن ف فرار کردی

**وائێدن** waêdin هەێوائێدن ف فرار می‌کند

**وائ شەو لێ دائ** waê şew lê daê ئەو کەسە کْ فرە چەتاڵی کەێد ف آنکه شبگردی می‌کند

**وائێم** waêim ١) بتەێگە چۆکرف و لە پەلەیلێ سەوەتە درْس کەن ٢) دارێگە بەرەگەێ چۆ گردەکان خواردە مەنیە ف ١) بوته‌ای که از شاخه‌هایش سبد بافند ٢) بادام

**وایم** waym هەێوایم ف فرار کردم

**واین** wayn ١) هەێواین ٢) ئۆیە هەێواین ف ١) فرار کردن ٢) فرار کردید

**وایە** waye هەێوایە ف فرار کرده

**وائێە** waŷe وادە ف وعده، مهلت

**وائێەدان** waŷe dan وادە دان ف وعده دادن

**وائێەسەنن** waŷe senin وادە سەنن ف وعده گرفتن

**وائێەکرد** waŷe kird وادە کرد ف نگا **وائێەکرد**

**وائێەمە** waŷeme واوەڕووە ف بوران

**وائێەمەن** waŷemen بەێزە کردنْ زاوران ف ویار زائو

**وایین** wayîn واین، فرار کردن ف فرار کردن

**وتاخ** witaxف وتاق، ژوور ف اتاق

**وتار** witar گفتمان ف گفتار

**وتاق** witaq وتاخ ف اتاق

**وتاق شاری** witaq şarî ئتر ف مینی بوس، ماشین

**وتْ وات** witi wat ١) فتْ فات ٢) پچْ پاچ ف ١) سخن

چینی ۲) در گوشی سخن گفتن

**وتْ وات کردن** witi wat kirdin وتْ وات ف نگا **وتْ وات**

**وتەوت** wite wit بنووڕە وتْ وات ف نگا **وتْ وات**

**وجاخ** wicax ۱) بنەماڵە ۲) ئاگردان ف ۱) خاندان، نسب ۲) اجاق

**وجاخ کوور** wicax kûr کەسیَ کْ مناڵ کوڕ نەیَرێد ف کسی که فرزند پسر ندارد

**وجرگانن** wicir̂ganin گیرانن لە یەک ف اصطحکاک

**وجرگیان** wicir̂gyan گیریان لە چشتیَ، وجرگیان ف اصرار و پافشاری در انجام کار، پشتکار داشتن

**وجس** wicis وژە «ل» ف وجب

**وچان** wiçan ۱) شەکەتی داخسن ۲) ماوەیَ کەم ف ۱) استراحت ۲) مهلت اندک

**وچان دەرکردن** wiçan der kirdin شەکەتی دەر کردن ف خستگی در کردن

**وچان گرتن** wiçan girtin شەکەتی خسن ف اندک مدتی برای رفع خستگی

**وچرگانن** wiçirganin گیریان لە چشتیَ، وجرگیان ف اصرار و پافشاری در انجام کاری

**وچرگیان** wiçirgıayan گیریان لە چشتیَ، وجرگیان ف اصرار و پافشاری در انجام کاری

**وڕ** wir̂ ۱) گیژ ۲) قسیەیَ فرە کردن ۳) ساڵ، تەمەن، زوورْم ئەڕایَ بزْن «یەیَ وڕ، دْوڕ» ف ۱) گیج ۲) وڕ، سخن بیهوده ۳) مبنای سن وسال برای بُز

**وڕا** wir̂a فرە قسیە کەر ف حرّاف

**وراز** wiraz تاک، لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «بەراز، خو، خوگ، گاکوڵ» ئۆشن و لە ئەوستا (veraze ڤەرازە) و لە پەهلەوی (wiraz وراز) ئۆسریاس ف گُراز، در اوستا (veraze ورازه) و در پهلوی (wiraz وراز) نوشته‌شده، در دیگر گویشهای کردی «بەراز، خو، خوگ، گاکوڵ» گویند

**ورازئاوا** wiraz awa دیەکەیَگە لە ڕەوانسەر ف روستایی در روانسر

**ورازخوەر** wiraz xwer لاناوە لە کاکەیی ف کنایه از اهل حق

**وڕاڵ** wir̂aɫ فرەوڕا، وڕاوەکەر ف پـُرگو، وراج

**وڕاوە** wir̂awe خوتە، وڕاوە وژاوە ف غرولند، هذیان

**وڕاوە کردن** wir̂awe kirdin خوتانن ف سرزنش کردن

**وڕاوە وژاوە** wir̂awe wijawe وڕاوە ف غرولند کردن و سرزنش کردن

**وڕبۆن** wir̂ bün گیژ بۆن ف گیج شدن

**وڕْبیم** wir̂i bîm وڕاوە ف با خود هذیان گفتن

**ورچە** wirçe ناوێگە ئەڕایَ سەگ، لە سۆرانی «ورچ» وە مانایَ خرسە ف نامی برای سگ، در سورانی «ورچ» به معنی خرس است

**ورد** wird ۱) هۆرد ۲) بۆچگ «وردْ واڵە» ۳) قسیەیَ جادوو ٤) ئیسفا گرتن ف ۱) خُرد، ریزه ۲) کوچک ۳) ورد ٤) دقت کردن

**ورد بۆن** wird bün ۱) هۆرد بۆن ۲) ئیسفا گرتن ف ۱) خُرد شدن ۲) دقت داشتن

**ورد بین** wird bîn ئیسفاگەر ف خُردبین

**ورد کردن** wird kirdin هۆرد کردن، لە ئەوستا (werk وەرک) ئۆسریاس و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «ورکە، ورتکە» وەمانایَ تیکە وهۆردەس ف خُرد کردن، در اوستا (werk وەرک) به معنی خرد کردن است و در دیگر گویشهای کردی «ورکە، ورتکە » به معنی تکه کردن و خرد کردن است

**وردواڵە** wirdi waɫe هۆردْهەواڵە ف خرت و پرت

**ورد ورد** wird wird هۆردە هۆردە ف خُرد خُرد کردن

**وردە** wirde ۱) پۆل هۆردە ۲) هۆردە ۳) کەمیَ ف ۱) پول خُرد ۲) خُردە، ریزه ۳) اندکی

**وردەخاڵ** wirde xaɫ هۆردەخاڵ ف خالهای ریز صورت

**وردەفرووش** wirde firûş دەسفرووش ف خُردە فروش

**وردەقەن** wirde qen خاکە قەن ف خاکە قند

**وردەکاری** wirde karî هۆردەکاری ف خُردەکاری

**وردەماڵ** wirde maɫ هارخپارخْ کەم ف اسباب و اثاثیه

**وردەواڵە** wirde waɫe وردواڵە ف خرت وپرت

**وردەو بۆن** wirdew bün ۱) ورد بۆن ۲) خۆردەو بۆن ف ۱) دقت کردن ۲) خُرد شدن

**وردەوردە** wirde wirde ۱) کەم کەم ۲) بەش بەشەو کردن ف ۱) اندک اندک ۲) خُرد و ریز کردن

**وردی** wirdî ۱) بۆچگی ۲) وردبینی ف ۱) خُردی، کوچکی ۲) دقت کردن

**وردیلْک** wirdîlik بۆچکلە ف کوچولو

**ورزنگ** wirzinĝ زرانی، وێژنی ف زانو

**ورزی** wirzî ورێز «ل» ف برخیز

**ورسیەری** wirsiyerî ۱) تەنگی تفتی ۲) ورسێ بۆن ف ۱) کم و کاستی در زندگی ۲) گرسنگی

**ورسیەری کیشان** wirsiyerî kîşan ۱) تەنگی تفتی کیشان ۲) زگ جەڕدان ف ۱) کم وکاستی زندگی را تجربه کردن ۲) گرسنگی کشیدن

**ورشە** wirşe گرشە ف درخشش

**ورشەدار** wirşe dar گرشەدار ف درخشان

**ورشەدان** wirşe dan شەوق دان ف درخشیدن

**وڕکردن** wir̂ kirdin ۱) گێژ کردن لە زوور سام ۲) مایێ سەر بردن ف ۱) گیج کردن در اثرسم ۲) دراثر پُـرحرفی گیج کردن

**وڕگ** wir̂ig وێانگ ف بهانە کودکان همراە باگریستن

**وڕگ کردن** wir̂ig kirdin وێانگ گرتن وگیرسن فرە ف کودکی کە بسیار بهانەجو است و گریە بسیار می‌کند

**وڕگیان** wir̂igyan خەریک بۆن، پلیانە پێا ف دست بکار شدن بە…، درگیر شدن با…

**وڕگین** wir̂igîn منالٚ وێانگ گر ف بسیار بهانە جو

**ورمئاوا** wirm awa دیەکەێگە لە ڕەوانسەر ف روستایی در روانسر

**ورمێ** wirmê هلاڵەبرمە ف گل شلیرە

**ورنگ** wirinĝ وڕْبیم ف هذیان، زیر لب زمزمە کردن

**ورنگە** wirinĝe ورنگ ف زیر لب زمزمە کردن

**ورنگەورنگ** wirinĝe wirinĝ وڕاوە وژاوە ف غرولند

**وڕواش** wir̂i waş وڕ، گیژ و وێژ ف گیج و منگ

**وڕوڕە** wir̂wir̂e وڕوڕەک ف حرّاف، پُـرگو

**وڕوڕەک** wir̂wir̂ek وڕوڕە ف پُـرگو

**وڕوڕەێ جادوو** wir̂wir̂eŷ cadû لاناوە لە فرە وڕا ف کنایە از بسیار حرّاف

**وڕْ ویم** wir̂i wîm بنووڕە وڕْبیم ف نگا **وڕْبیم**

**وڕە** wir̂e وڕگ ف بهانە کودکانە

**ورەو** wirew ویرەو «ورەو کوو چید؟ » ف رو بە بسوی…

**وڕەوڕ** wir̂e wir̂ ژەکەژەک ف وراجی

**ورەو کوو** wirew kû ورەو کوورە؟ ف رو بە کجا؟ ، بە کجا؟

**ورەو کوورە** wirew kûre ورەو کوو ف رو بەکجا؟

**ورێ** wirê ورێز، ورزی «ل» ف برخیز

**وڕی** wir̂î گیژی، مەنگی ف گیجی

**وریا** wirya ۱) وە هووش ۲) ناوێگە کوڕانە ف ۱) زرنگ، باهوش ۲) نامی مردانە

**وریای** wiryay چاوەدێری، وە هوووش بۆن و وە دیار رییەنەو بۆن ف نگهبانی دادن گلە در شب کە نیازمند بیداری و شب نخوابی است

**وریاێکەر** wiryaê ker ئەو کەسە کْ چاوەدێر رییەنە ف نگهبانی گلە در شب کە نیازمند بیداری است

**وریجە** wirîce بریجە، لە ئەوستا (veriç ڤەرچ) و (vereşenĝh ڤەرچەنگهـ) نۆسریاس ف درخشش، در اوستا (veriç وَرچ) و (vereşenĝh وَرچَـنگهـ) نوشتە شدە

**ورێز** wirêz ۱) وێز، زێزْ بێز «لانەورێز» ۲) ورێ «ل»، لە ئەوستا (veryzyaw ڤەریزیاو) نۆسریاس ولە لاتین (rise) وە مانایێ هەڵسانە ف ۱) گریز، فراری، مقابل گرا ۲) برخیز، در اوستا (veryzyaw وَریزیاو) نوشتە شدە و در لاتین (rise) بە معنای بر خاستن است

**وریسکە** wirîske ۱) نەخوەشییگە ۲) کوت وکوتْپڕ «کوڕێ تووام هەر ئیسکە – ناوێ بنەمە وریسکە» لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «وریسکە» وە مانایێ هەورە تەرەقەس ۳) بڵاچە ف ۱) بیماریی است ۲) فوری، سریع، در دیگر گویشهای کردی «وریسکە» بە معنای رعدوبرق است کە کنایە از همان سریع بودن است ۳) جرقە

**وڕینگە** wir̂îĝne بنووڕە وڕینە ف نگا **وڕینە**

**وڕینە** wir̂îne ۱) وڕْبیم ۲) دڵ سزیان و لەوەرْ خوێەو قسیە کردن ف ۱) هذیان ۲) در مقام دلسوزی برای کسی بودن و با خود حرف زدن

**وڕینە کردن** wir̂îne kirdin ۱) وڕْبیم کردن ۲) خەم خواردن ئەڕایێ کەسێ «وڕینەکەرْ کەس نەمرێ» ف ۱) هذیان گفتن ۲) کنایە از غمخواری کردن برای کسی

**وڕینەکەر** wir̂îne ker خەمخار، هاودەرد ف یار، غمخوار

**وز** wiz دەنگْ مێەس ف صدای مگس

**وزم** wizm ۱) تووکْ دارْ وەن کْ چۆ خەنە گرنەێ سەر ۲) بتەێگە ئەولْ دۆیەێ کاوڕ کوتنەێ و نەنەێ بانْ پەلْ و پووێ شکیایێ تا نەرمێەو بکەێد و لەێ نوو بگرنەوەێ ف ۱) پوست درخت وَن کە مانند حنا خاصیت رنگ آمیزی دارد ۲) برگ و

پوست درختچه ایست که با دنبه گوسفند می‌کوبند و روی استخوان شکسته‌ای که ناجورجوش خورد می‌گذارند واستخوان را نرم می‌کند بگونه‌ای که براحتی آنرا می‌شکنند و دوباره آتل بندی می‌کنند

**وزمْ دق** wizmi dü مه‌ڵهه‌مێگه له وزم ودۆیه کْ کوتنه‌یَ و نه‌نه‌یَ بانْ په‌ڵْ شکیایَ ف زمادی از پوست درخت وَن و دنبه که آنها رابا هم مخلوط کرده و روی اندام شکسته می‌گذارند

**وزمه** wizme وسمه، وه‌سمه، له گیله‌کی (wizme وزمه) ئۆشن ف وسمه، پوست درخت وَن که مانند حنا خاصیت رنگ آمیزی دارد، در گیلکی (wizme وزمه) گویند

**وزنێار** wiznêar کۆیه‌یگه له کوونانی ف کوهی در کونانی از توابع کوهدشت

**وزه** wize ۱) وزه وز ۲) سه‌رسه‌خت و فره وڕا ف ۱) صدای وز وز مگس ۲) سرسخت و بسیار حراف

**وزه‌وز** wize wiz ده‌نگْ وز وز مێه‌س ف وز وز مگس

**وژ** wij ۱) ده‌نگْ ویژه ۲) خود «ل»، له کرمانجی «وژ، وێژ» ئۆشن ف ۱) صدای پرتاب سنگ از قلاب سنگ یا گلوله ۲) خود، اشاره خود

**وژار** wijar ۱) بژار، وژین ۲) پێارسه کردن ف ۱) وجین، نگا **بژار** ۲) پیاده‌روی برای رفع خستگی و انبساط خاطر

**واژارتن** wijartin ۱) وژاردن ۲) هه‌ڵوژانن ف ۱) وجین کردن ۲) برگزیدن

**وژاردن** wijardin بنووڕه بژاردن ف نگا **بژاردن**

**وژارکردن** wijar kirdin ۱) وژین کردن ۲) پێارسه کردن ف ۱) وجین کردن ۲) پیاده‌روی برای انبساط خاطر

**وژاڵه** wijaĺe زه‌رداڵه ف زنبور کوچک

**وژانن** wijanin هه‌ڵوژانن ف برگزیدن

**وژاوه** wijawe هاوتایَ وڕاوه ف همتای غرولند

**وژدان** wijdan ئافت و هه‌ست دڵ و ده‌رۆن، کوره‌مازیَ ئی وشه کوردیه «وژ = خود+ دان = زانستن» نه‌یرووی ده‌رۆنی ک هه‌ر خوه‌د زانی ف وجدان، این واژه کردی است «وژ = خود+ دان = دانستن» نیرویی درونی در شخص

**وژدانه‌ن** wijdanen وه‌وژدان ف وجداناً

**وژرانن** wijr̂anin وه مل گرتن ف بر عهده گرفتن

**وژریَ** wijirê وژرانن «یه‌یَ براێگ له‌یَ سه‌متْ ئێڵاخه دێریَ- خۆنه‌گه‌یَ بازه کولی وژریَ» ف بر عهده گرفتن، زیر تاوان بودن

**وژنگ** wijinĝ وێژنگ ف سرند بوجاری

**وژنی** wijnî سه‌ر زرانی ف زانو، سر زانو

**وژه** wije بنگس ف وجب

**وژه‌سیَ** wije sê ۱) خوه‌یه «ل» ۲) واورێز «ل» ف ۱) خودش است، همان است ۲) مخصوص، ویژه

**وژین** wijîn ۱) وژار ۲) وێژنگ ف ۱) وجین ۲) سرند

**وژینکردن** wijîn kirdin وژارکردن ف وجین کردن

**وژینکه‌ر** wijîn ker ۱) ئالاکه‌ر ۲) ئه‌و که‌سه کْ وژار که‌یێ ف ۱) وسیله‌ای بیلچه مانند برای وجین کردن ۲) آنکه وجین می‌کند

**وسا** wisa ۱) ئۆسا ۲) وساد ف ۱) نگا **ئۆسا** ۲) ایستاد

**وساس** wisas وسیاس ف ایستاده است

**وسان** wisan ۱) ئه‌وان وسیان ۲) مه‌نن ف ۱) ایستادند ۲) ایستادن

**وسکت** wiskit هسکوت ف امر به سکوت کردن

**وسمه** wisme بنووڕه وزمه ف نگا **وزمه**

**وسن** wisin وسیه‌ن ف می‌ایستند

**وسه‌وس** wise wis سنگه‌سنگ ف احمالکاری

**وسین** wisîn ۱) وسیان ۲) وسیه‌ن ف ۱) ایستادن ۲) می ایستند

**وشا** wişa زێڕْ ته‌نگ ف گشاد

**وشار** wişar هشار ف پنهان کردن

**وشاردن** wişardin هشار کردن ف پنهان کردن

**وشارکردن** wişar kirdin هشار کردن ف پنهان کردن

**وشک** wişk ۱) بنچینه‌یَ کردارْ وشکانن ۲) سفت، سه‌خت ۳) زێڕْ ته‌ڕ ف ۱) ریشه فعل «وشکانن» به معنی جستجو کردن و خشک کردن ۲) سخت، سفت ۳) خشک

**وشکانن** wişkanin ۱) هشک کردن ۲) جوورسن ف ۱) خشک کردن ۲) تفتیش کردن

**وشکانی** wişkanî ۱) هشکڵانی ۲) جوورسی ف ۱) خشکی ۲) تفتیش کردی

**وشک بۆن** wişk bün هشک بۆن ف خشک شدن

**وشک کردن** wişk kirdin ۱) مانگاێگ کْ له شیره‌و چیه ۲) وشکه‌و کردن ف ۱) گاوی که شیرش خشک شده ۲) خشک کردن

**وشکڵاتن** wişkiĺatin وشکەڵاتن ف خشکیدن

**وشکڵاتێ** wişkiĺatê وشکەو بۆ ف کاملاً خشک و سفت

**وشکە** wişke ۱) وشک «نانەوشکە» ۲) رەقەێ زەق ۳) شەلگە ف ۱) خشک ۲) خشک شدن زمین ناشی‌از بی بارانی ۳) بیماری دام که پاهایشان حالت خشک شده دارد

**وشکەبار** wişke bar ئاجیل، گردەکان و پستە و... ف خشکبار

**وشکەبەن** wişke ben وشکەو کریاێ گیایل ئەراێ بەن هاوردنْ خۆن ف خشک شده گیاهان دارویی به منظور جلو گیری از خونریزی بر روی زخم گذارند

**وشکەڕوو** wişke r̂û زروان ف بیابان، صحرا

**وشکەڕێ** wişke r̂ê بەردڵان ف راه سنگلاخی

**وشکەساڵ** wişke saĺ سیبەساڵ ف خشکسالی

**وشکەسووفی** wişke sûfî دیندارْ جاوەری ف زاهد ظاهر پرست

**وشکەسەرما** wişke serma کەلەوا، هەواێ سەرد ف سرمای خشک وسوزان

**وشکەشوور** wişke şûr نووشوور ف نگا **نوُشوور**

**وشکەڵ** wişkeĺ وشکڵاتێ ف کاملاً خشک

**وشکەڵاتن** wişkeĺatin وشکڵاتن ف خشکیدن

**وشکەو بۆن** wişkew bün وشک بۆن ف خشک شدن

**وشکەوکردن** wişkew kirdin وشککردن ف خشک کردن

**وشکی** wişkî ۱) هشکی ۲) وشکانی ف ۱) خشک شدن ۲) خشکی

**وشکیان** wişkyan هشکیان ف خشک شدن

**وشم** wişm ۱) تەشە ۲) نەخۆشییگ کْ پەخش بوودە وڵاتەو، ئیپیدمی ف ۱) آفت ۲) بیماری واگیر دار، اپیدمی

**وشْم** wişim ئۆشم «گ» ف می‌گویم

**وشیار** wişyar وریا، هووشیار ف هوشیار

**وشیاربۆن** wişyar bün وریا و هووشیار بۆن ف هوشیار بودن

**وشیارکردن** wişyar kirdin وریا و هووشیار کردن ف هوشیار کردن

**وشیاری** wişyarî وریایی ف هوشیاری

**ول** wil ۱) سس «شل و ول» ۲) مەشکەێ بۆچگ ف ۱) سست ۲) نوعی‌مشک کوچک

**وڵ** wiĺ ۱) وێڵ، لە ئەوستا (vîte ڤیتە) ئۆسرییاس و لە زاراوەیلْ ترەکْ کوردی «ویت» وە ماناێ سەرگەردان و وێڵە ۲) گۆم ف۱) ول، رها، در اوستا (vîte ڤیته) نوشته شده و در دیگر گویشهای کردی «ویت» به معنای سرگردان است ۲) گم

**وڵا** wiĺa واز، پیەنەو کریاێ ف گشاد، پهن شده

**ولا** wila وە خودا ف والله

**وڵابۆن** wiĺa bün پیەنەو بۆن ف گسترده‌شدن، پهن شدن

**وڵات** wiĺat ۱) دیەکە ۲) نیشتمان ف ۱) روستا، ولایت ۲) میهن

**وڵات پیەرێز** wiĺat pyerêz نیشتمان پەروەر ف میهن پرست، آنکه از میهن پاسداری می‌کند

**وڵاخ** wiĺax ۱) خەر ۲) گا وگوور ف ۱) الاغ ۲) حشم

**وڵاخدار** wiĺax dar خەرەکدار ف رمه‌دار

**وڵاکردن** wiĺa kirdin پیەنەو کردن ف گستراندن، پهن کردن

**وڵام** wiĺam ئەمان، ئەما ف ولی، اما

**وڵاین** wiĺayn ۱) چنگ دان ۲) وڵاینْ شان وکووڵ ف ۱) ورز دادن ۲) ماساژ دادن بدن

**وڵ بۆن** wiĺ bün ۱) بەێتە بۆن ۲) ئازاد بۆن ف ۱) ول بودن ۲) آزاد بودن

**وڵک** wiĺk ۱) گورچێ ۲) پەراسۆ ف ۱) کلیه، گرده ۲) تهیگاه زیر دنده‌ها

**وڵک بڕین** wiĺk bir̂in لە زوورْ زەربەت کەفتن ف ضربه بسیار شدید که منجر به افتادن یا مردن شود

**وڵ کردن** wiĺ kirdin ۱) ئازاد کردن ۲) بەێتەکردن ف ۱) آزاد کردن ۲) ول کردن

**وڵکوت** wiĺkwit ئەلابەختەکی ف شانسی، اتفاقی

**ولکە** wilke پاشگرْ بۆچگی «جاشۆلکە، جامۆلکە» ف پسوند تصغیر

**وڵکە** wiĺke دەسوور وە وڵ کردن ف امربه رهاکردن

**وڵکەێتێ** wiĺ keŷtê وڵکە «ل» ف رها کن

**وڵگە** wiĺige وێڵ ف ویلان، ول

**وڵگەرد** wiĺgerd چەتاڵ ف ولگرد

**وڵگەردی** wiĺgerdî چەتاڵی ف ولگردی

**وڵگەێ سەرخەرمان** wiĺigeŷ seri xerman وڵگە ف ول، ویلان

**ولْ منەی** wiľ miney وێڵ منەی ف بدون شناخت و آگاهی جستجو کردن

**ولْنگ** wiľnĝ ١) ولْنگە کردن ٢) شاک دان ف ١) در رفتن، جیم زدن ٢) کله زدن در جماع

**ولْنگانن** wiľnĝanin ولْنگە کردن ف دررفتن، جیم زدن

**ولْنگْ واز** wiľinĝi waz ١) شەش تاق واز ٢) نەنگ و واز «دالْگ بۆن و دۆیەت بخواز- تا نەکەفیە ولْنگْ واز» ف ١) کاملاً باز، باز ٢) بی آبرو شدن، از سکه افتادن

**ولْنگە** wiľnĝe ١) دەنگْ کەفتنْ چشتێ لە چالاو ٢) دەنگْ گیریایْ گەلوْ لە دۆرەو ٣) فلْنگە ف ١) صدای افتادن چیزی درچاه ٢) صدای گرفته گلو ٣) در رفتن، جیم زدن

**ولْنگەکردن** wiľnĝe kirdin دەرزەنین ف جیم زدن، در رفتن

**ولْ ولْ** wiľ wiľ چەتالْی ف ول گشتن

**ولە** wiľe ولەێنی «دۆیەتە بۆچگلە پێم وەتێە خالْوو- چەوەیلێ کوور و زووانێ لالْ بوو-م خالْوو نیم خالْوو مردە بای - چۆ سیایْ لە شوونْ ولەیْ هەردە بای» ف بچە آهو

**ولەژوو** wile jû خوتن، وراوەکەر «ولە = وێڵ+ ژوو = ژوون گەردانن» ف پُرچانە، غرولند کن

**ولەکەت** wiľeket فرە شەکەت ف بسیار خسته

**ولەکەت کردن** wiľeket kirdin شەکەت کردن ف خسته کردن

**ولەنتەر** wiľenter وەلەنتەر، چەکْ وەرد، کۆیەنە ف کهنه، فرسوده

**ولەێنی** wiľeŷnî ١) وەناوکە ٢) وەچکە ئاسک ف ١) پرنده‌ای است، نوعی قمری ٢) بچه‌آهو

**ولەیْ** wiľeŷ ١) شکار ٢) وەچکە ئاسک «وە شووند گەردم هەردە وە هەردە- جوور سیادەگەیْ ولەیْ گوم کەردە» ف ١) صید، شکار ٢) بچە آهو

**ولیقانن** wilîqanin تلیقانن ف له و لورده کردن

**ولیقیا** wilîqya تلیقیا ف له و لورده شده

**ولیقیاگ** wilîqyag تلیقیاگ ف له و لورده شده

**ولیقیان** wilîqyan تلیقیان ف له و لورده شدن

**ولیقیایْ** wilîqyaê تلیقیایْ ف له و لورده شده

**ولێوی** wiľêwî ١) رەنگینی «ولێوی ئەرجن، پەشێوی چوو شەن-ترنگەیْ ئاوراخووز، خشەیْ وەلْنگەوەن» ٢) لیکەیی ف ١) شوخ وشنگی ٢) جوانی، تر و تازەگی

**ونجر** wincir̂ شڕ، شڕتالْ ف کهنه

**ونجر ونجر** wincir̂ wincir̂ شیتالْ شیتالْ ف پاره پاره

**ونگ** winĝ نەرمەیْ گووش ف لاله گوش

**ونْ وان** wini wan دەرگووشی قسە کردن ف در گوشی سخن گفتن

**ونە** wine واتوورە «وە ونە ژنەفتم کْ...» ف شایعه، سخن ناراست

**ونەرنی** winernî دیەکەێگە لە بێلەوار ف روستایی در بیله‌وار

**ونەوشک** winewşk ١) دارْ وەنەتاق ٢) وەنەتاق ف ١) درخت بُنه ٢) بَر درخت بنه، چاتلانقوش

**ونەون** wine win وڕْبیم ف هذیان، غرولند

**وە** we ١) کیشْ دووارە کاری «وە سەرا» ٢) پاشگرْ خەوەری ئەرایْ سێم کەسْ یەکلە «بووە، نەوە» ٣) بە، وەو«وە خودا» ٤) لا، تەرەف «وە لا راسەو» ٥) کیشْ رازایی «وە پاوە، وە نیشتگانی» ٦) کیشْ قەسەم خواردن «وە خودا، وە شیرْ دالْگ» ٧) لا، کەنار «وە لایْ منەو فرە عەزیزی» ٨) نرخ، قیمەت «وە چەنێ» ٩) لەێرە تا «وە کرماشان تا گیەلان» ١٠) پاشگرْ دەسووری «لاوە، نەلاوە» ف حرف تکرار ٢) پسوند خبری برای سوم شخص ٣) به ٤) سمت، سو ٥) حرف موصوف ٦) حرف سوگند ٧) نزد، پیش ٨) قیمت، نرخ ٩) از، از اینجا تا... ١٠) پسوند دستوری

**وها** wiha چڕین «وها فلانی بەو» ف بانگ کردن، آهای

**وهار** wihar وەهار ف بهار

**وهایْ** wihaê وها، دەنگ کردن ف آهای

**وەئاو خسن** we aw xisin ١) کەنین و وە ئاو کەفتن چالاو ٢) وە ناو ئاو خسن ف ١) به آب انداختن چاه خشک ٢) در آب انداختن

**وەئاو دان** we aw dan بێ ئابڕۆ کردن ف رسوا کردن

**وەئاو دراتن** we aw diratin راس یا درووبۆنْ واتەێگ ف از آب در آمدن، به واقعیت انجامیدن

**وەبا** weba نەخوەشی وەبا ف بیماری وبا

**وەبا بری** weba birî تۆشْ نەخوەشی وەبا هاتن ف بیمار وبا زده

**وەبان** we ban لە بان ف از بالا

**وەبانْدەس هاتن** we bani des hatin تەوانْ ئەنجام داینْ کارێگ ف از دست برآمدن، توان انجام دادن داشتن

**وەبتێەو کردن** we bitŷewe kirdin ۱) هەڵوژانن ۲) وە کلْ چەو دان ف ۱) انتخاب کردن، در نظر داشتن کسی یا چیزی ۲) زیر نظر داشتن

**وەبرِ** we bir̂ ۱) وە کول، وە برِی ۲) وە گەل، وەدەسە ۳) وە بەونی ف ۱) بکلی ۲) دستەجمعی، گروهی ۳) فراوانی، بسیاری

**وەبرِ بەونی** we birî bewnî فت وفەراوان، بەونی ف فراوانی، بسیاری، زیادی

**وەبرِی** we bir̂î برِی ف جملگی، همگی، بەکلی

**وەبن** we bin لە بێخ وبن ف از بیخ و بن

**وەبن کەنە** we bin kene لە بێخ کەنیان ف از بیخ کنده شدن

**وەبنگوردەوا برِین** we bin gwirdewa bir̂în قسیەیٚ کولْ وکولْبرِ، کوتەمەترەق ف سخن مختصر ومفید

**وەبنەو** we binew لە بێخەو، لە بنەو ف از بیخ و بن

**وەبەێن چین** we beŷn çîn نابووت بۊن ف از بین رفتن

**وەپا** we pa ۱) زێژْ سووارە ۲) خەلیەێگ کْ هێمان درەو نەۊیە، لەئەوستا (vep ڤەپ) تۊسریاس ۳) وە دەس، لە چەنتە ف ۱) با پای پیادە ۲) محصولی کە هنوز درو نشده، در اوستا (vep وَپ) بە معنی بذر کاشتن وسبز شدن است ۳) در تصاحب

**وەپا خسن** we pa xisin شەکەت کردن، هەرِەکانن ف خستە کردن

**وەپا کەفتن** we pa keftin لە پا کەفتن ف از پا افتادن

**وەپا مەنن** we pa menin وە سەرپا مەنین ف برپا ماندن

**وەپسا** we pisa لە پەسا ف در حال، سرگرم

**وەپەێتاک نان** we peŷtak nan لە قورت نان، وە کوڵکەو نان ف صرف کردن، زمان وهزینەای را صرف کاری کردن

**وەپیری چین** we pîrî çîn وە پێشوازْ کەسیٚ چین ف بە پیشواز کسی رفتن

**وەپیری هاتن** we pîrî hatin وە پێشواز هاتن ف بە استقبال آمدن

**وەپینەدان** we pîne dan پینە کردن ف پینە زدن چیزی

**وەپینەیٚ زەۆکردن** we pîneŷ zeü kirdin شەرمەندە کردن ف خجل کردن، شرمندە کردن

**وەت** wet ئەوەڵ کەسْ یەکڵە لە وەتن ف گفت

**وەتا** weta وەتەو ف بازگو کرد، فاش کرد

**وەتار** wetar ۱) گفتمان ۲) رنگ گرتن، ئەدا دراوردن ف ۱) گفتار ۲) ادا در آوردن

**وەتارا کردن** we tara kirdin رنگ گرتن ف ادای کسی را در آوردن

**وەتارْ تن** we tari tin تن وتێژ ف فوری، سریع

**وەتان** wetan ۱) ئەوانە وەتەو ۲) واتوورە، واتە ۳) رنگ گرتن ف ۱) گفت ۲) بنا برگفتەها، بە نقل۔۳) ادا درآوردن

**وەتن** wetin ۱) پاشگرە وە ماناێ قسیە کردن ۲) ئەوان وەتن ۳) تن، وە تاف ف ۱) پسوند بە معنی گفتن ۲) گفتند ۳) بە تندی، سرعت

**وەتوُ شان** we tû şan لۊیەت ف برهنە، با لباس زیر بیرون رفتن

**وەتۊن** wetün ۱) وە دەرەک ۲) ئەوان زۊنە قسیەێگ کردۊن ف ۱) بەجهنم ۲) گفتەبودند

**وەتۊن وتەوەس** we tün û tewes تۊن وتەوەس، تۊن وتەوەس دۊ زروانْ گەوراس لە ئێران کْ وە جانـْم مانا کریاس ف بە جهنم

**وەتەن** weten نیشتمان، ئەرەوییە ف میهن

**وەتەنی** wetenî زێژْ نەوەتەنی ف قابلگفتن، گفتنی

**وەجا** we ca گوجا ف بجا، مقابل نابجا

**وەجا بردن** we ca birdin وە جی بردن ف بجا انداختن اندام در رفتە

**وەجا هاوردن** we ca hawrdin ۱) ئەدا کردن ۲) ناسین ۳) وە جی خسن ف ۱) ادا کردن فریضـە ۲) باز شناختن ۳) جا انداختن اندام در رفتە

**وەجا هیشتن** we ca hîştin جی هیشتن ف قال گذاشتن، جا گذاشتن و رفتن

**وەجاێ** we caê لە جیاتی ف بجای، بە تلافی

**وەجەر** we cer بنوورِە بەجەر ف نگا **بەجەر**

**وەجەڵ** weceĺ ئەجەڵ ف اجل

**وەجی** we cî ۱) وەجا ۲) لەجاێ، وەجاێ ف ۱) بجا، مقابل نا بجا ۲) در عوض، بە تلافی

**وەجی بردن** we cî birdin وە جی خسن ف جا انداختن

اندام در رفتە

**وەجی چین** we cî çîn لە جی چین ف از جا در رفتن اندام

**وەجی خسن** we cî xisin وە جی بردن ف جا انداختن اندام در رفتە

**وەجی گلادان** we cî gila dan سخت سەنن ف در عوض ... نزد خود نگەداشتن، غرامت گرفتن

**وەجی مەنن** we cî menin لەجی مەنن ف جا ماندن، بجا ماندن

**وەجی هاوردن** we cî hawrdin بنوورە وەجا هاوردن ف نگا **وەجا هاوردن**

**وەجی هیشتن** we cî hîştin بنوورە وەجا هیشتن ف نگا **وە جاهیشتن**

**وەچ** weç ١) وەچکە ٢) پەلوەچ ٣) نەوە و نەتیجە «وەچ و وەچەرزا» ٤) چۆزەرە ف بچە، نگا **وەچکە** ٢) جوانەای از شاخە ٣) نوە و نتیجە ٤) جوانەی انتهایی

**وەچاکدان** we çak dan دەرزەنین ف در رفتن، بە چاک زدن

**وەچاو دین** we çaw dîn دڵنیا بۆن ف یقین یافتن

**وەچ دەرکردن** weç der kirdin ١) کەتۆێگ کْ وەچکەیلێ گەورا بۆنەو توان دەرچن ٢) پەلوەچ وەشانن ف ١) کندویی کە نوزادانش بزرگ شدە و قصد ترک کندو را دارند ٢) جوانە زدن درختان

**وەچ کردن** weç kirdin چۆزەرەدان ف جوانە زدن

**وەچکە** weçke بەچکە، وەچگە، بەچە، لە پەهڵەوی ( weçek وەچەک) تۆسریاس ف بچە پرندگان، در پهلوی ( keçew وَچک) نوشتە شدە

**وەچکەمەلۆچگ** weçke melüçig بەچکە مەلۆچگ ف بچە گنجشک

**وەچگە** weçge بنوورە وەچکە ف نگا **وەچکە**

**وەچنگهاوردن** we çinĝ hawrdin وە دەس هاوردن ف بە چنگ آوردن

**وەچۆزکەفتێ** we çüz keftê وە تەرز کەفتێ ف خوش اندام، کسی کە اندام ریک وپیک دارد

**وەچ و وەچەرزا** weç û weçerza نەوە ونەتیجە ف نوە ونتیجە

**وەچە** weçe چۆ، چجوور ف چگونە، باچە وسیلەای

**وەچەرزا** weçer za نەتیجە ف نتیجە، نوە و نتیجە

**وەچەن** weçen وە چەنێ؟ ف چقدر؟ چند؟

**وەچەنێ** weçenê چەنێ؟ ف چقدر؟ چند؟

**وەچەوا کردن** we çewa kirdin چەودان ف چشم زخم

**وەچەو دین** we çew dîn دڵنیا بۆن ف یقین پیدا کردن

**وەچیەرێا کەفتن** we çerêa keftin مییەێگ ک لە هەێنْ چیەرێ هنای دەنەێ زەوا لێخەرووێ کەفێدە پێچ ودۆیای چەن رووژ مرێد، ئەگەر سەرە شووان لە کارْ خوەێ کارامە بوو و تەسخیسێ دا ئەڕای دەرمانێ نەنەێ توو خوری خوەێ و شەکنەنەێ چۆن خوری نەرمە وهەوابڕ بوو لێخەرووێ تیەێدە شوونْ خوەێ، ئی دەرمانە ئەڕای ئاێمێگ ک قوڵنجێ کەفتۆ بەنەێ کار ف اصطـلاحی درگلەداری بدین معنی کە گوسفندی را کە می‌خواهند پشمش را بزنند چون کە ممکن است با ضربت او را بر زمین بکوبند رودەاش پیچ افتادە و پس از چند روز خواهد مُرد چنانچە گلە دار در کار خود کارآمد باشد متوجە بی قراری و ناراحتی گوسفند خواهد شد وبرای درمان این عارضـە گوسفند را بە حالت درازکش در پشم چیدە شدەی خودش گذاشتە و تا فاصلەای از زمین بلند می‌کنند و چند دقیقەای تکان می‌دهند و چون پشم نرم و انعطاف پذیر است رودەی پیچ خوردە را درمان می‌کند این درمان برای انسان کە قولنج کردە باشد نیز بکار بردە می‌شود

**وەحاڵ نەمەنن** we haĺ nemenin ١) لاناوەلە پیر بۆن ٢) پۆتار بۆن ف ١) کنایە از پیر شدن ٢) فرسودە شدن

**وەحە** wehe وەوحە ف کلمە بازدارندە گاو

**وەخ** wex وەێ، ئاخ ف آخ

**وەخا چین** we xa çîn مامرێگ کْ دی خا نەکەێد ف مرغی کە دیگر تخم نمی‌کند

**وەخاوا هاتن** we xawa hatin وە خەوە هاتن ف بە خواب کسی آمدن

**وەخاو پەڕین** we xaw perîn لە خەو پەڕین ف از خواب پریدن، بیدار شدن

**وەخاو دین** we xaw dîn ١) لاناوە لە مەحاڵ ٢) خەو دین ف ١) کنایە از غیر واقعی، در خواب دیدن ٢) خواب دیدن

**وەخاو کردن** we xaw kirdin ١) وە خەوکردن ٢) خافڵانن ، خەڵەتانن ف ١) خواب کردن ٢) غافلکردن، سرگرم کردن

**وەخاون کردن** we xawin kirdin زێزْ وە خاون نەکردن

